

# گۆڤاری
# ئەکادیمیای کوردی

ژمارە ٢٤ ساڵی ٢٠١٣

## لەم ژمارەیەدا

### بەشی کوردی



### بەشی عەرەبی - القسم العربي



### بەشی ئینگلیزی - English part

# ڕێنماییەكانی بڵاوكردنەوە
# لە گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی

١- گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی، كە گۆڤارێكی زانستیی وەرزییە، باس و توێژینەوەی زانستی لە بارەی كورد و كوردستان، دوای ئەوەی هەڵسەنگاندنی زانستییان بۆ دەكرێت، بڵاو دەكاتەوە، بۆیە دەبێ هەموو مەرجەكانی ڕێبازی لێكۆڵینەوەی زانستییان تێدا ڕەچاو كرابێت. لێكۆڵینەوەكەش، كە مەرجە لە بارەی كێشەیەكی زانستییەوە بێت و بیرۆكە و لێكدانەوەی نوێی تێدا بێ، دەبێ لە هیچ شوێنێكی تر بڵاو نەكرابێتەوە، یا بۆ بڵاوكردنەوە وەرنەگیرابێت.

٢- زمانی كوردی زمانی سەرەكی بڵاوكردنەوەیە لە گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی ، بەڵام ڕێگەش دەدرێ لێكۆڵینەوەی بە نرخ بە هەردوو زمانی عەرەبی و ئینگلیزی بڵاوبكرێنەوە..

٣ـ هەر بابەتێك كە بۆ گۆڤاری ئەكادیمیای كوردی دەنێردرێ ، پێویستە ناوونیشانی باس، ناوی نووسەر، شوێنی كارەكەی، پلە و پایەی زانستی لە سەر لاپەڕەی یەكەمی لێكۆڵینەوەكە نووسرابێت.

٤ـ دەبێ پوختەیەكی باس، بە هەردوو زمانەكەی دی، لە كۆتایی باسەكەدا بنووسرێت. ناشبێ پوختەكە لە ١٥٠ وشە زیاتر بێت و پێویستیشە توێژەر لەو پوختەیەدا گرنگی و ئەنجامەكانی باسەكە بخاتە ڕوو.

٥- هەر كاتێ باس، لە لایەن هەڵسەنگێنەرانی زانستییەوە، بە ئەرێنی گەڕایەوە، ئەوا دەستەی نووسەران ڕەزامەندینامەی بڵاوكردنەوە بە توێژەرەكەی دەدات.

٦- هەموو باسەكان بیر و بۆچوونی نووسەرەكانیانن و مەرج نییە بیر و ڕای دەستەی نووسەران بن.

٧- بۆ ئەوەی بابەت لەگەڵ ڕێنمایی و شێوازی بڵاوكردنەوەی گۆڤارەكەدا كۆكبێ، دەستەی نووسەران مافی سەرلەنوێ داڕشتنەوە و لابردنی هەندێ دەربڕین و

دەســتەواژەی هەیــە، ئــەوەش بــە مــەرجێ واتــا و بیرۆکــەی ســەرەکیی توێژینەوەکە نەگۆڕێت.

٨ـ ئەگەر باسەکە لە بارەی پەیدۆزیی (تحقیق)ی هەر دەستنووسێکەوە بێت، ئـەوا بنەما و ڕێبازە زانسـتییەکانی ئـەم بـوارە پـەیڕەو دەکـرێن و شـەش لاپـەڕەی کۆپیکراو لە دەستنووسەکە لەگەڵ باسەکەدا هاوپێچ دەکرێن.

٩ـ پەیڕەوکردنی ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانسـتی لـە هەڵبـژاردنی ناوونیشـانی بـاس، توێژینەوەی بابەت، شێوازی بەکارهێنانی سەرچاوە و ڕێکخستنی پەراوێزەکان مەرجی بڵاوکردنەوەیە. هـەر باسـێك ئـەم بنـەما زانسـتییانەی تێـدا فـەرامۆش کرابێت، لە گۆڤاری ئەکادیمیای کوردیدا بڵاو ناکرێتەوە.

١٠ـ باسەکە، لە پاڵ دانەیەکی سەر CD، بە سێ دانە لە سەر کاغەزی (A4) چـاپ دەکرێـت بـە مـەرجێ ژمـارەی لاپـەڕەکانی، بـە وێنــە و نەخشــە و لیســتی ســەرچاوەکانییەوە، لە (٢٥ ) لاپـــەڕە زیـاتر نـەبن و بـە فـۆنتی (١٥) بـن و بـە Ali-K- Sahifa نووسرابن.

١١ـ ئەگـەر بابەتەکـە وەرگێـڕدرا بـوو، دەبـێ پەیوەنـدی بـە لایـەنێکی کولتـووری کوردییــەوە هــەبێت (زمــان، ئــەدەب، مێــژوو، ... هتــد). مەرجیشــە کــە وەرگێڕانەکە لـەو زمانـەوە بێـت کـە لـە بنەڕەتـدا بابەتەکـەی پـێ نووسـراوە. پێویستە دەقە ئەسڵەکەش هاوپێچ بکرێت.

١٢ـ لەکاتی پێویستدا گۆڤـاری ئـەکادیمیای کـوردی بەشـێکی تـەرخان دەکـات بـۆ خوێندنــەوە و هەڵســەنگاندنی ئــەو کتێبانــەی لــەبارەی کــورد و کولتــووری کوردییەوە نووسراون چ بە کوردی یـان بـە هـەر زمـانێکی دیکـە، بـە مـەرجێك نووسەر ڕەچاوی پێوەر و ڕێبازی لێکۆڵینەوەی زانستی تیایدا بکات.

# کاریگەریی مۆسیقای غەزەلێکی جزیری لەسەر قەصیدەیەکی وەفایی

**پ.ی.د. سەردار ئەحمەد گەردی**
**بەشی زمانی کوردی -کۆلێژی پەروەردە**
**بۆ زانستە مرۆڤایەتییەکان -زانکۆی سەلاحەدین**

**پێشەکی**

لەوەتــەی شـیعر هەیــە کاریگــەریی شــاعیرانی تــر تیایــا ڕەنگــی داوەتــەوەو کاریگەریشــی لەســەر شــاعیرانی تــر هــەبووە. هەســت و ســۆزی خرۆشــاندوون و ڕایچڵەکاندوون و خستوونیەتە سەر کەیف و هەوای خۆی و وشــە و ئــاواز و وێنــە و بیرۆکەی بەسەردا باراندوون و بەشێوەیەك لەشێوەکان لەناو شیعرەکانیاندا ڕەنگی داوەتەوە. بۆیە هیچ شاعیرێك نییە کاریگەریی شاعیرانی تـری بەسـەرەوە نـەبێت. جا ئـەو کاریگەرییـەی کـە لەسـەر شـاعیران دروسـت دەبێـت مـەرج نییـە یەکسـەر لـەلایان ڕەنـگ بداتـەوە، بـەڵکو زۆرجـار ئـەو کاریگەرییـە لەئاسـتی بـێ ئاگاییـدا هەڵدەگیرێت تا ڕۆژێك لـەڕۆژان بـە هـەژانێك سـەردەکەوێتەوە و شـیعرێك ڕەنگڕێـژ دەکات. بەپێی فراوانی ژێرخانی ڕۆشنبیریی شـاعیر کاریگەرییـەکانیش زۆر دەبـن. هەندێکیان ماوەیەکی یەکجار زۆر دەمێننــەوە کـاتێ دەردەکـەون شـاعیر لـەیادی کردووە لەکوێوە بۆی هاتووەو زۆر جار بە هی خۆی دەزانێت. تـا ئـەو کاتـەی کـە ڕەخنەگر بەیادی دێنێتەوە، ئەوسا دەزانێت لەکێی وەرگرتووە. (وەفایی) شـێت و شەیدای دەنگ و ئـاوازی خۆشـیش هەسـتی ئەوەنـدە ناسـك بـووە هـەر ئـاوازێکی بیستبێت ورووژاندوویەتی و کاریگەریی خۆی لەسەر جێهێشتووە. یـەکێ لەوانـەش ئاوازو شێوازی هۆنراوەی (خەمرا حەلال) ی (جزیری) بووە کە جزیـری لەنزیکـەوە ئاگاداری بووە. ئەوەندە پێی کاریگەر بووە زۆر بەزەقی لە قەصیدەیەکیدا ڕەنگی داوەتەوە. ئەو کاریگەرییە لە بەرئەوەی هەردوو هۆنراوەکە بەیەك زمان نووسـراون

و خاوەن یەك کەلتوورن، ناچنە خانەی ئەدەبی بەراوردەوە بەڵکو دەخزێنە ناو بازنەی بەرامبەریەکییەوە. لەبەرامبەریەکییەکەدا سەرەڕای دەرکەوتنی کارگەرییەکە بالاْ دەستیی (جزیری) دەردەکەوێت، دیارە ئەمەش نیشانەی لێهاتوویی (جزیری)یە لەو مەیدانەدا.

**سنووری توێژینەوەکە**

سنووری توێژینەوەکە کاریگەری غەزەلەکەی (جزیری)یە لەسەر قەصیدەکەی (وەفایی).

**ڕێبازی توێژینەوەکە**

لە توێژینەوەکەدا ڕێبازی وەسفی– شیکاری شێوازی ئاماری پەیڕەو کراوە.

**ئامانجی توێژینەوەکە**

دەرخستنی ڕەنگدانەوەی شێوازی مۆسیقی غەزەلەکەی (جزیری)یە لەسەر قەصیدەکەی (وەفایی).

## جزیری و وەفایی

جزیری و وەفایی دوو شاعیری کوردن لە دوو سەردەمی جیاوازدا ژیاون.لە دوو ناوچەی جیا ، یەك لە باکور یەك لە ڕۆژهەلاّتی کوردستان. جزیری ((یەکێکە لە بەناوبانگترین شاعیری کوردستانی سەروو، ناوی ئەحمەدە، ناوی باوکی محەمەد بووە لە بنەماڵەی ئەنسارییان بووە کە یەکێکە لە بنەماڵە ناودارەکانی جزیری بۆتان. لە شاری جزیرە لەدایك بووە... مەلا ئەحمەدی زڤنگی نێوان سەدەی دەیەم و یازدەمی هیجری (سەدەی شازدەم و حەڤدەی مەسیحی) دەستنیشان کردووە... مەلای جزیری لە ساڵی ٩٧٥هـ /١٥٦٧م لەدایك بووە.)) (١١،ل ٢٤٣). بۆ خوێندن گەلێ شارو دێهات گەڕاوە، دواجار ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووەو بۆتە مەلای دوازدە عیلم ، بەمەلایەتی و دەرس وتنەوە زۆر شوێن گەڕاوە ((ئنجا گەڕاوەتەوە ولاّتی خۆی و لە جزیری بۆتان زیندەگانی کردووە تا گەیشتۆتە سەرووی تەمەنی حەفتا ساڵی و لە ١٠٥٠هـ /١٦٤٠م کۆچی دوایی کردووە.)) (١١، ل٢٤٤) شیعرەکانی بەزمانی کوردی شێوەزاری کرمانجی سەروو هۆنیوەتەوە. کەچی (وەفایی) ئەو سەرچاوانەی کە باسیان کردووە ساڵی لەدایکبوونی لە

نێوان سالأنی ١٨٣٨– ١٨٤٤م دادەنێن. وەفایی ((ناوی عەبدولرەحیمی کوڕی مەلا غەفوور کوڕی مەلا نەسروڵلا یە لەناو خەڵکی بە میرزا عەبدولرەحیم ناوبانگی دەرکردووە نازناوی شیعری وەفایی بووە، عەبدولرەحیم لەشاری سابلاغ لەساڵی ١٨٤٤م لەدایك بووە.)) (١٢، ل ٣٤٧) دوای تەواو کردنی خوێندن گەڵ شوێن گەڕاوە. ماوەیەکی زۆر لەلای شێخ عوبەیدوڵلای نەهری بووە. دواجار چۆتە سەردانی ماڵی خودای مەزن ((لە سارای عەرەبستان لە سەردەمی گەڕانەوەی ئەو حاجییانە وەفایی تووشی نەخۆشی زەحیری دەبێ مەرگ ماوەی نادا و ئەنجام لەو ولأتە دوورەدا کۆچی دوایی دەکاو لە ناو لمی بادیەی عێراق یا بیابانی شام لەلایەن هەواڵەکانییەوە لە ساڵی ١٩٠٢ز دوور لە نیشتمان بەخاك دەسپێرریێ)) (١٢، ل٣٤٨). کەواتە وەفایی لە ڕۆژ هەلأتی کوردستان بووە و بەشێوەزاری کرمانجی ناوەڕاست شیعرەکانی هۆنیوەتەوە. واتە لەگەڵ جزیریدا لەسێ لاوە جیاوازن دوو سەردەمی جیا، دوو ناوچەی جیا و دوو شێوەزاری جیا. بەلأم لەکۆتاییدا هەردووکیان بەزمانی شیرینی کوردی شیعریان داناوە. غەزەلە تەڕو ناسك و پاراوەکەی جزیری کاریگەری لەسەر هەست و سۆزی وەفایی کردووە و لە هۆنراوەیەکیدا ڕەنگی داوەتەوە . لێرەدا هەقی خۆیەتی پرسیارێك سەرهەڵبدات. غەزەلەکەی جزیری چۆن و لە کوێ و بە چی گەیشتە وەفایی؟ ! لەگەڵ ئەو جیاوازییانەش کە باسمان کردن کەناڵێکی زۆر گرنگ هەیە کە ڕێگە خۆشکەر بێت بۆئەوەی ئەو بەیەکگەیشتنە ڕووبدات و وەفایی لەنزیکەوە ئاگاداری بەرهەمەکانی جزیری بێت. ئەویش مانەوەی وەفاییە بۆماوەیەکی زۆر لەلای شێخی نەهری ((وەفایی لەساڵی ١٨٦٦ز دا بۆتە مریدو میرزاو ڕازگری شێخ عوبەیدوڵلای نەهری)). (١٢،ل٣٤٨). وەفایی بلیمەتێکی سەردەمی خۆیەتی کە ((خوێندەوارییەکی قووڵ و فراوانی هەبووە و هەمووئەو کتێبانەی ئەو کاتە لەبەر دەستی خوێندەواران بوون خوێندوونیەتەوە. هەر ئەمەش وای کردووە (شێخ عوبەیدوڵلا ی نەهری) لەخۆی نزیك بخاتەوەو ژوورێکی لەسەر دەلأنی دەروازەی ڕێی ژووری حەرەمی خۆی بۆ تەرخان بکات و لەوێ هەم میرزای تایبەتی شێخ بێت و هەم دەرس بە شێخ محەمەد صدیق و شێخ عبدالقادری کوڕی بڵێت و لەدووەم ساڵی هاتنە سەرکاری شێخ عوبەیدوڵلا (١٨٦٦)ەوە بۆماوەی چواردە

ساڵی ڕەبەق میرزای تایبەتی شێخ بێت و زۆربەی ئەو نامە نهێنی و گرنگ و دیپلۆماسییانەی شێخ عوبەیدوڵلا بۆ دۆستان و لێپرسراوان و سەرانی قاجاری و عوسمانی و باڵوێزانی بێگانە دەینووسین.)). (١، ل٢١٢-٢١٣). دیارە ئەو ماوە زۆرەی مانەوەی وەفایی بەسە بۆئەوەی شارەزایی تەواوی هەبێت لەسەر شیعری شاعیرانی کرمانجی سەروو لەسەرووی هەمووشیانەوە جزیری چونکە ((مەلای جزیری سەرداری غەزەلی کوردییە)). (١١، ل ٢٤٧) . جزیری لە سەرووی گشت شاعیرانی سەردەمی خۆیەتی چونکە ((داهێنەری غەزەلی کێشی عەرووزی و یەکیەتی قلفیە لە ئەدەبی کوردیدا مەلای جزیرییە. دیوانی جزیری لەڕووی پلەو پایەی هونەرییەوە لەدیوانی کەڵە شاعیرانی فارسی هاوچەرخی خۆی کەمتر نییە)). (١١، ل٢٤٧). شاعیرێك لەو پلەو پایەدا بێت و شیعرەکانی بەو ناسکی و تەڕو پاراوییەبن، وەفاییش بەو هەستە ناسکەی کە شێت و شەیدای دەنگ و ئاواز بووە و((پەیوەندییەکی قووڵی بەمۆسیقاو ئاوازەوە هەبووە و دەنگی زۆر خۆش و لەئاواز دانانـدا زۆر شارەزا بووە))(١، ل ٢٢٣) جا ئەمە دیوانی جزیری لەبەر دەست بووبێ چۆن شێت و شەیدای ناکاو لە شیعرەکانیدا ڕەنگ ناداتەوە. کەواتە ئەو کەناڵەی کە جزیری و وەفایی بەیەکەوە دەبەستێتەوە زۆر ڕوون و ئاشکرایە.

### مۆسیقای شیعری

شیعرو مۆسیقا پەیوەندییەکی دێرینیان بەیەکەوە هەیە. هەرچەندە هەریەکەیان تایبەتمەندیی خۆی هەیە بەڵام شیعر هەرگیز بەبێ مۆسیقا نابێت. پەیدابوونی ئەو دوو هونەرە بەیەکەوە وای کردووە ئەوەندە بچنە ناخی یەکەوە و تێك بئاڵێن دوای جیابوونەوەشیان نەتوانن دەسبەرداری یەکتر بن چونکە ((پەیوەندییەکی تایبەتی لەنێوان شیعرو مۆسیقادا هەیە ڕەنگە ئەو پەیوەندییە لەگەڵ هەر پەیوەندییەکی ترا جیابێت کە مۆسیقا لەگەڵ هونەرەکانی تردا هەیەتی چونکە شیعریش هونەرێکی زمانییە و دەربڕینی بەهۆی دەنگە و چەشە لێوەرگرتنی بەبیستنە. ڕیتم و کێشیش دەوری سەرەکییان تێدا هەیە.)) (٢٤، ل٩٢-٩٣) مۆسیقا ڕەگەزێکی سەرەکییە لە شیعردا. ((پەیوەندی نێوان شیعرو مۆسیقا پێوەندییەکی مێژووییە. زیادەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێین کە بەیەکەوە

دەستیان پێکردووە و بەیەکەوە هاتوون. دوو هونەرن کۆکن لەگەڵ یەك زیاتر لەوەی جیاوازبن لە ڕووی مادەشەوە ماددەی مۆسیقا دەنگەکان و ماددەی شیعر وشەکانە کە شی دەبنەوە بۆکۆمەڵێك دەنگ.)). (١٩، ل٩٢). بۆیە مۆسیقا هەر لەکۆنەوە لەگەڵ شیعر هاوڕاز بووەو تەواوکەری بووە. چونکە ((نەبوونی ئاوازو مۆسیقا لەشیعردا دەبێتە هۆی لاوازبوونی و سستیی دەقە شیعرییەکە.)) (١٢،ل٣) ئەو مۆسیقایەش بەهۆی ئاوێتەبوونی دەنگەکانەوە دێتەئاراوە بۆیە (( مۆسیقای شیعری لەشیعردا دەبێت تایبەتمەندی دەنگی هەبێت. لەهەمان کاتیشدا خاوەن کاریگەرییەکی لایەنی جوانکاری و گوزارشتیشی هەبێت.))(١، ل٦) ئەو مۆسیقایەی کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی لەگەڵ شیعردا هەیە و لەناو پیتەکاندا تواوەتەوە خۆی لەدوو جۆردا دەبینێتەوە. ئەوانیش مۆسیقای دەرەوەو مۆسیقای ناوەوەن. وە هەریەك لەمانە تایبەتمەندیی خۆیان هەیە و بەیەکەوە مۆسیقای شیعری دێننە ئاراوە.

**مۆسیقای دەرەوە:** دوو ڕەگەزی سەرەکی هەن لەناو مۆسیقای دەرەوە کە ئەو ئاوازە دێننە ئاراوە ئەوانیش کێش و سەروان. هەریەکەیان ڕۆڵی دیار و بەرچاویان هەیە لە بنیاتی ئاوازی دەرەوەی شیعردا.

**کێش:** کێش ئەو چوارچێوە توندو تۆڵەیە کە دەوری شیعر دەدات و لەپچڕان دەیپارێزێ. زۆر لە ڕەخنەگران بەڕەگەزێکی سەرەکی شیعری دادەنێن و بەلایانەوە بەبێ کێش شیعر نایەتە ئاراوە هەر ئەمەش وای کردووە کە ((کێش ئەرکی پێکهێنانی مۆسیقای دەرەوەی شیعر لە ئەستۆ بگرێت و ببێتە چوارچێوەیەکی بەتین و پتەو بۆی کە لە پەرش و بڵاوی دەیپارێزێت))(١٦، ل٢١) بۆیە لەشیعری هەموو نەتەوەکان بەدی دەکرێت چونکە ((کێش بەتەنیا وەك مەرجێکی سەرەکی قالبی شیعری هەموو نەتەوەکان بەکاردێ بەڵام هەریەکە بەپێی تایبەتمەندێتی خۆی و بەگوێرەی سەردەمی خۆی)). (٥، ل٦٩-٧٠). کێش پێکهاتە دەنگەکانە خۆی لەچەند وەستانێکدا دەبینێتەوە بۆیە کێش ((ئاوازێکە و پێویستی بە ساتەوەختێکی دیاریکراو هەیە.)) (١٨، ل٢٤٥) کەواتە ((کێش ڕەگەزێکی بنجی و نەپچڕاوە لە شیعر. شیعر بێ کێش و ڕیتم نابێ چونکە هەر هیچ نەبێ شیعر لە دەنگ دروست دەبێ دەنگیش ئاوازو ڕیتمە))(٤،ل٧١) شاعیرانی

کۆنی کوردیش لەو مەرجەی شیعر لایان نەداوە و شیعرەکانیان لەسەر بنەمای ئاوازێکی ڕێك دارشتووە کە خۆی لەکێشدا دەبینێتەوە . لە کێشیشدا بەشی زۆری شیعری کۆنی کوردی لەسەر بنەمای کێشی چەندی (عەروز) دانراوە. جزیریش یەکێکە لەو شاعیرانەی کە پەیڕەوی ئەو جۆرە کێشەی کردووەو ئەو غەزەلەی باسی دەکەین لەسەر بنەمای کێشی چەندی دانراوە. جزیری غەزەلی (خەمرا حەلال) کە(١٧) بەیتە بەم جۆرە دەست پێدەکات.

**من دی سەحەر   شاهی مەجەر   لەبسی دبەر   مەخمور بو**

**ئەو دیم زەری   سورموشتەری   یارەب پەری   یا حور بو**

د. جزیری ل٤٠٧

غەزەلەکە لەسەر کێشی ڕەجەزی هەشت هەنگاوی سالم دانراوە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| **من/ دی/ سە/حەر/** | **شا/هی/مە/جەر /** | **لەب/سی/ د/بەر/** | **مەخ/مو/ ر/ بو** |
| **ئەو/ دیم/ پە/ ری/** | **سۆر/موش/تە/ری /** | **یا/ رەب/ پە/ ری/** | **یا/ حو / ر/ بو** |
| **-- -- ب --** | **-- -- ب --** | **-- -- ب --** | **-- -- ب --** |
| **مستفعلن** | **مستفعلن** | **مستفعلن** | **مستفعلن** |

هەموو بەیتەکانی غەزەلەکە لەسەر هەمان کێشە بەبێ ئەوەی هیچ گۆڕانکارییێکیان بەسەردابێت تەنیا گۆڕانێکی کەم نەبێت. گشت غەزەلەکە (١٣٦) هەنگاوە. تەنیا (٦) هەنگاوی نەبێت (٣) هەنگاو لەبەیتی دووەم وە(٣) هەنگاو لە بەیتی چوارەم برگەی کۆتاییيان لەبری ئەوەی درێژ بێت کورتە. دیارە ئەمەش زەرووڕەتی شیعری وای کردووە کورت بێت بەڵام بە درێژی گۆ دەکرێت. شایانی باسە کێشی ڕەجەز بەزۆری لەشێوەی (مطوی مخبون)دا بەکار دێت بەڵام شارەزایی و لێهاتوویی (جزیری) یە کە بەشێوە (سالم)ەکەی بەکارهێناوە. (وەفا یی)یش قەصیدەیەکی هەیە (٤٣) بەیتە بەم جۆرە دەست پێدەکات.

**جیلوەی صەبا لەهجەی شەماڵ بۆی زولف و خا ڵی یار دەدەن**

**یا نەو بەهار دێ نێ بە بار میشکی تەتار  بۆی نەستەرەن**

د. وەفایی، ل٩٤.

بەهــەمان شـێوازی (جزیـری) شـیعرەکەی لەسـەر کێشـی (ڕەجـەزی هەشـت هەنگاوی سالم) داناوە.

| جیل /وەی/صە /با/ | لەھ /جەی/ شە/ ماڵ/ | بۆی/ زول/ فو/ خا/ | لی/ یا ر/ دە/ دەن |
|---|---|---|---|
| یا /نەو/ بە/ هار/ | دێ / نێ / بە/ بار/ | میش/ کی/ تە/ تار/ | بۆی/نەس/تە/رەن |
| -- -- ب -- | -- -- ب -- | -- -- ب -- | -- -- ب -- |
| مستفعلن | مستفعلن | مستفعلن | مستفعلن |

قەصیدەکە کە (٤٣) بەیتە تەنیا (٦) بەیتی لەسەر کێشـی (ڕەجـەزی هەشـت هەنگاوی سالم)ە ئەوانیش بەیتەکانی (١ ،٢، ٤ ،١٠ ،١٦ ،١٧) ن بەیتەکانی تـر گۆڕانیان بەسەرداهاتووە. (٩) بەیتی جیاجیا لـە هەنـدێ هەنگاوەکانیانـدا تووشـی (خبن) هاتوون. بۆ نموونە بەیتی چواردەهەم :-

| بە/غەم/زە/کان/ | بە/ڕەم/ زە/کان/ | بە/قەو/ سی/ ئەب/ | رۆی/ چا/ وە/ کان |
|---|---|---|---|
| ب -- ب -- | ب -- ب -- | ب -- ب -- | -- -- ب -- |
| متفعلن | متفعلن | متفعلن | مستفعلن |
| تی/ رو/ کە/ما/ | نی/ تور/ ک/مان/ | صەی/ دی/ د/لاْن/ | بە/جان /دە/کەن |
| ب -- ب -- | ب -- ب -- | -- -- ب -- | ب -- ب -- |
| متفعلن | متفعلن | مستفعلن | متفعلن |

وەك دەردەکەوێت تەنیا دوو هەنگاوی سالمە و (٦) هـەنگاوی تووشـی (خـبن) هــاتووە. حــەوت بــەیتی تــری قەصــیدەکە لــە شــوێنی جیاجیــا هەنــدێ لــە هەنگاوەکانیاندا تووشی (طی) هاتوون. بـۆ نموونـە بـەیتی (٨) ەم (ضـرب)ەکـەی تووشی (طي) هاتووە.

| ڕەق/ صو /سە/ما/ | زول/ فی/ دو/ تای/ | لە/بەر/ هە/وای/ | با/لای/ بە/ لای |
|---|---|---|---|
| -- -- ب -- | -- -- ب -- | ب -- ب -- | -- -- ب -- |
| هەر/وەك/بول/بول/ | بە/ ڕۆ/ حو/ دڵ | بۆ/دا / رە/گوڵ / | کەو/تە/شی/وەن |
| -- -- -- -- | ب -- ب -- | -- -- ب -- | -- ب ب -- |
| ؟ | متفعلن | مستفعلن | مستفعلن (مطوي) |

هــەنگاوەکانی (١ ،٢ ،٤ ،٧) ســالمن، هــەنگاوەکانی (٣،٥) تووشــی (خــبن) هاتوون (مخبون)ن. هەنگاوی (٥)ەم هیچ (تفعیلە)یەکی لەسەر پراکتیزە نابێت. و تەنیا لەگەڵ کیشی ژمارەی بڕگە دەگونجێت هــەنگاوی (٨)ەم (مطـوي)یـە بـەیتی پێنجەمی قەصیدەکە بەشـێوەی (مطـوي مخبـون) هـاتووە. کۆمـەڵێ بـەیتی تـری قەصیدەکە هیچ کێشێکی عەرووزییان لەسەر پراکتیزە نابێت. بۆنموونە بەیتەکانی (١٣ ،٢١ ،٢٢،٣٣ ،٣٥ ،٣٦ ،٣٨ ،٤٠)ەم .

بەیتی (٢١)ەم کێشەکەی بەم شێوەیە:—

**لە/هە/نا/سەی/ ئەو/دڵ/مەن/دەی/ فر/قە/خەن/دەی/ ئەو/دەم/قەن/دەی**

**ب ب -- -- -- -- -- -- -- -- ب -- -- -- -- -- -- --**

**بە/بای/بە/هار/ دەد/گوت/بە/بار/ گوڵ/دێ/نە/خوار/ بۆ/نێو/ چە/مەن**

**متفعلن مستفعلن مستفعلن مستفعلن**

بەیتەکە لەسەر دوو سیستەمی کێشی جیاواز بنیـات نـراوە. نیـوەدێڕی یەکـەم لەسەر بنەمای کێشی ڕەسەنی کوردییە و کێشی (١٦) بڕگەییە. نیوەدێڕی دووەم لەسەر بنەمای کێشی چەندییەو کێشی (ڕەجەزی مخبونە) ئەم تێکەڵبوونی کێش و نەهاتنی هەنگاوەکان بەشێوەیەکی ڕێکوپێك دەگەڕێتەوە بۆ :

١— وەفـایی وەك جزیـری شـارەزاییەکی تــەواوی لەســەر کێشــی عــەرووز نەبووەو تەنیا پشتی بەگوێی مۆسیقا بەستووە.

٢— وەفـایی هەنـدێ لـە هۆنراوەکـانی لەسـەر بنـەمای کێشـی ژمـارەی بڕگـە داناوە. بۆیە لێرەدا لێی تێکەڵ بووە.

## سەروا

سەروا سیستەمێکی مۆسیقییە لەسەر بنەمای دووبارەبوونەوە دروست دەبێت و بەشـێکە لـە مۆسـیقای دەرەوە. لـە شـیعری کـۆنی کوردیـدا سـەروا زۆر گرنگـی پێدراوە. وە زۆر جار بەڕەگەزێکی شـیعر دانـراوە ((سـەروا وەکـو بڕبـڕەی پشـتی شیعر وایە و ئەرکەکەشی لەوەدایە کە کۆتایی دەهێنێتن بەو دێـرە شـیعرەو دەقـە

شیعرییەکەش ڕێکدەخات، جگەلەوەش وشەکانی ناو دێڕە شیعرەکانیش کۆ دەکاتەوە و پێکەوە گرێیان دەدات بەوەش پەیوەندی لەنێوانیان دروست دەکات.)) (٢٢،ل١٧٨-١٧٩). سەروا ڕیتمی مۆسیقا ڕێکدەخات و توانا مۆسیقییەکە زیاد دەکات ((ئەویش بریتییە لە کۆمەڵە دەنگێك لەکۆتایی نیوە دێڕ یان بەیت دووبارە دەبێتەوە وەك پشووی مۆسیقی وایە. بیسەر تەوەقعی دووبارەبوونەوەی دەکات لە ماوەی ڕێکخراودا.)) (١٨،ل٢١٥). سەروا تەنیا ئەرکی دروستکردنی مۆسیقای دەرەوە نییە بەڵکو کێش بەهاوکاری کێش بەڵکو ((ئەرکی ئیستاتیکیش دەبینێ. شاعیر زۆر جار هونەر لە داڕشتنی سەروادا دەنوێنێ و جۆرە جوانییەکی زیادەکی بۆ شیعرەکەی مسۆگەر دەکات لەگەڵ ڕەگەزەکانی تردا بەهای ئەدەبی بەرز دەکاتەوە.))(٥، ل٤٤). سەرەڕای هەموو ئەمانە سەروا ((لایەنێکی گرنگە لە سایکۆلۆجییەتی قەصیدە و مانا بێ ئاگاییەکان تیایا، گوزارشت لە بیرە ناوەکییەکان دەکات ئەوانەی شاعیر بێ عەمد نایانهێنێتەوە بەڵکو لە قەصیدەکەدا لە قووڵایی نەستەوە سەر دەردەکات. بۆیە گرنگە کە شاعیر ئەو شتانە بڵێت کە بیریان لێ دەکاتەوە بیرکردنەوەیەکی بەئاگا. سەرواش شاراوەکانمان بۆ ئاشکرا دەکات و ئەو شتانە دەڵێت کە شاعیر نایەوێت پەردەیان لەسەر لابدات لەبیری شاراوە لەناو دەروونیدا.......... سەرواکان تیشکی ڕوونکەرەوەن ئەوەی لە دەروونی مرۆڤایەتیدا حەشار دراوە دەیخاتە سەرەوەو کلیلەکەیمان پێدەبەخشێت.)) (١٥، ل٦٦) لەگەڵ ئەو گرنگییەی سەروا شاعیرانی کلاسیکی کوردیش هەوڵیانداوە دەست ڕەنگینیی خۆیان لەو بوارەدا نواندووە. (جزیری) یەکێکە لەو شاعیرانەی کە گرنگی بەسەروا داوەو ((لە ڕووی قافیەوە شاعیر زۆرترین دەنگەکانی زمانی کوردی و هەندێ لە دەنگەکانی زمانی عەرەبی بەکار هێناوە.)) (١١، ل٢٤٦). لە غەزەلی (خەمرا حەلال) دا وشەکانی سەروا بریتین لە ((مەخمور، حور، کافور، فەغفور، فور، تور، دور، ئەنگور، هور، مەشهور، دەستور، مەنشور، ڕەنجور، سور، مەهجور، مەسرور، مەخمور، مەبرور، مەنقور.)) (١٩ ،ل٤٠٧-٤١٠) . وشەکان هەموویان سەربەخۆن تەنیا وشەی (مەخمور) نەبێت کە لە بەیتی یەکەم و شانزەهەم دووبارە بۆتەوە. سەروای غەزەلەکە بریتییە لە(ور) . پیتی (ر) ڕەوییە وە پیتی (و) ڕیدفە. پاش سەرواکەی

بریتییە لە(بو) سەرەڕای ئەمە جزیری هەر نیوەدێڕێکی دابەشی چوار بەش کردووە. تەنیا سەروای بەشی چوارەمی نیوە بەیتی یەکەم لەگەڵ سەروای کۆتایی نیوە بەیتی دووەم یەکە کە سەروای غەزەلەکەیە. بەیتەکانی تر نیوە بەیتی یەکەمیان سەروای هەر چوار بەشیان یەکە. نیوە بەیتی دووەمەکان سەروای سێ بەشی یەکە سەروای بەشی چوارەمیان هەمان سەروای غەزەلەکەیە. تەنیا نیوە بەیتی دێڕی چوارەم نەبێت، سێ بەشە بەشی یەکەم و دووەم هەمان سەروایان هەیە. ئەو پارچەی ماوەتەوە سەروای غەزەلەکەی وەرگرتووە.

| نیوەدێڕی یەکەم | نیوە دێڕی دووەم | پاش سەروا |
| --- | --- | --- |
| ١–....ەر .....ەر .....ەر .....ور | ...ەر ی.....ەری .....ەری .....ور | بو |
| ٢–..ە شە ....ە شە.....ە شە.....ە شە | ...ەر .....ەر .....ەر ....ور | بو |
| ٣–.....یف .....یف .....یف .......یف | ...ەخت.....ەخت.....ەخت .....ور | بو |
| ٤–.....وڕە .....وڕە .....وڕە .....وڕە | ...ەش ..... هش...............ور | بو |
| ٥–...ەری .....ەری .....ەری .....ەری | ...ەلەك .....ەلەك .....ەلەك .....ور | بو |
| ٦–...ەفیٚ.....ەفیٚ .....ەفیٚ .....ەفیٚ | ....ێم ..... ێم ..... ێم .....ور | بو |
| ٧–...وش .....وش .....وش .....وش | .....یا .....یا .....یا .....ور | بو |
| ٨–....ا ب .....ا ب .....ا ب .....ا ب | .....اند .....اند ....اند .....ور | بو |
| ٩–......ەر .....ەر .....ەر .....ەر | ....ەو .....ەو .....ەو .....ور | بو |
| ١٠–..ەق .....ەق .....ەق .....ەق | ...ەبی .....ەبی .....ەبی .....ور | بو |
| ١١–..ەر .....ەر .....ەر .....ەر | .....وا .....وا .....وا .....ور | بو |
| ١٢ –..ەتیٚ .....ەتیٚ ....ەتیٚ..... ەتیٚ | ....یب .....یب .....یب .....ور | بو |
| ١٣–...ا ل ..... ال .....ا ل .....ا ل | .....ا ر .....ا ر .....ا ر .....ور | بو |
| ١٤–...ین ..... ین ..... ین .....ین | .....ەلا .....ەلا .....ەلا .....ور | بو |
| ١٥–...ەجر.....ەجر.....ەجر.....ەجر | .....ەل .....ەل .....ەل .....ور | بو |
| ١٦–...ەدا .....ەدا .....ەدا .....ەدا | .....ەییٚ.....ەییٚ .....ەییٚ .....ور | بو |
| ١٧–...ەست....ەست....ەست....ەست | .....ەش.....ەش .....ەش .....ور | بو |
| ١٨–....لیٚ .....لیٚ .....لیٚ .....لیٚ | .....لان .....لان .....لان .....ور | بو |

* * *

وێنەی سەروای پارچەکانی ناو غەزەلی (خەمرا حەلال) ی جزیری

قەصیدەکەی (وەفایی)یش وشەکانی سەروای بریتین لە ((دەرەن، نەستەرەن، مەن، دەمـەن، غەفڵەتـەن، زەمـەن، مەعدەن، حەسـەن، بـەدەن، فـەن، ڕەسـەن، سەمەن، خوتەن، تەن، دەکـەن، دەکـەن،زەن، نارەوەن،شـیوەن، تـەن، سـەمەن، چەمەن، دەکـەن، ریشـەکەن، دڵشـکەن، دڵشـکەن، بێیەکـەن، ذوالمـنن ، لێدە ن، ئەنجومەن، وپن، بەمەن، بزەن، موحتەجەن، ڕەبەن، مەسکەن، عەلـەن، کەفـەن، تەن، وطن، وەطــەن ،عدن، ألسـن، حـزن، دەوەن.)) لـەنێو وشـەکانی سـەروادا هەندێ وشە هەن دووبارە بوونەوەتەوە. لەوانە:

| | |
|---|---|
| ١- سەمەن | د. ١١، ٢٠ |
| ٢- تەن | د. ١٣ ، ١٩ ، ٣٧ |
| ٣- دەکەن | د. ١٤ ، ١٥ ، ٢٢ |
| ٤- وەطـەن | د. ٣٨ ،٣٩ |

سەروای قەصیدەکە بریتییە لـە (ەن) پیتـی (ن ) ڕەوییـە پیتـی (ە) دەبێتـە ڕەدیف.هەر چەندە بزوێنی کورتیشە بەڵام لە پێکهاتەی وشەکەیە هۆنراوەکە پاش سەروای نییە. (وەفایی)ش وەك (جزیـری) نیـوە بەیتـەکانی کردۆتـە چـوار بـەش. نیوە دێری یەکەمی چوار بەشـە ، سـێ بەشـیان سـەروایان یەکـە بەشـی چـوارەم سەرواکەی لەگەڵ سەروای گشتیدایە نیـوە یەکەمـەکانی تـر هـەر چـوار سـەروایان وەکو یەکە بەڵام نیوە دێرە دووەمەکان سێ سەروای وەکو یەکە چوارەمی لەگـەڵ سەروای گشتی قەصیدەکەدایە.

| نیوە بەیتی یەکەم | نیوە بەیتی دووەم |
|---|---|
| ١-.........ا.........ڵ ........ا ........ ەن | .........ار .........ار .........ار .........ەن |
| ٢.....................اغ .....................اغ | .....................اغ .....................ەن |
| ٣-....... وور...... وور .........وو ...... وور | ....... وور...... وور........ وور..........ەن |
| ٤- ......ە ر...... ە ر ......ە ر ......ە ر | .......ۆش ..... ۆش......ۆش .........ەن |
| ٥- ......ا و ..... ا و ..... او .......ا و | ..... ە و ....... ە و ....................ەن |
| ٦-...ێکی دا....ێکی دا....ێکی دا........ڵ | .......ما ........ما ......ما ...........ەن |
| ٧-.....اند ..... اند ..... اند ....... اند | .....هێشت.....هێشت..................ەن |

٨-..... ی ..... ەوە ..... ی .....ەوە          ..... ەوە ..... ەوە....... م.........ەن

٩-...ەری .....ەری ..... ەری .....ەری          ..... اند ..... اند....... اند.........ەن

١٠-....گ .....ڕەنگ...... ان.....ڕەنگ          .....ەنگ .....ەنگ.....ەنگ.........ەن

١١-.....ەر ..... ەر ..... ەر ...... ەر          ......ین ...... ین....... ین.........ەن

١٢-...ووری.....ووری.....ووری....ووری          .....ا ی ......ا ی ...... ا ی.........ەن

١٣-...ەمی.....ەمی.........ی.....ەمی          ..... ە ر ..... ە ر........ ن.........ەن

١٤-...ەکان .... ەکان........ ب.... ەکان          ..... ا ...... ا ن ...... ا ن.........ەن

١٥-.....ا ی ..... ا ی..... ا ی.......ا ی          ..... ن ..... ا ..... ا .......ەن

١٦-.....ەبی .....ەبی.....ەبی.......ەبی          ..... ا ن ..... ان ..... ا .......ەن

١٧-......ن .....ەند .....ەند.......ەند          .....ا ن ..... ا ن..... ا ن ...... ەن

١٨-.....ا ی .....ا ی..... ا ی ......ا ی          ..... ل .....ڵ ..... ڵ .......ەن

١٩-.....ە ن .....ا ن.....ەن .......ان          .....ا .....ن ..... یٚ .......ەن

٢٠-.....وو .....وو .....و ........ چ          .....ەر .....ە ر ..... ە ر.......ەن

٢١-.....ا ز ..... ا ز..... ا ز ....... ا ز          .....ا و ..... ا و.....ا و .......ەن

٢٢-.....ن .....ی ..... ڵ .....ی          .....ا ..... ی .....ۆس.......ەن

٢٣-.....ەی.....ە ی.....ە ی.....ە ی          ......ا ر .....ا ر .....ا ر .......ەن

٢٤-.....ر .....ی ..... ی ......ی          .......ا .....ی .....س .......ەن

٢٥-.....ی .....ن .....ی ......ن          ......ش .....ن .....سە .....ەن

٢٦-.....ەرە.....ەرە.....ەرە....ەرە          ........ی .....ا ..... ا .......ەن

٢٧-....ارەیە....ارەیە..ارەیە ..ارەیە          . ....ڵێ ...رە ....رەن .......ەن

٢٨-.............انەتم...........انەتم          ...............انەتم ..............ەن

٢٩-.....ی .....الك......الك.....الك          .......دم ..... دم .....دم.......ەن

٣٠-.....ب .....شە.......گۆ.......شە          .......رە .....شە .....ڵ .......ەن

٣١-.....ما .....ەرە.....یا.......ەرە          .....ەم .....ەی .....دە .......ەن

٣٢-.....ما .....ەتە.....کا.......ەتە          ......یا .....ەتە .....شا .......ەن

٣٣-.....ەی.....ەی .....ەف.....ەی          .......وون.....وون .....وون......ەن

٣٤-.....ەی.....ەر .....ەخ.....ەرە          .....ور ..... ەرە .....لە .....ەن

٣٥-.....ەی.....بێ.......ەی.....بێ          .....ەن .....بێ .....ری.....ەن

٣٦-.....وو.....بێ.......گی.....بێ          ......رێ .....بێ .....رو.....ەن

٣٧-.....فا .....سی.......ەف..سی          .....یی .....سی .....پێ.....ەن

| | |
|---|---|
| ٣٨-....تی.....نا .......وا ......نا | ......رق .....نا .....یش.....ەن |
| ٣٩-......ەی....بیە .....شی.......بیە | .....خو .....بیە .....یك........ەن |
| ٤٠-.....ان .....لك .......لك......لك | .....ان .....لك .....لك........ەن |
| ٤١-.....وا .....عل ......عل......ان | .....وا .....ق .....ق .......ەن |
| ٤٢-.....وا .....وا .......وا.......وا | .....ف .....وا .....بل.......ەن |
| ٤٣-.....ئا .....بێ ......بێ......بێ | .....ف ......بێ .....دا ......ەن |

* * *

وێنەی سەروای پارچەکانی ناو قەصیدەکەی وەفایی

وەفایی لە قەصیدەکەیدا بەم شێوەیە ڕۆیشتووە :

١- ئەو بەیتانەی کە هەر نیوە بەیتێکی کردۆتە چوار بەش تەنیا (٩) بەیتی هەر نیوە بەیتێکیان کراوە بەچوار بەشەوە، سەروای بەشەکانیش یەکن.

٢- ئەو نیوە بەیتانەی کراونەتە چوار بەش و بەیتەکەش بۆ هەشت بەش تەنیا (١٣) بەیت (١٣) نیوە بەیتیان سەروای بەشەکانی تەواوە.

٣- شاعیر (١٤) بەیتی دابەشی چوار بەش کردووە، سێ بەشیان یەك سەروایان هەیە بەشی چوارەم سەروای قەصیدەکەیە.

٤- بەیتەکانی تر کە (٧) بەیتە هەندێکیان بەشەکانیان بە تەواوی دیار نەکراوە یان دیار کراوە بەڵام سەرواکانیان تێکەڵ و پێکەڵە ئەمەش بە بەش ناژمێردرێ. تەنیا دەبێتە پێیەکی عەرووزی.

### مۆسیقای ناوەوە

مۆسیقای ناوەوەی ڕیتم بریتییە لە ڕێکخستنی دەنگەکان چونکە ((ڕیتم زیاتر لەسەر سیستەمی ڕێکخستنی دەنگ هاتووە... جۆری دەنگەکان بزوێن و نەبزوێنن و جۆرەکانیان کورت یان درێژن. سیستەمی دابەشبوونی بزوێنەکان، دووبارەبوونەوەی بزوێنێك، یان چەند بزوێنێك، لە مەدایەکی زەمەنی دیاریکراودا. بەگوێرەی نەبزوێنیش دەنگە کپ و گڕەکان، خشۆك و تەقاوەکان جا پەیوەندی ئەمانە هەمووی بەدەنگەکانی دەوروبەری خۆیانەوە.)).(٥ ،ل ٧٢ -٧٣) ڕێکخستنی دەنگەکان لەگەڵ یەك بەگوێرەی سروشتی زمانەکە برگەی کورت و درێژ، یان بەهێزو بێ هێز دێتە ئاراوە. چونکە ((ڕیتم بریتییە لەجوولانەوە یان

هەستی جوولانەوەیەك کە ڕێکخستنی بڕگەی هێزدارو بێ هێز و درێژی بڕگەکانەوە پەیدا دەبێ، ڕیتم لە شیعردا پشت بە دەستووری کێش دەبەستێ)) (٥، ل ٧١) لەگەڵ ئەوەشدا ڕیتم پەیوەندی بەکەسایەتی شاعیرەوە هەیە و توانـاو لێهاتوویی شاعیر جیا دەکاتەوە، چونکە زۆر جار ئەگەر بابەتەکە هەمان بابەت و کێشـەکەش هەمان کێش بێت دوو شیعرەکە ڕیتمیان جیاواز دەبێت چونکە ((ڕیتم پەیوەندی بەکەسێتی شاعیرەوە هەیە. شاعیری بەهرەدار و شاعیری بێ بەهرە لە بواری مامەڵەتکردن لەگەڵ ڕیتم لێك جیـا دەبنـەوە، شـاعیری داهێنـەرو بـەهرەدار هـەوڵ دەدا دەنگ و کەسێتیی خۆی وەکو خەسیەتێکی تایبـەتی لـە ڕیتمـەوە پیشـان بدات.)) (٥، ل ٧٤) جگـە لـە لێهـاتوویی و دەسـت ڕەنگینیـی شـاعیر، دەروونـی شـاعیر ڕۆڵێکـی گـرنگ دەبینـێ لـە دارشـتنی ڕیتمـی هـۆنراوەدا چـونکە ((بـاری دەروونـی شـاعیر و خرۆشـانی هەسـتی نـاوەوەی پەیوەندییـەکی زۆری بـە ڕیـتم و مۆسیقای ناوەوەی سروشتی ئەو ڕیتمە هەیە کە لە ناوەوە حوکمی شـیعر دەکـا و لایەنی ئاشکراو تاقیکردنەوەی شیعری بەڕەنگی خـۆی دەنەخشـێنێ)) (٥، ل٧٧ ) بۆیـە ئەگـەر شـاعیر خـاوەن دەروونێکـی جـێگیر و ئاسـوودە بـوو ئـەوا ڕیتمـی شیعرەکەی بەهێزو جێگیر دەبێت. خۆ ئەگەر دەروونی شڵەژاو بێت ئەوا ڕیتمێکـی پچڕ پچڕ. یان هەر نەبێ ڕیتمێکی پڕ لە خـەم و ناسـۆر دێتـە ئـاراوە. هـەر چـۆنێك بێت ((شیعر بێ کێش و ڕیتم نابێ، چونکە هەر هیچ نەبێ شـیعر لـەدەنگ دروسـت دەبێت و دەنگیش ئاواز و ڕیتمـە)) (٥، ل٧١) ڕیتمـیش بـە بەشـداریکردنی گـەلێ هونەرو شێواز دێتە ئاراوە.

**دووبارە کردنەوە :**

دووبارەکردنـەوە یەکێکـە لـەو هونەرانـەی کـە شـاعیر لـە بنیـاتی مۆسـیقای ناوەوەی شیعردا پەنای بۆ دەبات و دووبارەبوونەوەش بەگەلێ شێوەو جۆر ئەنجام دەدرێت یەکێ لەوانە دووبارەبوونەوەی دەنگە.

**دووبارە بوونەوەی دەنگ :**

دیـارە لـە هـەر هۆنراوەیەکـدا دەنگێـك یـان چـەند دەنگێـك لـە ئـەنجامی دووبارەبوونەوەیانــدا بەشــێوەیەکی بــەرفراوان زاڵ دەبــن بەســەر مۆســیقای

شیعرەکەدا. لە غەزەلەکەی جزیریدا ئەو دەنگانەی کە زۆر دووبارە بوونەتەوە بریتین لە :

١- و - (٨٩) جار دووبارە بۆتەوە.
٢- ی - (٨٧) جار دووبارە بۆتەوە.
٣- ا - (٨١) جار دووبارە بۆتەوە
٤- ر - (٨٠) جار دووبارە بۆتەوە.
٥- ڕ - (١٠) جار...
٦- د- (٦٧) جار..
٧- م - (٦٤) جار....
٨- ب- (٦٢) جار.....
٩- ن - (٥٥) جار.......
١٠- ل - (٤٨) جار.....
١١- ك - (٢٥) جار......
١٢- ت - (٢٠) جار.......
١٣- وو - (٢٠) جار........

ئەم چەند دەنگانە لەسەر مۆسیقای ناوەوەی غەزەلەکە زاڵن، چونکە ڕێژەی دووبارە بوونەوەیان بەرزە. بەتایبەتی (و، ا، ر، ی، د، م، ب، ن) بنچینەی سەرەکی ڕیتمەکەن.

لە قەصیدەکەی وەفاییشدا ئەو دەنگانەی کە بەڕێژەیەکی فراوان دووبارە بوونەتەوە بریتین لە :

١- ا- (٢٣٦) جار
٢- ی - (٢٣١) جار
٣- و- (٢١٤) جار
٤- ن - (١٩٠) جار
٥- ر- (١٣١) جار
٦- ب- (١٣٠) جار
٧- م- (١٢٨) جار

٨- د- (١٢٥) جار
٩ - ل- (٩٣) جار
١٠- ت- (٩٢) جار
١١- ك- (٩٠) جار
١٢-ڕ- (٤١) جار
١٣- وو- (٣٦) جار

ئەو دەنگانەی کە زاڵن و دەستیان بەسەر ریتمی قەصیدەکە گرتووە بریتین لە (ا، ی، و، ن، ر،ب،م،د) ئەگەر بەراوردێك بکەین دەبینین هەمان دەنگن کە لە هەردوو هۆنراوەکەدا دەستیان بەسەر ڕیتمدا گرتووە. ئەم دووبارەبوونەوەی دەنگانە بەپێی شێوازی شیکاری ئاماری کراوە. زیاتر دووبارەبوونەوەی هەر دەنگێك ڕۆڵی هەیە لە بنیاتی ڕیتمی شیعرەکە و بەپێی ڕێژەی دووبارەبوونەوەکە لەسەر ڕیتمەکە باڵادەست دەبێت. جگە لەوە ڕێکخستنی فۆنیمەکان بەپێی جووت هاودەنگەکانیش لە هەردوو شیعرەکەدا بەدی دەکرێت:

١- **جووت هاودەنگی یەکگرتوو**: (دوو فۆنیم لە دوو برگەی هاودەنگی یەکگرتوودا، چوونیەك :

(أ+ب/أ+ب) یان پێژەوانە : (أ+ب/ب+أ) كۆدەكرێنەوە) (٢-أ-ل٨٣)

**چوونیەك :-**

جزیری : فەغفور سوڕە، سیما دوڕە هەیبەت پوڕە، پوڕ دل گوڕە
(و+ڕ/ و+ڕ/ و+ڕ/ و+ڕ )

وەفایی: یا نەوبەهار دێنیٚ بەبار، میشکی تەتار بۆی نەستەرەن
(ا+ر / ا+ر / ا+ر)

**پێچەوانە:**

جزیری: حوسنا لدێم وەصفان نەشێم هەرچی دبێم ژی دوربو
(ن + ا / ا + ن )

وەفایی : هەم سایە بان، هەم سوورەجان ، هەم نارەوان دوو نارەوەن
(ا +ن / ا +ن / ن+ ا / ن+ ا )

٢- **جووت هاودەنگی دابڕاو** : (دوو فۆنیمی هاودەنگ لە دوو برگەی دابڕاودا، چوونیەك (ا –ب / ا–ب) یان پێچەوانە : (ا – ب / ب– ا) دووبارە دەبنەوە ) (٢ب ل٨٤) .

**چوونیەك :**

جزیری : من دی گەلەك ، ئەو سور مەلەك وەك مەشعەلەك پورِ نور بو

( ل+ك / ل + ك / ل+ ك )

وەفایی : تاری دەما دەم خۆش تەرە، جامی پەیاپەی بیهتەرە

(د + م / د + م)

**پێچەوانە :**

جزیری : جاما زەلا ل خەمرا حەلال یاری شەپال دامن بحال

(ر + ا / ا + ر )

وەفایی (أفتؤمنوا بخوارق وخالق الفلق ألالسن )

(ن + ا / أ + ن )

**دووبارە بوونەوەی وشە :**

دووبارە بوونەوەی وشەش بوارێكی ترە كە هاوكارە لە بنیاتی مۆسیقای ناوەوە . لە غەزەلەكەی جزیریدا ئەم وشانە دووبارە بوونەتەوە.

١- سەحەر (٢) جار ٢- نازك (٢) جار ٣- فەغفور (٢) جار ٤- زەری (٢) جار ٥- مخمور (٢) جار ٦- حور (٢) جار ٧- حەبەش (٢) جار

ئەو وشانەی كە لە قەصیدەكەی وەفایی دووبارە بوونەتەوە بریتین لە :

١- زولْف (٩) جار ٢- وەك (٩) جار ٣- گولْ (٥) جار ٤- خالْ (٣) جار ٥- بۆی (٣) جار ٦- هەم (٣) جار ٧- یار (٢) جار.

لە هەردوو هۆنراوەكەدا دووبارەبوونەوەی وشە بەشێوەیەكی وا نییە بەتەواوەتی زالْ بێت بەسەر مۆسیقاكەدا. ڕۆڵی هەیە بەلاّم بەم شێوە نییە. تەنیا لایەنێكی شیكاری ئامارییە.

**ڕەگەزدۆزی :**

ڕەگەزدۆزی یەكێكە لە هونەرەكانی جوانكاری. ڕۆڵێكی بەرچاوی هەیە لە مۆسیقای ناوەوەدا. ڕەگەزدۆزیش بریتییە لە ((هاتنی دووجار یان زیاتری وشەیەك

بەهەمان شێوەو بەواتای جیاواز.)) (٣، ل٢١ ). لە غەزەلەکەی جزیریدا ڕەگەزدۆزی بەشێوەیەکی زۆر فراوان بەکار هاتووە. بەلاّم لەجۆری ڕەگەزدۆزی ناتەواودایە. ئەویش بریتییە لە ((ئەو وشانەی کە ڕەگەزدۆزییان لێ دەکەوێتەوە یەکێك لە چوار مەرجەکانیان تیا نایەتە دی)) (٣، ل٢٢ ) . جزیری ئەم هونەرەی بەفراوانی بەکار هێناوە.

**أ- ڕەگەزدۆزی جودا**

ئەو وشانەی کە ڕەگەزدۆزییان لێ دەکەوێتەوە لە پیتێکدا جیاوازن. ١- زەری - پەری ٢- وەشە _ مەشە _ ڕە شە ٣- بوەخت _ بەخت ٤- بەخت - تەخت ٥- سوڕە _ دوڕە _ پەڕە _ گوڕە ٦- مەش _ هەش ٧- کەری _ پەری _ هەری _ زەری ٨- گەلەك _ مەلەك ٩ -کەفیێ _ صەفیێ _ دەفیێ _قەفیێ ١٠- وەشاند _ ڕەشاند ١١- زەلال - حەلال ١٢-جەڤین - ئەڤین ١٣-وەقین -شەقین ١٤- بلا - مەلا - هەلا ١٥- زەجر - هەجر -تەجر -فەجر ١٦- بەست - قەست - مەست -دەست ١٦- بوەش - خوەش

**ب_ ڕەگەزدۆزیی زیاد**

ئەوەیە کە ئەو وشانەی کە ڕەگەزدۆزییەکە دروست دەکەن یەکێکیان پیتێکی لەوی تریان زیاترە هەر بۆیەش پێی دەوترێ زیاد.

١- وەشا ند _ شاند ٢- دڵێ_مەڵێ ٣- دلان _ گولان

ئەم ڕێژەیەی ڕەگەزدۆزیی ناتەواو ڕێژەیەکی زۆر فراوانە و بەتەواوی دەستی بەسەر ڕیتمەکەدا گرتووە.

وەفاییش لە قەصیدەکەیا پەنای بردۆتە بەر ڕەگەزدۆزیی ناتەواو و بەم شێوەیە بەکاری هێناوە.

**أ - ڕەگەزدۆزیی جودا :**

١- بەهار --- بەبار ٢ - ڕاغ ---باغ ٣- سوور ------ ژوور - ---نوور----طوور ٤- سەر----بەر----دەر ٥- دۆش--فرۆش ٦- چاو---ڕاو ٧- شەو ---خەو ٨- لێکی دا ----تێکی دا ٩- وەشاند- ---وەرا ند ١٠- نەهێشت ----دەهێشت ١١= ئاسك ---باسك ١٢- جەنگ

--- دەنگ ١٣- عەنبەر ---چەنبەر ١٤- چین ---قین ١٥- دەمی -- کەمی ١٦- بازی --- تازی ١٧- تین ---تەن ١٨- غەمزەکان --- ڕەمزەکان ١٩- بەهای ---هەوای ٢٠-لەبی --- شەبی ٢١- بالآی --- بەلآی ٢٢- سەحەر --- قەمەر ٢٣-مەندەی ---خەندەی --- قەندەی ٢٤ - ساز ---باز--- ناز ٢٥-وەرە --- بەرە ٢٦- پارەیە --- چارەیە ٢٧- جماتلك --- کمالك ٢٨- قدم --- عدم ٢٩- کشف --- نشف ٣٠- غەشە ---کەشە ٣١- لامەی --- نەی ٣٢- حالك --- مالك ٣٣- مالك --- والك ٣٤- ماسوی ---- ماغوی ٣٥- نووری ---- بلووری ---- کافووری.

**ب- ڕەگەزدۆزیی زیاد :**

١- راغ ---- چراغ ٢- فەڕەنگ ---- ڕەنگ ٣- دەنگ ----- خەدەنگ ٤- مالك ----- ممالك

**ڕەگەزدۆزی تەواو :**

١- نواند ------ نواند.

دەبینین لە قەصیدەکەی وەفاییشدا ڕەگەزدۆزیی جودا بالآ دەستە لە بنیاتی ڕیتمدا.

کەواتە هەردوو شیعرەکە لە بنیاتی ڕیتمدا زۆر پشتیان بە ڕەگەزدۆزیی ناتەواو بەستاوە، بەپلەی یەکەم ڕەگەزدۆزیی ناتەواو لە جۆری جودا دووەم لە جۆری زیاد.

**کەرتکردن**

هونەرێکە جگە لە سەروای گشتیی هۆنراوەکە سەرواداری تیا بەکار هاتووە. ئەم هونەرەش پێی دەوترێ کەرتکردن کە هونەرێکی جوانکارییە شاعیران بەمەبەستی ڕازاندنەوەی شیعرەکانیان بەکاریان هێناوە کە هەر دێرە یا نیوەدێڕی شیعرێك دابەشی چەند کەرتێکی سەروادار کراوە جگە لە بوونی سەروای گشتیی شیعرەکە ئەو کەرتانە هاوسەروا دەبن زۆر جاریش هاوکێش دەبن. لێرەدا ((هۆنەر بێجگە لە سەروای گشتیی هۆنراوەکەی لەکاتی هۆنینەوەی هۆنراوەدا سەروادار بەکار دێنێ، ئەم هونەرەش پێی دەگوترێ کەرتکردن چونکە لەبەر سەروادارەکە

وا دەردەكەوێت هۆنراوەكە كـەرت كـەرت كرابـێ )). (٣،ل ٤٠). كـەرتكردنیش لـە عەرەبیدا (((التشطیر) ی پێ دەگوترێت .... بریتییە لەو سەروایەی كە بێجگـە لـە سەروای گشتی هۆنراوەكـە شـاعیر بـۆ تەفعیلـە و دەسـتەواژەكانی نێـو دێرەكـانی هۆنراوەكەی دای دەنێت.)) (٢ب،ل ٤٣) لە كەرتكردندا بـەزۆری شـاعیر دێرەكـانی دابەش دەكات بۆ چوار كەرت ((سێ كەرتی یەكـەمی بـەپیتێك یـان چـەند پیتێكـی دیـاریكراو سـەروادار دەكـات هەرچـی كـەرتی چوارەمیشـە سـەروایەكەی لەگـەڵ سـەروای گشـتی هۆنراوەكـە یـەك دەخـات.)) (٢-ب،ل ٤٣). جزیـری یـەكێ لـەو شاعیرانەیە كـە بـۆ بنیـاتی غەزەلەكـەی پـەنای بـۆ كـەرتكردن بـردووە بـەڵام ئـەو كەرتكردنەی كە جزیری كردوویـەتی شـتێكی جیایـە، هـەر نیـوە دێڕێكـی دابـەش كردووە بۆ چوار بەش واتە چوار كەرتی بەیتەكانی كردۆتە هەشـت پارچـە . چـوار پارچەی نیوە دێڕی یەكەم یەك سـەروایان هەیـە. نیـوەدێری دووەم سـێ پارچـەی یەكەم یەك سەروایان هەیەو پارچەی چوارەمی سەرواكەی لەگەڵ سەروای گشـتیی هۆنراوەكەدایە. كۆتایی هەموو پارچەكانیش لەگـەڵ كۆتـایی هەنگاوەكاندایـە واتـە وەستانی (تفعیلە) و پارچەكان بەیەكەوەیە بەبێ ئەوەی زیان بـەبنیاتی وشـەكان بگەیەنێ. لێـرەدا جزیـری داهێنـانی كـردووە. ڕیتمێكـی تـازەی هێناوەتـە ئـاراوە. وەسەنگی تەواوی ڕیتمەكە لـەم كەرتكردنـەدا دێتـە ئـاراوە. جزیـری بـەم شـێوەیە غەزەلەكەی خۆی كەرت كەرت كردووە :

**من دی سەحەر / شاهی مەجەر / لەبسی د بە ر / مەخمور بوو**

**ئەو دیم پەری / سۆر موشتەری / یارەب پەری / یا حور بوو**

**مستفعلن مستفعلن مستفعلن مستفعلن**

**حوری وەشە / شرین مەشە / كاكۆل ڕەشە / خاڵ حەبەشە**

**خالین دڤەر / میسكا تەتەر / نازك بەشەر / كافور بوو**

بـەم شـێوەیە جزیـری گشـت بەیتـەكانی غەزەلەكـەی كـەرت كـەرت كـردووە. كۆتـایی كـەرت لەگـەڵ كۆتـایی (تفعیلـە)دا دێـت و هـیچ زیـانی بـە بنیـاتی وشـەدا نەهێناوە، شاعیر زۆر سەركەوتوو بـووە و بەشـێكی قورسـایی ڕیتمـی شـیعرەكەی خستۆتە ئەستۆی ئەم هونەرە.

وەفاییش بەکاریگەریی غەزەلەکەی جزیری هـەوڵی داوە ئـەم هونـەرە بـەکار بێنێ و ڕیتمێکی هاوچەشن بۆ قەصیدەکەی بەرپا بکات.

**جیلوەی صەبا / لەهجەی شەماڵ / بۆی زولف و خا / لی یار دەدەن**

**یا نەو بەهار / دێنێ بەبار / میسکی تەتار / بۆی نەستەرەن**

**مستفعلن مستفعلن مستفعلن مستفعلن**

**ڕەنگی وەنەو / شەی دەشت و راغ / عەکسی گوڵ و / صەحراو باغ**

**عالەمیان کر / دە شەوچراغ / وەك زولفی و ڕووی / دڵداری مەن**

وەفایی لە کەرتکردنەکەیدا لـە بـەیتی یەکـەم بەتـەواوەتی سـەرکەوتوو بـووەو هەر نیوەدێرێکی کردۆتە چوار پارچە و بەیتەکە هەشت پارچەیە، بـەڵام لـە بـەیتی دووەمدا دەگەڕێتەوە سەر کەرتکردنـە باوەکـە و بەیتەکـەی کردۆتـە چـوار پارچـە لەبری هەشت پارچە. لـەدوای ئەمـە بەیتـەکانی (٣، ٤، ٦،٥ ،) ی کردۆتـە هەشـت پارچەو لە بەیتی حەوتەمدا نیوە دێری یەکەمی کردۆتـە چـوار پارچـە لـە نیـوەی دووەمدا پارچـەی یەکـەم و دووەمـی تـەواوە بـەڵام سـێیەم و چـوارەمی لێکـداوەو بوونەتە یەك پارچە. بەیتی (٨)ی کردۆتە چـوار پارچـە. بـەیتی (٩) یـەم کراوەتـە هەشت پارچە.بەیتی (١٠)یەمی کردۆتە چوار پارچـە . بـەیتی (١١)ەم نیـوە دێـری یەکەمی بۆتە دوو پارچـەو نیـوەی دووەمـی چـوار پارچـەیە. بـەم جـۆرە دەبیـنین هەموو بەیتەکانی دوایی یا کراوەتە چوار پارچە یان یـەکێ لـەنیوە دێرەکـان بۆتـە چوار پارچە و نیوەکەی تر دوو پارچەیە.

لە گشت بەیتەکاندا تەنیا (٦) بەیتی بەتەواوەتی کردۆتە هەشـت پارچـە لـە بەیتەکانی تردا سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە. لە کەرتکردندا لەهەندێ بەیت لـە کۆتایی (تفعیلە) دا زیانی بە بنیاتی وشە هێناوە. لە بەیتەکانی کۆتاییشدا نەك لـە کەرتکردندا سەرکەوتوو نەبووە بەڵکو لە ڕووی کێشیشەوە سەرکەوتوو نەبووە بەم جۆرە دەبینین وەفاییش کەرتکردنی بۆ بنیـاتی ڕیتمـی شـیعرەکەی بـەکارهێناوە، بەڵام سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوەو ڕیتمەکە لەنێوان هەشت پارچـەیی و شـەش پارچەیی و هەندێ جار چوار پارچەیی دێت و دەچێت.

لە کۆتاییـدا دەگەینـە ئـەوەی کـە قەصـیدەکەی وەفـایی کاریگـەریی تـەواوی غەزەلەکەی جزیری لەسەرە لەڕووی بنیاتی مۆسیقییەوە ئەویش لـە ڕووی کـێش و سەرواو ڕیتمەوە بەتایبەتی ئەو هونەرانەی کـە لـەبنیاتی ڕیتمـدا بـەکاریان هێنـاون یەکن یان زۆر لەیەکەوە نزیکن.

## ئەنجام

لەکۆتایی توێژینەوەکەماندا دەگەینە ئەنجامێك کە لەچەند خاڵێکدا خۆی دەبینێتەوە و کاریگەریی مۆسیقای غەزەلەکەی جزیری لەسەر قەصیدەکەی وەفایی روون دەکەنەوە.

١- وەفایی لەنزیکەوە ئاگاداری هۆنراوەکانی جزیری بووە و وەکو یەکێکی شێت و شەیدای ئاوازو مۆسیقاو دەنگی خۆش غەزەلەکەی جزیری کاریگەری لەسەر دروست کردووە.

٢- هەردوو شاعیر کێشی ڕەجەزی هەشت هەنگاوی (سالم)یان بەکارهێناوە، تەنیا لەلای وەفایی لە چەند شوێنێکدا گۆڕانی بەسەردا هاتووە. وەلە زۆر شوێندا وەفایی سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە و بەرەو کێشی هەزەج یان کێشی ژمارەی برگە رۆیشتووە.

٣- لەڕووی سەرواوە غەزەلەکەی جزیری سەرواکەی (ور) و (بوو) پاش سەروایەکەیەتی . قەصیدەکەی وەفایی سەرواکەی (ە ن) ەو پاش سەروای نییە. هەندێ وشەی سەروا دووسێ جار دووبارە بوونەتەوە بەلاّم لەلای جزیری دووبارەکردنەوە لە وشەی سەروا بەدی ناکرێت.

٤- جزیری بەیتەکانی کردۆتە هەشت پارچە و چوار پارچەی نیوە دێری یەکەم هەمان سەروایان هەیە و سێ پارچەی نیوە دێری دووەم سەروایەکی تریان هەیەو پارچەی کۆتاییش لەگەڵ سەروای گشتیی شیعرەکەدایە، بەلاّم وەفایی تەنیا لەچەند بەیتێکدا سەرکەوتوو بووەو بەیتەکانی کردۆتە هەشت پارچە. بەیتەکانی تر یان شەش پارچەن یان گەڕاوەتەوە سەر شێوە باوەکەی کەرتکردن و کردوویەتە چوار پارچە.

٥- لە دووبارەکردنەوەی دەنگدا لە هەردوو شیعرەکەدا ئەو دەنگانەی کە بە فراوانی دووبارە بوونەتەوە و زاڵن لەسەر مۆسیقای شیعرەکاندا یەکن یان زۆر لەیەکەوە نزیکن.

٦- لە هەردوو شیعرەکاندا زۆر بە فراوانی ڕەگەزدۆزیی ناتەواو لەجۆری جودا بەکار هاتووەو هەندێ جاریش ڕەگەزدۆزیی زیاد کە ڕۆڵێکی بالاّیان هەیە لەبنیاتی مۆسیقای شیعرەکاندا.

٧- لە هونەری کەرتکردندا کەرتکردنەکانی غەزەلەکەی جزیری لەگەڵ کۆتایی پێیەکاندایە و زیانیان بە بنیاتی وشە نەگەیاندووە. قەصیدەکەی وەفاییش لەو بەیتانەی کراونەتە هەشت پارچە کۆتای کەرت لەگەڵ کۆتایی پێدایە و لە چەند شوێنێکدا زیان بەبنیاتی وشە دەگەیەنێت. بەلاّم بەیتەکانی تر نەك تەنیا زیان بە بنیاتی وشە گەیشتووە بەڵکو پارچەکردنەکەش ناتەواوە و مەبەستی نەپێکاوە.

## سەرچاوەکان

**أ- سەرچاوە کوردییەکان**

١- پایەی وەفایی لەناو شاعیرانی سەدەی نۆزدەهەمی کرمانجی خوارووودا، مستەفا سەید مینە، دەزگای تەفسیر بۆ بلاّوکردنەوە، هەولێر،٢٠٠٧

٢- أ- پەخشانە شیعری کوردی، د. محەمەد بەکر، دەزگای چاپ و بلاّوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٠

٢- ب- جوانکاری لە ئەدەبی کوردیدا، ادریس عبداللە، دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٠

٣- ڕەوانبێژی لە ئەدەبی کوردیدا (جوانکاری)، عەزیز گەردی، چاپخانەی شارەوانی، هەولێر، ١٩٧٧

٤- سەروا، عەزیز گەردی، دەزگای ئاراس بۆ چاپ و بلاّوکردنەوە، هەولێر، ١٩٩٩.

٥- کێشی شیعری کلاسیکی کوردی و بەراوردکردنی لەگەڵ عەرووزی عەرەبی و کێشی شیعری فارسی، عەزیز گەردی، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری، هەولێر، ١٩٩٩.

٦- کێش و مۆسیقای هەڵبەستی کوردی، عبدالرزاق بیمار، چاپخانەی (دار الحریة) بەغدا، ١٩٩٢.

٧- دیوانی وەفایی، لێکۆڵینەوەی محەمەد عەلی قەرەداغی، چاپخانەی کۆری زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٨

٨- دیوانی وەفایی، گیوی موکریانی، چاپخانەی کوردستان، چ٣، هەولێر، ١٩٧١.

٩- دیوانی عارفی رەبانی شێخ احمدی جزیری مەشهور بە مەلای جزیری، هەژار شەرحی کردووە، ب، ش

١٠- مێژووی ئەدەبی کوردی، عەلائەدین سەجادی، چاپخانەی (دار المعارف)، بەغدا، ١٩٥٢.

١١- مێژووی ئەدەبی کوردی، د. مارف خەزنەدار، ب٢، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، ٢٠٠٢.

١٢- مێـژووی ئـەدەبی کـوردی، د. مـارف خەزنـەدار، ب٤، دەزگـای چـاپ و بلاوکرنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٤.

**ب- سەرچاوە عەرەبییەکان**

١٣- الاصوات اللغوية، د. ابراهيم انيس، لجنة البيان العربي، القاهرة، ١٩٦١.

١٤- البلاغـة فنونهـا وأفنانهـا، د. فضـل حسـن عبـاس، دار الفرقـان للنشـر والتوزيع، عمان، أردن.

١٥- سايكلوجية الشعر ومقالات أخرى، نـازك الملائكـة، دار الشـؤن الثقافيـة العامة، بغداد، ١٩٩٣

١٦- الشعر والنغم، رجاء عيد، دار النشر الثقافية.، قاهرة، ١٩٧٥.

١٧- فن التقطيع الشعري والقافية، د. صفاء خلوصي، بيروت، ط. ٣، ١٩٦٦.

١٨- فـن التقطيـع الشـعري والقافيـة، د. صـفاء خلوصـي، متشـورات مكتبـة المتنبي، بغداد، ١٩٧٧

١٩- في النقد الادبى، د. شوقى ضيف، دار المعارف، بغداد : د.ت.

٢٠ - بـين الموسـيقى والادب، أسـعد محمـد علـي، دار الشـؤن الثقافيـة العامـة، بغداد، ٢٠٠٩.

٢١- موسيقا الشعر، د. ابـراهيم انـيس، ط٥، مكتبـة الانكلـو المصـرية، مصـر، ١٩٧٨.

٢٢- نظرية الادب، رينية ويلك و اوستن وارين، ت. محي الدين صبحي، د.ت.

٢٣- النقد الأدبي وقضايا الشـكل الموسـيقي في الشـعر الجديـد، علـي يـونس ، الهيئة المصرية العامة للكتاب، قاهرة ١٩٨٢..

**گۆڤارەکان**

٢٤- الرباط المقدس بين الموسيقى والشـعر، عبـدالغفور النعمـة، مجلـة الأقـلام عدد ٥ ، ١٩٨٨. ص ٩٢-٩٣.

٢٥- العلاقة بين الموسـيقى والشـعر، دريـة فهمـي، مجلـة عـالم الفكـر عـدد ٤، ١٩٨١، ص١٠٥ .

## ملخص البحث

## أثر موسيقا قصيدة غزلية للجزيري في قصيدة للوفايي

يظهر هذا البحث الجانب الموسيقي لقصيدة غزلية للجزيري في قصيدة للوفايي. (الشيخ احمد الجزيري) الذي ولد في القرن السادس عشر للميلاد في منطقة الجزيرة، أما (ميرزا عبدالرحيم الوفائي ) فقد ولد في أواسط القرن التاسع عشر في منطقة سابلاغ. فهما شاعران كرديان في منطقتين مختلفتين، الأول من شمالي كردستان والآخر من شرقها، وعاشا في عصرين مختلفين، والأهم من ذلك أنهما تحدثا بلهجتين مختلفتين، الأول كانت لهجته الكرمانجية العليا والآخر كانت لهجته الكرمانجية الوسطى، مع هذا نجد أثر قصيدة الجزيري في قصيدة الوفائي ظاهرا. فالجامع بينهما ان القصيدتين نظما على الوزن الشعري نفسه وهو من أوزان العروض العربي بتفعيلات (بحر الرجز) ، وقد نظما القصيدتين على الفنون الايقاعية نفسها وهما متقاربتان جدا من حيث تكرار الأصوات وتسيدهما في الموسيقى الشعري عند الشاعرين.

ونجد (الجزيري) أكثر تمكنا من (الوفائي) في البنية الموسيقية، فضلا عن ان قصيدة (الجزيري) قصيدة دقيقة من حيث النظم الذي كان حدثا ابداعيا في الشعر الكردي آنذاك، أما قصيدة (الوفائي) فقد يعتريها الكثير من الزلل والنواقص، ففي البحث أكدنا على هذه المناحي فضلا عن الجانب النظري الذي جاء على وفق المنهج التحليلي الأحصائي في البحث.

وفي النهاية خلص البحث الى مجموعة من النتائج التي جاءت في شكل نقاط محدودة.

## Abstract
## The impact of Jaziri's lyric on Wafaiy's poetry

The poet Malay Jaziri was born in the 16th century in Jazira, Northern Kurdistan.Wafai, however, was born in the middle of the 19th century in Sablagh(Mahabad) in east Kurdistan. They are two Kurdish poets who lived in two different times and places speaking two different dialects; Jaziri in northern Kirmanji, Wafai in central Kirmanji. Despite all these differences, the internal music of one of Jaziri's lyrics affects Wafaiy's Poems since Wafai was familiar with a piece of Jaziri's poems. Both poems have the same rhythm, which was composed by the same rhythmical technique. Both used the same alliteration and the same sound was used most frequently in the poem. The musical structure of Jziris poem is much stronger than wafais one.

A part from the theoretical background the paper also deals with some statistical analysis, and it ends with some conclusions

# کێ لە پشت دەرکردنی ڕۆژنامەی (کوردستان)ی تارانەوە بوو؟

**((بە بۆنەی دووبارە لە چاپدانەوەیەوە))**

**د. عوسمان دەشتی**

**دەستپێك**




لە ڕۆژنامەی ( **کُردستان**)ی (**مقداد مدحت بدرخان**)ەوە لە ساڵی ١٨٩٨، بۆ (**کوردستانی نوێ**)ی ساڵی ١٩٩٢، نزیك بە سەدەیەك لە مێژووی ڕۆژنامەنووسیی کوردی دەگوزەرێ، لەو ماوەیەدا زیاتر لە (١٠) ڕۆژنامە و بەلاڤۆکی جۆراوجۆر، لە هەلومەرجی جیاواز، بە هەمان تایتل و ناونیشانەوە چاپ و بڵاو بوونەتەوە[1]. هەندێك لەمانە لە مێژووی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕووناکبیریی کوردیدا ڕۆڵی گرینگ و بایەخی تایبەتییان هەبووە.

(**کوردستان**)ی میقداد بەدرخان، لە پاڵ ئەوەی وەکو سەرامەد و دەستپێکی ڕۆژنامەنووسیی کوردییە، وەرچەرخانێکیشە لە شێوەکانی خەبات و بەرخۆدانی گەلی کورد لە ناوچەکە لە پێناوی گەیشتن بە ئامانجەکانی. هەروەها (**کوردستان**)ی ئۆرگانی حکوومەتی میلیی کوردستان و لە پاشان حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران، هات و هەر چوار پێنج دەورەی دەرچوون و بڵاوبوونەوەی، لەو هەموو کەندو کۆسپ و هەوراز و نشێوییەی ڕووبەڕووی بۆتەوە، لە بارودۆخی نهێنکاری و بە ئاشکرای چاپ و بڵاوبوونەوەی، لە کات و شوێن و خەباتی سەردەمی سیاسیی جیاواز..... ئەمانە هەموو ، ڕەنگە سەربردەیەکی ناوازە و دەگمەن بێت بۆ ڕۆژنامەیەك، کەوا کەم بڵاوکراوە و ڕۆژنامە هەبێت لە

مێژووی چاپ و بڵاوبوونەوەیدا پێیدا تێپەڕ بووبێت، بۆیە پێویستە لێکدانەوە و شیکردنەوەی تایبەتی بۆ بکرێت [٢].

لە ناو هەموو ئەمانەشدا ڕۆژنامەیەکمان هەیە بەناوی (**کوردستان**)، کە لە نێوان ساڵانی ١٩٥٩-١٩٦٤دا لە (**تاران**)ی پایتەختی دەوڵەتی ئێران چاپ و بڵاو بۆتەوە و (٢٠٩) ژمارەی لێ دەرچووە، ئەمیشیان چیرۆکێکی درێژ و دانسقەی هەیە.

ئەوەی تاکو ئەمڕۆ زانراوە و لە لای بەشێك لە توێژەران و مێژوونووسانی ڕۆژنامەنووسی کوردییەوە ڕوون و ئاشکرایە، ئەوەیە کەوا دەزگای (**ساواك**) لە پشت دەرکردن و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەکەوە بووە!. ئەمە ڕەنگە تا ئەندازەیەك لە لای خوێندەوارانی کوردەوە مایەی سەرسوڕمان و پرسیار و تێڕامان بێت. ئاخۆ دەزگا و دامەزراوەیەکی ئاسایش و سیخوڕی، لە حکومەتێکی زۆردار و داپلۆسێنەر، لە وێنەی حکومەتی شاهەنشاهی پەهلەوی، لە دەوڵەتێکی داگیرکەری کوردستان، چۆن و بە چ جۆرێك بە خۆی ڕادەپەرموێت، یا ڕێگە بە خۆی دەدات، ڕۆژنامەیەکی کوردی، کە لەنگەری بایەخ پێدانی زمان و ئەدەب و مێژوو و کلتووری کوردەواری بێت، خۆبەخشانە چاپ و بڵاو بکاتەوە؟.

### هەلومەرجی بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامەکە:

(**ساواك**) وەکو کوردان گۆی دەکەن، یا (**ساڤاك**) وەکو فارسان گۆی دەکەن، کورتکراوەی ناوی دامەزراوەیەکی ئاسایش و سیخوڕی ئێرانی بوو بە ناوی (**سازمان اطلاعات وامنیت کشور**)، لە ساڵی ١٣٣٥ی هەتاوی بەرامبەر ١٩٥٦ی زاینی بە پێی یاسایەکی تایبەت پێکهاتووە. دیارە ئامانج لە دروستکردن و دامەزراندنی هەر دەزگایەکی ئەمنی و موخابەراتی لە وڵاتان لە سەرەتادا، کە بە گوێرەی برگە و پرنسیپە یاسایی و دەستوورییەکان بەڕێوە دەچێت، ئامانجێکی پاك و ڕەوا و پیرۆزە!. بەڵام کەم وا بووە ئەم دەزگا و دامەزراوە ئەمنی و نهێنییانە، بە تایبەت لە ڕۆژهەڵاتی لای ئێمەدا، هەر زوو بە زوو لەو پرنسیپ و بنەما یاسایی و مرۆڤایەتییانە هەڵنەگەڕابێتنەوە کە لەسەری دامەزراون ، لە بری پاراستنی ئەمنیەت و ژیان و سەروماڵ و ئاسایشی خەڵکەکەی، نەبووبێتن بە

قامچی و داردەستی دەسەڵاتداران و نەبوویێت بە ئـەژدیها و بەرنەبوویێتـە ویـزەی **هاوڵاتییان و هاونیشتمانییانی ئەو وڵاتانە؟!**. ئەنجا دیـارە سـاواکیش لـەم یاسـا و ڕێسایە بەدەر نەبووە و نییە.

**(ساواك)** لـە سـەروبەندی سـەرەتای دامـەزران و پێکهاتنیـدا، کۆمـەڵێك لـق و بەش و بەڕێوەبەرێتی دەکاتەوە، هەندێکیان تایبەت بە چالاکی دەرەکی و هەندێك تایبەت و تەرخان دەبن بە چالاکی ناوەخۆیی.

لە بەڕێوەبەرێتی گشتی دەرەکی تایبەت بـە کاروبـاری ڕۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـت، بەشێك بە ناوی **(بخش کردستان)** دادەمەزرێنێ، مەبەستیش لەم ناونیشانە هەموو گەلی کورد و هەموو سەرزەمینی مێژوویی کـوردان لـە عێـراق و سـوریا و تورکیـا و ناوچەکانی سۆڤیەت دەبێت، جگە لە ناوچەکانی کوردستانی ئێـران کـە گرێـدراوی ئیـدارەی کاروبـاری نـاوەخۆ دەبێـت. بەرپرسـیارێتی بەشـەکەش بـە ئەفسـەرێکی زڕەکوردی شاپەرستی ئێرانچی دەسپێردرێت بە ناوی **(عیسا پەژمان)**[٣]. ئامـانجی سەرەکی ئەو بەشە کۆکردنەوەی داتا و زانیاری بووە لەسەر کـوردانی دانیشـتووی ئەو وڵاتانە، **هاوکات** لەگەڵ ڕەوەندی کوردی لە هەندەران و ئەوروپا، بە مەبەسـتی پەیوەندیگرتن و سـازکردنی دۆسـتایەتی لەگـەڵ کـوردان، تـا ئـەوەی پشـتیوانی و سەرنجی کورد لە هەموو شوێنێك بۆ لای دەوڵـەتی ئێـران و سیاسـەتە تازەکـانی! ڕابکێشـن کـە بریتـی بـووە لـەوەی ڕازییـان بکـەن بـە: **(قبـووڵکردنی ڕەوتـی ئاشـتیخوازانە و گرێدانـەوەی پەیوەنـدی و پەیوەسـتەگی کـورد بـە بیرۆکـەی ناسیونالیزمی ئێرانییەوە)**.

دیـارە مەبەسـت لـە **(ناسـیونالیزمی ئێرانـی)** هـەر هـەمان ئـەو سیاسـەت و ئیدیعایەی **(پـان ئێرانیـزم)** بـوو، کـە ڕژێمـی شـای ئێران بـە نـاوی هاوڕەگـەزی و ئاریایی نەژادی، بۆ خاپاندن و خۆڵ لە چاوکردن لە ئاست گەلی کـورد، لـە هـەموو ناوچەکانی کوردستان پەیڕەوی لێ دەکرد.

دیـارە **(عیسـا پـەژمان)** خۆشـی، وەکـو لـەو نووسـراو و چـاوپێکەوتنە ڕۆژنامەوانییانەدا بە دیار دەکەوێت کـە لـەم سـاڵانەی دوایـی لـە ئـەوروپا و ئێـران پەیتا پەیتا بڵاودەبنەوە، ئیمان و باوەڕی تەواوی بەم سیاسەت و ڕێبازە هەبووە،

وەکو ئێستا دەیدرکێنێ کە گوایە ئەو لەم ڕێگەیەوە توانیویەتی هەم خزمەت بە گەلی کورد بکات و هەم بە دەوڵەتی ئێرانیش.

ئەمە یەکێکە لەو پاساوانەی کە پاشتر دەبێتە پاڵنەرێك تاوەکو **(ساواك)** ڕۆژنامەی **(کوردستان)** دەربکات.

### کێ لە پشت پێشنیازی دەرکردنی ڕۆژنامەیەکی کوردییەوە بووە لە ئێران؟

**(پەژمان)** بە گوێرەی نەخشە و بەرنامەیەکی تایبەت، بە پەنامەکی و خۆ گۆڕین لە ساڵانی ١٩٥٧–١٩٥٨ دەکەوێتە گەشت و گەڕان بە ناوچەکانی کوردستان لە عێراق و سوریا و تورکیا، پەیوەندی لەگەڵ سەرۆك هۆز و سیاسەتمەدار و کەسە ناودار و ناسراوەکانی کورد دادەمەزرێنێ، تاوەکو سەرنجیان بەلای سیاسەتە بەناو تازەکانی ئێران ڕابکێشێت لەو ڕێگایەوە پێگەیەك بۆ ڕژێمی پاشایەتی سەرلەنوێ دروست بکاتەوە، دوابەدوای ئەو هەموو زۆردارییەی دەرهەق بە کوردانی ڕۆژهەلاَت نواندی، چ لە دوای هەرەسهێنانی حکوومەتی میللیی کوردستان و چ لە دوای شکستهێنانی بزووتنەوەی دیموکراتیی **(موسەددەق)** لە ساڵی ١٩٥٣ بە دواوە.

هەر لە درێژەی بانگەشەکان بۆ سیاسەتی تازەی دەوڵەتی ئێرانی، دام و دەزگاکانی ڕاگەیاندن لە ئێران **هەڵمەتێکی** فراوانیان بەرپا کردبوو سەبارەت بە **(قانونی اصلاحات ارضی)** و بە **(شۆڕشی سپی)** ناویان دەبرد، کەوا **(شاە و ملت)** لە بەرامبەر سیستەمی **(أرباب – رعیت)**ی ئێران هێنایانەتە ئاراوە. لەم چوارچێوەیەدا **(پەژمان)** چالاکییەکانی فراوانتر دەکات و لە هەوڵی پەیوەندیکردن بە هەندێ کەسایەتی ناسراوی کورد و هەندێ سیمبولی نیشتمانی و ئەندامانی بنەماڵە دیارەکانی کوردەوە دەبێت، کەوا پەرتەوازەی دەرەوەی کوردستان بوون و نیشتەجێی ولاَتانی ئەوروپان. یەکێك لەمانە **(میر کامەران بەدرخان ١٨٩٥–١٩٨٧)** دەبێت لە فەرەنسا.

**شۆڕشی ١٤ی تەمووز و گۆڕانکاری لە عێراق:**

شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ لە عێراق کۆتایی بە ڕژێمی پاشایەتی هێنا و گۆڕانکارییەکی ڕیشەیی لە باری سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیری لەگەڵ خۆیدا هێنا. دانیشتووانی عێراق، لەوانەش گەلی کورد لە دوای دەیان ساڵ لە خەبات و قوربانیدان ژیانی ئازادییان بۆ دەستەبەر بوو، مافی سیاسی و نەتەوەیی و دیموکراتییان لە دەستووری نوێی عێراق جێگیر کرا. ئەم دەسکەوتانە گیانی کوردایەتییان لای ڕۆڵەکانی گەلی کورد لە پارچەکانی دیکەی کوردستان زیندوو کردەوە. لەو لاشەوە ڕژێمی تازە، (**عێراق**)ی لە کۆت و بەندی پەیمانی بەغدا و کۆمپانیاکانی نەوت و بەرەی سەر بە ئیمپریالیزم دابڕی، بەمەش (**عێراق**) بوو بە یەکێك لە وڵاتانی ئازادیخواز تا ئەوەی لە سەرەتاوە وا پێشبینی دەکرا کە بەتەواوی بچێتە ڕیزی وڵاتانی سەر بە سۆڤیەت و بەرەی سۆشیالیزمی جیهانییەوە. لەو لاشەوە ئیدیعاکانی گێڕانەوەی (**کوێت**) و بانگەوازەکانی عرووبە لە ئاست ناوچەکانی (**ئەهواز و خووزستان**) لە پاڵ بانگەوازەکانی یەکێتی نەتەوەیی عەرەب کەوا عەبدولناسر ڕێبەرایەتی دەکرد.... ئەمانە هەموو وێکڕا بوون بە مۆتەکە و خەو و خۆراکیان لە ڕژێمی سەڵتەنەتی شاهەنشاهی لە ئێران حەرام کردبوو. بۆیە پیلانەکانیان چڕتر کردەوە بۆ پەکخستنی ڕژێمی قاسم لە عێراق، تا ئەوەی هەر هیچ نەبێت ڕێگە لە بڵاوبوونەوە و تەشەنەکردنی ئەو ئاگرە بگرن و نەهێڵن بپەڕێتەوە بۆ ئەودیوی سنوور! . هەوڵەکانی (**ساواك**) گەرم و گوڕتر بوو بۆ ئەوەی جڵەوی دەستپێشخەری و لەوانەش (**کارتی کوردی!**) لە چنگی خۆیاندا بێت و بۆ بەرژەوەندی خۆیان و بۆ بەگەڕخستنی پیلانەکانیان لە عێراق بە کاری بهێنن! .

بۆیە سەرانی (**ساواك**) بە گەرمی کەوتنە جرت و فرت و پەیوەندیگرتن لەگەڵ سەرانی کورد چ لە ناوچەکە و چ لە دەرەوەدا، ئامادەیی ئەوەشیان نیشان دا وەکو نیازپاکی! هەندێ شت لە ئێراندا بۆ کورد بکەن.

**سەفەری پەژمان بۆ فرەنسا و داخوازییەکانی میر کامەران:**

د. کامەران بەدرخان لە ساڵانی دوایی لە فرەنسا دەژیا و مامۆستای تەرخانی کۆرسی زمان و ئەدەبیاتی کوردی بوو لە زانکۆی (**سۆربۆن**) لە پاریس. بەدرخان سەرکردەیەکی کوردی ناسراو بوو لە سەر ئاستی نێودەوڵەتی، پەیوەندی و ئاشنایەتییەکی فراوان و بەربڵاوی هەبوو لەگەڵ سیاسەتمەداران و سەرکردەکان و حیزب و حکوومەت و دەوڵەتانی دنیا، ئاژانسەکانی دەنگوباس و دەزگا ئەمنی و هەواڵگرییەکانی وەکو (**CIA**، **مۆساد، ساواک،....**) و هی تر. جگە لە ئاشنایەتی لەگەڵ گەلێك باڵیۆز و کونسڵ و بەرپرسە گەورەکانی (**ساواك**)، دۆستایەتییەکی کۆنیشی لەگەڵ شادا هەبووە، تەنانەت شای ئێران لە سەردانەکانیدا بۆ وڵاتانی ئەوروپا لەو ساڵانەدا زیاتر لە جارێك چاوی بە د. بەدرخان کەوتبوو، هەر وەکو چۆن د. کامەران پێش تەمووزی ١٩٥٨ سێ جار سەردانی ئێرانی کردبوو. ئەنجا لەم نێوانەدا و پەیوەست بە بەستێنی ئەو هەلومەرجە سیاسییەی لە ناوەخۆی ئێران و لە ناوچەکەدا دەگوزەرا، (**ساواك**) لە کۆتایی پەنجاکاندا پەیوەندی بە میر کامەرانەوە دەکەن و تەنانەت عیسا پەژمان خۆی بۆ دیدەنی دەچێتە پاریس. لەو دیدارەدا پەژمان داوای هاوکاری و پشتیوانی لێ دەکات بۆ سیاسەتە تازەکانی شا تایبەت بە مەسەلەکانی کورد و کوردستان لە ناوچەکەدا، تەنانەت ئارەزووی ئالا حەزرەت شای ئێرانیشی پێ ڕادەگەیەنێت، کەوا بانگێشتنی دەکەن تاوەکو بچێت لە تاران بژی!. میر کامەران بەدرخان دیارە وەکو یەکێك لە سەرکردە بە ئەزموون و ناودارە کلاسیکییەکانی کورد ناشێ وا بە سووك و سانایی خۆی بخاتە داوی ڕژێمێکی زۆرداری وەکو ڕژێمی شا، کە هەتا دوێنێ خەنەبەندانی بە خوێنی شەهیدانی سەرکردەی وەکو پێشەواوە دەکرد، لە ئێستاشدا بە دەیان ئازادیخوازی کوردی لە کونجی زیندانەکانی (**ساواك**)دا قایم کردبوو، تەنانەت حوکمی ئیعدام و لە سێدارەدانی بەسەر چەند تێکۆشەرێکی وەکو (**غەنی بلوریان و عەزیزی یوسفی و میرزا ڕەحمەتی شەریعەتی و....**) دا سەپاندبوو. بەڵام دیارە وەڵامی ڕاستەوخۆشی بە نەرێ لە ئاست داخوازییەکانی (**ساواك**) و ڕژێمی شادا

نەداوەتەوە، بەڵکو بۆ ئەزموونکردنی نیازپاکی سیاسەتە تازەکانی ئێران چەند داخوازییەك دەخاتە بەردەمی پەژمان و ڕژێمی شا لە وێنەی:

١. ڕێگەدان بە بڵاوبوونەوەی چاپەمەنی بە زمانی کوردی و لەوانە ڕێگا خۆشکردن بۆ چاپ و بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەیەکی کوردی.

٢. کردنەوەی بەشی کوردی لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنی ئێرانی.

٣. کردنەوەی بەشی خوێندنی زمان و ئەدەبیاتی کوردی لە زانستگای تاران.

٤. ئەنجا لە پاڵ ئەمانەشدا میر کامەران داوای لابردنی حوکمی ئیعدام لە سەر ئەو کوردە ئازادیخوازانە دەکات کە لە ئەنجامی چالاکیی سیاسی و دیموکراتیخوازانەوە لە گرتووخانەکانی ساواکدا ئاخێندراون.

دیارە (**بەدرخان**) لە دەروازەی مافە ڕۆشنبیری و فەرهەنگییەکانەوە بۆ مەسەلەکان چووە، وەکو هەنگاوی یەکەم و سەرەتایی بۆ ئەزموونکردنی سیاسەتەکانی ڕژێمی شا. ئەو باوەڕی وا بووە ئەگەر هات و لە سەرەتادا زمان و ئەدەبیات و ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەوانی کوردی بە ڕەسمییەت ناسێندرا، ئەوە نیشانەی دانان و بەڕەسمی ناساندنی گەلی کوردە لە بەشێکی ئەو وڵاتەدا کە دەکرێ لە دواتردا قسە لەسەر مافە سیاسی و نەتەوەییەکانیشی بکرێت.

**(ساواك) داخوازییەکانی میر بەدرخان بە هەند وەردەگرێت:**

بەرپرسانی (**ساواك**) داواکارییەکانی میر بەدرخان تاوتوێ دەکەن، تا ئەوەی بە بەرژەوەندی خۆیانی دەزانن لەم ڕێگەیەوە هەنگاو هەڵێنن.

مەسەلەکان لە شێوەی پرۆژەیەك فۆرمۆلە دەکەن و دەیخەنە بەردەمی شا:

١. (**ساواك**) ڕۆژنامەیەك لە تاران دەربکات و بە هەموو بەشەکانی کوردستان و کوردانی هەندەراندا بڵاوی بکاتەوە.

٢. لە ئێستگەی ڕادیۆی تاران بەشێکی پەخشی کوردی بەڕێوەبچێت و ڕۆژانە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بەرنامەکان بە زمانی کوردی بڵاو بکاتەوە.

٣. لەو ئوستانانەی ئێران کەوا کوردنشینن، لە وێنەی: سنە، ورمێ، کرماشان، یا بەشێك لە دانیشتووانی کوردن لە نموونەی: تەورێز و مەشهەد...

ڕێگە بدرێت ڕادیۆ لۆکاڵییە ناوچەییەکانیان بەشێك لە بەرنامەکانیان بە زمانی کوردی بلاَوبکەنەوە.

٤. پەخشی تەلەفزیۆنی بە زمانی کوردی لە تاران و ئوستانە کوردییەکان لە ئێران کەم تا کورتێك ڕێگەی پێ بدرێت.

٥. لە زانستگای تاران کورسییەك بۆ دیراساتی زمان و ئەدەب و مێژووی کورد (کوردۆلۆجی) دابمەزرێت.

٦. فەرمانێکی شاهانە بە لابردنی حوکمی لە سێدارەدان لەسەر ئەو چەند کوردە دەربچێت کە بەدرخان داوای کردبوو.

شا ڕاستەوخۆ ڕەزامەندی لەسەر پرۆژە پێشنیازەکانی (**ساواك**) دەردەبرێت، چۆنیەتی پیادە و جێبەجێکردنیشی هەر بە خودی ساواك دەسپێرێت.

**هەڵبژاردنی ناو، خاوەنی ئیمتیاز، دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەکە:**

تا ئێستا دیار نییە کێ پێشنیازی ناوی (**کوردستان**)ی بۆ ڕۆژنامەکە کردبێت، دوور نییە هەر پەژمان خۆی بووبێت، بەلاَم بە ڕاشکاوی نەی گوتووە.

(**ساواك**) هەر زوو بە زوو دەکەوێتە خۆی تا لەسەر بودجە و بە پشتیوانی خۆی ڕۆژنامەکە لە تاران چاپ و بلاَو بکاتەوە. دەکەونە سۆراغ و دۆزینەوەی کەسێك تا وەکو (**خاوەن ئیمتیان**)ی ڕۆژنامەکە بیناسێنن، ئەنجا کەسانێکی خوێندەوار و ڕۆشنبیر و شایستەش وەکو دەستەی نووسین ڕۆژنامەکە بەڕێوەبەرن. لەو بارەیەوە با گوێ لە پەژمان بگرین کە دەڵێ:

بۆ مەسەلەی دەستنیشانکردنی خاوەن ئیمتیازی ڕۆژنامەکە چووم پرس و ڕاوێژ لەگەڵ (**مەلا سیدیقی موجتەهیدی**) بکەم، کە پێشتر زۆرم هاوکاری کردبوو و تا دەرگای ماڵی شام بردبوو. ئەویش پێشنیازی خوالێخۆشبوو عەبدولحەمید بەدیعوززەمانی کوردستانی بۆ کردم. کە ناوبراو هەم کەسایەتی و زانایەکی ناوداری کورد و هەم مامۆستای زانستگای تارانیش بوو لە گەڕەکی (**تەهران پارس**) دەژیا لە تاران.

پـەژمان دەڵـێ: خواسـت و پێشـنیازەکەم خسـتە بـەردەمی، بـەڵام ئـەو ڕەتـی کردەوە و قبووڵی نەکرد، گوتی: (**چۆن دەتەوێ لەگەڵ ساواکدا هاوکاری بکەم؟**). منیش گوتم: قوربان ئەو قسانە چییە، واز لەم شـتانە بێنـە!، مانگانەیەکیشـت بـۆ دەبڕینەوە، تەنها ناوی تۆ بەسـەر ڕۆژنامەکـەوە دەبێـت و لـەوە بـەو لاوە دڵنیـات دەکەم شتێك پەیوەندی بە تۆوە نابێت. دەڵێ دیسان قبووڵی نەکرد. ئەوسا بـیرم کەوتەوە کە ئەو لە پەیڕەوانی شێخ عوسمـانی نەقشـبەندییە و حەتمـەن گـوێ لـە قسەی ئەو دەگرێـت، ئـەنجا هـەر منـیش بوومـە باعسـی ئـەوەی کـەوا هـەم شـێخ عوسمان و هەم داود بەگی جاف بهێنمەوە بۆ ئێران و ئەوان بـاوەڕی تـەواویان بـە کارەکـانی مـن هـەبوو. چـوومە لای شـێخ عوسمـان و تکـام لێ کـرد، سـەرەنجام بەدیعوززەمانی لەسەر ڕاسپاردەی شێخ هاتە ژێر باری ئەوەی کەوا مـل بـۆ نیـاز و خواستەکانی من بدات، ئەوجار گوتی: باشە ئەمن چی بکەم؟ لە وەڵامدا پێم گوت: ئەمە شتێکە لە پێناوی مەملەکەتی ئێمەدایە، ئەگەر باوەڕ بە من دەکـەی قبـووڵی بکە، تا سەرەنجام ڕازی بوو.

(**ئەحمەدی موفتی زادە**) بەبێ هیچ پرسیار و جوابێك ڕازی بوو لە ڕۆژنامەکـەدا کار بکات، هەر ئەویش (**ئەدەب**)ی باوکی شادڕەوان (**موهەندیس ئەدەب**)ی بە مـن ناسـاند، ئەوسـا هـەردوو برایـانی مـوفتی زادە و شـوکورولّلای بابـانم کـۆکردەوە و بەدیعوززەمانم وەکو خاوەنی ئیمتیـاز پێیـان ناسـاند. دواتـر لـە شـەقامی (**سـەفی عەلی شا**) بارەگایەکم بۆیان بەکرێ گرت و هەرسێ برایانی مـوفتی زادە و ئیلخـانی زادە لەوێ کاریان دەکرد.[٤]

ئینجا پێیانم گوت: لە ڕێگای خودا نەکەن بـێ پاسـاو و لـە خۆتانـەوە مـۆرکی سیاسی بە ڕۆژنامەکـەوە بـدەن، لـەبارەی شـیعر و شـاعیران و مێـژوو و جوگرافیـا و..... ئەو شـتانەوە بنووسـن، دەردی سـەری هـەم بـۆ خۆتـان و هـەم بـۆ منـیش دروست مەکەن!، ئەگەرنا ڕۆژنامەکە ڕادەگیرێت. ئەوان بەو شێوەیە کاریـان کـرد، کاتێکیش ڕۆژنامەکە چاپ و بڵاوکرایەوە بۆ کامەران بەدرخانم ڕەوانە کرد، ئـەویش کە چاوی پێ کەوتبوو پەسندی کردبوو.

**(کوردستان)** لە هەموو ناوچە کوردنشینەکانی ئێران و عێراق و تورکیا و سوریادا بڵاودەکرایەوە، هەروەها بۆ وڵاتانی ئەورووپاش دەچوو و لە نێو خوێندەوارانی کورددا دەستاودەستی دەکرد، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ خواست و داخوازی لەسەر زۆر دەبوو و زیاتر ڕەواجی پەیدا دەکرد، تەنانەت نرخی دانەیەکی لە عێراق گەیشتۆتە (١) دینار، کە ئەمە بۆ ئەو ڕۆژگارە شتێکی چاوەڕوان نەکراو بووە. بەڵام وەنەبێ کارەکە هەر بەو شێوە دڵخواز و ئاساییە بەڕێوە چووبێت، بەڵکو ڕووبەڕووی کەندو کۆسپ و ڕەخنە و بەرهەڵستکاری بۆتەوە، لەلایێکەوە دەوڵەتی تورك لە ڕێگەی باڵیۆزەکەیانەوە لە تاران گلەیی و گازاندەی خۆیان گەیاندبووە دەرباری شای ئێران. لە لایێکی دیکەش بەشێك لە سەرانی **(ساواك)** لە ناوەخۆی ئێران بێدەنگ نابن و بەدگۆیی لە بارەی ڕۆژنامەکەوە دەکەن، چەند دانە ئەفسەر و پلەداری گەورەی ساواك دەچنە لای شا و پێی دەڵێن: ئەم ڕۆژنامەیە ئەمڕۆ بێت یا سبەینێ دەبێتە نموونەیەکی خراپ و خەڵکانی سیستان و بلووجستان و ئازەربایجانمان لێ دەورووژێنێت، ئەوانیش داوا دەکەن و .....سەرەنجام بە زیانی یەکێتی و پێکەوە ژیانی نەتەوەکانی ئێران دەشکێتەوە و وڵات بەرەو هەڵوەشانەوە دەبات....، تا ئەوەی شا هەترەشی دەچێ و ڕاستەوخۆ فەرمان دەدات: **(لە بەیانییەوە نابێت بڵاوبێتەوە!)**.

**(عیسا پەژمان)** حیکایەتەکەمان بەم جۆرە بۆ باس دەکات: ئەو وەختەی من لە باڵوێزخانەی ئێران لە بەغدا کارم دەکرد، سەروەختانەك دەبینم ڕۆژنامەکە نایەت، لە ڕێگەی (**بێ تەل**)ەوە ویستم لە مەسەلەکە بگەم، بەهۆی تەلەگرافێکەوە وەڵامیان دامەوە: **(ئالا حەزرەت دەستووری داوە کەوا ڕابگیرێت)**، داواشیان لێ کردم بەپەلە بگەڕێمەوە بۆ تاران!. کە گەڕامەوە پێیان ڕاگەیاندم، کە شا دەستووری داوە نابێت لەمەودوا ڕۆژنامەکە دەربچێت. بەرپرسی ئەوکاتەی ساواك **(سەرهەنگ پاکرەوان)** بوو، ناڕەزاییم دەربڕی، گوتیان: دیفاعنامەت چییە بینووسە!. نووسیم: ڕۆژنامەکە جێگای خۆی کردۆتەوە و ڕۆڵی خۆی بینیوە، تەنانەت لە عێراق نرخی یەك نوسخەی گەیشتۆتە (١) دینار، کە دەکاتە ٢٢ تومەنی ئێرانی، کوردان بە گیان و بە دڵ شەیدای بوون، ئێمە پێشتر لەسەر قەول

و قەرارێك ڕێككەوتبووین، ئـەم وەسـتانە لـە ناكـاوەی ڕۆژنامەكـە هـەموو ڕیس و گوریسەكانمان لێ دەكاتەوە بە خوری.... ئەمە كارێكی دروست نییە،... دواتـریش خـۆ ئێمـە لەبـەر خـاتری چـاوی كـاڵی كوردەكـان دەسـتمان نەداوەتـە ئـەم كـارە !.....تاد. شا لە وەڵامدا گوتبووی: (**دووبـارە دەسـت بـە چـاپ و بڵاوكردنـەوەی بكەنەوە، بەڵام لە ناوەخۆی ئێران نا، تەنها بۆ كەسانێكی تایبەت و سەرشناس و جێگا متمانەو بڕوا و بۆ خەڵكانی دەرەوەی ڕەوانە بكەن....**).

كوردستان دیسان دەردەچێتەوە، (**ساواك**) هەوڵ دەدات بـە گـوێرەی ڕێنمـایی شا، ڕێ لە بڵاوبوونەوەی لە ناوەخۆی ئێراندا بگرێت، بەڵام كورد واتـەنی ڕێگـا لـە دز ناگیرێـت، بەشـێكی بـەنهێنی و پەنامــەكی و هەندێكیشــی لــە عێراقــەوە دزە دەكاتەوە بۆ ناو ئێران و دەگاتە دەستی خوێندەوارانی كوردی ئێرانی.

پەژمان لێرەدا دەكەوێتە پەسنی هەوڵ و كۆششەكانی: بە هەوڵ و كۆششـێكی ماندوونەناسـانە پـڕۆژەی چـاپ و بڵاوكردنـەوەی ڕۆژنامەكـەمان بـەرێ خسـت و خاوەنی ئیمتیازیشمان بە یەكێك لە مامۆستا ناودارەكانی زانستگای تاران سپارد، كـەوا زانایـەكی مـەزن و ناوبـەدەری كـورد بـوو، لـە پـاڵ ئەوەشـدا دەسـتەیەك لـە ڕۆڵەكانی كوردی زانا و ئـەدیب و خوێنـدەوار و نووسـەر، بـە عشـق و عەلاقەیـەكی زۆرەوە هاریكاری مامۆستا بوون، تا ئەوەی ڕۆژنامەكە بوو بە یـەكێك لـە باشـترین بڵاوكراوەكان بە زمانی كوردی، كە بابەتی سیاسـی و كۆمەڵایـەتی و ئـەدەبی بـڵاو دەكردەوە.

ئەو نرخاندنەی (**پەژمان**) بۆ ڕۆژنامەكە لە جێگـای خۆیدایـە، بـەڵكو بـۆ لایـەنی ژیانی ڕووناكبیری و كلتووریی كورد، بۆ مێژووی ڕۆژنامەنووسی كوردی لە ڕابردوو و لە ئێستادا گرینگی و بایەخی ڕۆژنامەكە چەند قات لەوە زیاترە كە پەژمان بـۆی چووە. تەنانەت لە بوارەكانی زمان و زاراوە، فەرهەنگ نووسی، شیعر و ئـەدەبیات و مێژووی ئەدەبی، مێژوو، وەرگێڕان، جوگرافیای كوردستان و كۆمەڵناسیی كـورد و لایەنەكانی ژیانی سیاسی و ڕۆشنبیری شایستەی ئەوەیە، لە ڕوانگەی جیاجیاوە دەیان توێژینەوەی لە بارەوە بكرێت، چەندین تێـز و نامـەی ئـەكادیمی و زانكـۆیی لەسەر ئامادە بكرێت.

لە کۆتاییدا (**عیسا پەژمان**) قسەکانی لە بارەی ڕۆژنامەی (**کوردستان**) بەوە دوایی پێ دەهێنێت کە دەڵێ: کاتێك (**سەرهەنگ پاشایی– کە یەکێك لە ئەفسەرە گەورەکانی ساواك و باڵیۆزی سەروەختی ئێران بووە لە فرەنسا**)، دەچێتە پاریس و چاوی بە د. کامەران بەدرخان دەکەوێت و لە مەسەلەی جێبەجێکردنی هەموو داواکاری و خواستەکانی ئاگاداری دەکاتەوە، لەوانەش دوا ژمارەی (**کوردستان**)ی بۆ دەبات کە هەواڵی لێبووردنی ئەو ئازادیخوازانەی تێدا بووە کە ئەو داوای کردبوو بەربدرێن، لەگەڵ ڕەنگدانەوەی هەواڵەکە لە ئاژانسەکانی ناوەخۆیی و دەرەوەدا. کە د. کامەران لەو شتانە ئاگادار دەبێتەوە کە ئەنجام دراون، زۆر خۆشحاڵ دەبێت و ئەوپەڕی سوپاس و پێزانینی خۆی بۆ شای ئێران و هەموو ئەو کەس و بەرپرسانەی کە دەستیان لەم کارانەدا هەبووە نیشان دەدات. هەروەها د. پاشایی ڕادەسپێرێت کە سوپاس و پێزانینی خۆی و هەموو کوردان بە شای ئێران ڕابگەیەنێت، دیارە د. پاشایی ڕاسپاردەکەی د. کامەران بەدرخان بەجێ دەگەیێنێ.

دواتر پەژمان لە دوا قسەدا دەڵێ: لە ڕاستیدا ئەم کارە زۆر دەرگای داخراوی بە ڕووماندا کردەوە، هەر لەم ڕێگەیەشەوە توانیمان زۆر کاری مەزن و بەسوود بۆ کورد و کوردستان ئەنجام بدەین!.

عەرەب دەڵێ: ( **ربَ رمیة من غیر رام**)، ئەوان ئەو تیرەیان بۆ مەبەستێکی ناڕەوا خستبووە ناو ماڵی کەوان، کەچی ئامانجێکی تری پێکا، ئەمڕۆ هەر (٢٠٩) ژمارەکەی ڕۆژنامەی (**کوردستان**)ی تاران، بە درێژایی چوار ساڵی تەمەنی لە نێوان ١٩٥٩/٥/٦ وە بۆ ١٩٦٣/٥/٢٥ کە هەفتانە بڵاوبۆتەوە. لە چوار بەرگی قەشەنگ و ڕازاوەدا لە وێنەی پڕۆژەیەکی هاوبەش، لە ئامادەکردنی (**بنکەی ژین**) و (**ئەکادیمیای کوردی**) سەرلەنوێ چاپ و بڵاو کراوەتەوە، ئەم کارە هەم کتێبخانەی کوردی پێ ئاوەدان و هەم چاوی خوێندەوارانی کوردی پێ ڕووناك دەبێتەوە.

## پەراوێز و سەرچاوەکان:

١. به گوێرەی کتێبی (**تێگەیشتنی ڕاستی**) ئـەم ڕۆژنامـە و گۆڤارانـەی کـە بـەم ناوەوە بڵاوبوونەتەوە بریتین لە

- **ڕۆژنامە:**

١. کوردستان، میقداد مەدحەت بەدرخان، قاهیرە، ١٨٩٨.
٢. کوردستان، ئۆرگانی حیزبی دیموکراتی کوردستان، مەهاباد، ١٩٤٦.
٣. کوردستان، عبدالحمید بدیع الزمانی، تاران، ١٩٥٩.
٤. کوردستان، ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستان، بەغدا، ١٩٦١.

- **گۆڤار:**

١. کوردستان، مسیۆنێرە پرۆتستانتەکان، مەهاباد؟، ورمێ، ١٩١٤(*).
٢. کوردسـتان،.........، حەڵـەب، ١٩١٥. ( ع. زەنگەنـە پێـی وایـە هـیچ گۆڤـار و ڕۆژنامەیەك، لەم ساڵەدا، بەم ناوە و لەم شارە دەرنەچووە)
٣. کوردستان، محەمەد میهری، ئەستەمبۆل، ١٩١٩.
٤. کوردستان، ئۆرگانی حیزبی دیموکراتی کوردستان، مەهاباد، ١٩٤٥.
٥. کوردستان (Kurdistan)، کۆمەڵەی خوێندکارانی کورد لە ئـەوروپا، ئینگلتـەرا، ١٩٥٨.

- **چـەندین ڕۆژنامـە و گۆڤـارێکیش بـە نـاوی لێکـدراوەوە بـە هـەمان ناوونیشان چاپ و بڵاو بوونەتەوە:**

٦. بانگی کوردستان (**ڕۆژنامە**)، مستەفا پاشای یامولکی، سلێمانی، ١٩٢٢.
٧. ڕۆژی کوردستان (**ڕۆژنامە**)، م. نووری، سلێمانی، ١٩٢٢.
٨. کوردستانی نوێ (**ڕۆژنامە**)، یەکێتی نیشتمانی کوردستان، هەولێر، ١٩٩٢.
٩. دیاری کوردستان (**گۆڤار**)، ساڵح زەکی ساحێبقڕان، بەغدا، ١٩٢٥.
١٠. **هیوای** کوردستان (**گۆڤار**)، یەکێتی قوتابیان/ لقی سلێمانی، سلێمانی، ١٩٥٩.
١١. ڕۆژی کوردستان (**گۆڤار**)، کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کورد، بەغدا، ١٩٧١.

---

(*) ئەوە هـەمان گۆڤـاری (**کوردسـتان میشـینەری**)یـە کـەوا مسـیۆنێرە پرۆتسـتانتەکان لـە (**شیکاغۆ**) چاپیان دەکرد و لە ناوچەکانی کـوردەواریی سـابڵاغ و ورمـێ بڵاویـان کردۆتـەوە. کاك حەسەنی قازی بە دوور و درێژی مەسەلەکانی پەیوەست بەم بڵاوکراوەیەی لە ژمارەکانی (**گۆڤاری مەهاباد**) و هۆیەکانی دیکەی ڕاگەیاندن خستۆتە ڕوو. (بنۆڕە: ڕۆژنامەڤانی (گۆڤار) ژمارە(١١–١٢).

- **بڕوانە: تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا، د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، بەغدا، ١٩٧٨.**

٢. ڕۆژنامەی (**کوردستان– بڵاوکەرەوەی بیری حیزبی دیموکراتی کوردستان**)، لە دەورەی یەکەم و دەستپێکیدا نزیکەی (١١٣) ژمارەی لە سەردەمی حکوومەتی میللی کوردستاندا لە ساڵی ١٩٤٦ لێ دەرچووە. لە خولی دووەمی لە (**باکۆ**) لە ساڵی ١٩٤٧وە دەست بە دەرچوون دەکاتەوە و نزیك بە ١٢–١٣ ساڵ بەردەوام دەبێت، عەلی گەلاوێژ و ڕەحیمی قازی لە نووسەرە دیارەکانی ئەو دەورەیەن، لە ناوەڕاستی پەنجاکاندا بە هەوڵی عەبدوڕەحمانی قاسملو چەند ژمارەیەکی لە تەورێز لێ چاپ و بڵاو دەکرێتەوە. دوای ئەوە هەواری دەگوێزێتەوە بۆ (**براغ**) و لەوێش (**لە لایەن دەستەی نووسەرانەوە**) خولێکی دیکەی تەمەنی بەڕێ دەکات، لە نووسەرە ناودارەکانی ئەو دەورەیە، هەریەك لە د. قاسملو، حەسەنی قزڵجی، کەریمی حیسامی، د. عەلی گەولاێژ و د. ڕەحیمی قازی دەبن.

لە ساڵی ١٩٧١ لە بەغدا خولێکی تازە لە تەمەنی دەست پێدەکات تا ساڵی ١٩٧٩ دوا بە دوای شۆڕشی ئازادی گەلانی ئێران دەگەڕێتەوە بۆ زێدی جاران و دەورەیەکی ئازادی کورتخایەن دەگوزەرێنێ و لە ساڵی ١٩٨٠ بە دواوە و دووبارە لە ئاوارەیی تاوەکو بە ئەمڕۆ دەگات درێژە بە دەرچوون و بڵاوبوونەوە دەدات.

دیارە ژمارە و زنجیرەی دەرچوون و خول و دەورە جیاوازەکانی پێویستی بە ساغکردنەوە و بە دواداچوون هەیە، چونکی لەو هەموو گۆزەگۆز و هەلومەرجی نالەبار و بێنەو بەرەیەدا زۆر جاران دەستەی نووسەران و شوێنی چاپ و بڵاوبوونەوە و شێوە و قەبارەی ڕۆژنامەکە و ژمارەی لاپەڕەکان و خول و زنجیرەی ژمارەکانی ئاڵوگۆڕیان بەسەردا هاتووە. تەنانەت وەکو نیشان بۆ ژیان و بارودۆخی پڕ لە پێچ و دەوری ڕۆژنامەکە، مامۆستا عەبدوڵڵا حەسەن زادە دەفەرموێت: جارێکیان تاقە ژمارەیەکی ڕۆژنامەکە چوار پایتەختی دنیا دەکات. تاوەکو ڕووناکی چاپ و بڵاوبوونەوە بەخۆیەوە دەبینێت.

**(ئەو ـ کوردستان ـ ەی ـ باکۆ ـ خولی دووەم نەبووە، بەڵکو ئەمە ڕۆژنامەیەك بووە بە ناوی ـ ئازەربایجان ـ فیرقەی دیموکراتی ئازەربایجان لەم شارەدا دەریان کردووە و دوا لاپەڕەی بە ناوی ـ کوردستان ـ وەکو ـ ماوەی ڕۆژنامەی کوردستان ـ لە لایەن ئەو دوو زاتەی سەرەوە سەرپەرشتی کراوە. هەرچی ئەو ـ کوردستان ـ ەیە کە لەپەنجاکاندا دەرچووە ئەوە خولی دووەمە، ئەوەی ساڵی ١٩٦١ ئەوە خولی سێیەمە. هەرچی خولەکەی ـ براغ ـ ە ئەوە چوارەمیانە و ئەو دوو زاتەی دوایی ڕۆڵێکی ئەوتۆیان تێدا**

**نـەبووە - ئۆریژناڵـەکانی ئـەم رۆژنامەیـە تـەنیا لـە کتێبخانەکـەی د. مـارف خەزنـەدار هەڵگیراوە و کاتی خۆی لێیم وەرگرت و لە - بنکەی ژین - فۆتۆیەکمان لەبەر گرتۆتەوە -** بەڕێوەبەری نووسین)

٣. عیسـا عەبـدوڵڵا پـەژمان، لـەدایکبووی سـاڵی ١٣٠٣/١٩٢٤ ی شـاری سـنەی ڕۆژهـەڵاتی کوردسـتانە. لـە دوای تـەواوکردنی قۆناغـەکانی خوێنـدن دەچـێتە کـۆلیجی سەربازی و دەبێـت بـە ئەفسـەر، لـە سـوپای ئێـران گـەلێك شـوێن و ناوچـە دەبینێـت و پلەوپایەی سەربازی دەبڕێت، لە سەرەتادا گۆیا مـەیلی کۆمۆنیسـتی هـەبووە، دواتـر بـە دیار دەکەوێت کە ئەو کەسێکی چێندراو بووە لە ناو ڕیزەکانی حیزبـی تـوودە. لـە دوای پێکهێنانی دامەزراوەی ساواك، یـەکێك لـە ئەفسـەرە بەراییـەکان دەبێـت کـە دەخرێتـە ڕیزەکانی ئەو دەزگایە. لە بەشی خزمەتگوزاری ئیدارەی کاروبـاری دەرەوە دەسـتبەکار دەبێت و لە بەشی کوردستان کار دەکات و دواتر دەبێت بە بەرپرسی ئەو بەشـە. چـەند جار سەفەری ناوچەکانی کوردستان و عێراق دەکات و لەگەڵ چالاکوانانی سیاسیی کورد لە عێراق و سوریا و تورکیا دیدار و پەیوەندی دەبێـت، بناغـە داڕێـژەری ئـەو سیاسـەتە بووە کە دەوڵەتی ئێران وەکو مانۆڕێك لە ئاست مەسەلەکانی کورد و کوردستان، سـوود لە **(کارتی کوردی)** وەربگرێت و لە دژی ڕژێمی قاسم لە عێراق بەکار بهێندرێت. لە سـاڵی ١٩٥٨–١٩٥٩ جێگری وابەستەی سەربازی سەفارەتخانەی ئێران بووە لە بەغدا.

لە ساڵانی ١٩٦١–١٩٧٥ نوێنەری ساواك بووە بـۆ پەیوەنـدی لەگـەڵ سـەرکردەکانی شۆڕشـی کوردسـتانی عێـراق و گۆیـا کلیلـی زۆر لـە نهێنییـەکانی مێـژووی هاوچـەرخی کوردستانی عێراق لە لای ئـەوە. لـە دوای سـاڵی ١٩٧٢ لـە سـاواك دوور دەخرێتـەوە بـە پلەی سەرهەنگی خانەنشین دەکرێت. ئەو جگە لـە بڕوانامـەی ئەفسـەری، لیسانسـی لـە مێژوو و جوگرافیا و ماف و دادپەروەری هەبووە، لە دوای شۆڕشی ئێران لە ساڵی ١٩٧٩ لـە ولاتـە یـەکگرتووەکانی ئەمـەریکا خـەریکی خوێنـدنی ماجسـتێر دەبێـت لـە زانسـتی سیاسی و بەڵام لە پاشان وازی لێ دەهێنـێ، لـە ئـەورووپا گۆشـەیەکی تـەنهایی بـۆ ژیـان هەڵدەبژێرێت و ماوەیەکیش **(ئازادە شەفیق)**ی کچی **(ئەشرەف پەهلەوی)** خوشکی شـا، خێزانی بووە و دواتر لە یەك جیا بوونەتەوە. لە ئەورووپا چەند ڕۆمان و نـۆڤلێتی چـاپ و بڵاو کردۆتەوە، لە وێنەی: **(کوردی دۆ نەدیو، شاری فریشتەکان، شەهریاری بێ تەخت و تاج)** کە لە ڕۆمانە ناودارەکانی ئەون. لە ئەورووپا مانگنامەیەکی بە ناوی **(نیما)** تا سـاڵی ٢٠١١ چاپ و بڵاو کردۆتەوە. جگە لەمانە چەند کتێب و نامیلکەی دیکەشی نووسیون لـە وێنەی: (شێرەژنێك لە ئێـران زەمـین، نهێنییـەکانی ڕێکەوتننامـەی ١٩٧٥، نهێنییـەکانی تیرۆرکردنـی تـەیمووری بـەختیار، شـوێن پەنجـەی سـاواك، خزمـەت یـا خیانەتـەکانی

فردۆست، کورد و کوردستان......) ئێستا تەمەنی لە سەرووی ٨٥ ساڵەوەیە و لە فەرەنسا ژیان بەسەر دەبات، دوایین ئاواتیشی ئەوەیە لە زێد و نیشیتمانی خۆی، لە شاری سنە، لە دامێنی کێوی ئاویەر بۆ هەتا هەتایی گیانی ئارام بگرێت!.

٤. لە بارەی دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەکەوە، لە قسەکانی پەژمان تێکەڵ و پێکەڵی هەیە، ڕاستییەکەی بەو جۆرەیە کەوا لە ژمارەی (١١)ی ڕۆژنامەکە، ڕێکەوتی ١٥ی تەمووزی ١٩٥٩دا بەم شێوەیە بلاّو کراوەتەوە:

خاوەنی ئیمتیاز و مودیری لێپرسراو: عبدالحمید– بدیع الزمانی.

بە چاودێری دەستەی نووسەر:

محەمەد صدیق مفتی زادە– سەرنووسەر

عبدالرحمن و احمد مفتی زادە، عابید سیراج الدینی، شکرالله بابان.

دیارە لە دوایە خەڵکانی دیکەش دەچنە پاڵ دەستەی نووسەرانی ڕۆژنامەکە لە وێنەی، خوسرەو شێخکانلوی میلانی و سوارەی ئیلخانی زادە.

ئەنجا وەکو کاك سەلاحوددینی موهتەدی لە پێشەکی بەرگی یەکەمی ڕۆژنامەکەدا دەیگێڕێتەوە، کە بۆ خۆشم لە نزیکەوە لە کاك سەلاحم بیستووە، دەستەی نووسەران کە لە خزمانی موفتی زادە (**دوو برا و برازایەکیان**) پێك هاتبوون، پرس و ڕاوێژیان لەگەڵ بەرەی تێکۆشەرانی ئەو ڕۆژگارەی کورد لە تارانیش کردووە، واتە (**یەکێتی خوێندکاری کورد**)، تا ئەوەی پەسن و ڕەزامەندیی ئەوانیشیان دەستەبەر کردووە.

**سەرچاوەکان:**


- الموساد في العراق ودول الجوار، شلومو نكديمون، ترجمة: بدر عقيلي، مطبعة دار القدس، بيروت، ١٩٩٨.
- ڕۆژانی ئاوارەییم لە سویسرە، جەمال نەبەز، لە بلاّوکراوەکانی بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیری گەلاوێژ، سلێمانی، ١٩٩٩.
- تندباد حوادث (گفت و گو با عیسی پژمان)، عرفان قانعی فرد، نشر علم، تهران، ١٣٩٠.
- ڕۆژنامەڤانی، (گۆڤار)، ژمارە (١١–١٢)، هەولێر، ٢٠٠٣.

## من كان وراء صدور جريدة ( كردستان ) !
## (بمناسبة اعادة طبع الصحيفة)

خلال القرن المنصرم من تاريخ الصحافة الكردية صدرت صحف عديدة وهي تحمل العنوان ذاته (كردستان)، ومن بينها جريدة (كردستان) الطهرانية التي صدرت خلال الفترة من ١٩٥٩ الى ١٩٦٣.

الامر الشائع والمستغرب في الوقت ذاته هو صدور الجريدة وتوزيعها بدعم وتمويل جهاز الامن الايراني (السافاك) !.

يتقصى البحث عن الظروف والدوافع والملابسات التي رافقت اصدار الجريدة وانتشارها، وعن كيفية وصول المقترح الذي قدمه الى نظام الشاه، الشخصية الكردية القيادية المعروفة والذي كان يعيش في المنفى : الامير كامران بدرخان .

كل ذلك من خلال الحيثيات والمعلومات التي كشف عنها مؤخراً (احد اقطاب ذلك الجهاز آنذاك والذي كان يمسك بالملف الكردي ويحاول جاهدا) تسخيره في خدمة سياسات الحكومة الايرانية الشاهنشاهية .

## About reprinting of the newspaper

Who was behind the publication of the newspaper “Kurdistan”?

During the past century of the history of Kurdish journalism, a number of newspapers were published. They were holding the same title “Kurdistan”. Among them, the Tehran Kurdistan which was being published between 1959-1963.

In the mean time, the common and strange issue was that the publication and distribution of that newspaper was done through support and funding of the Iranian secret police and intelligence service (Savak).

This study examines the circumstances, motives and concomitants accompanied the newspaper’s publication and dissemination. The study also inquires into how the original proposal submitted by the well-known Kurdish leader who was then living in exile, the prince KameranBadirkhan.

This was through considerations and information which were revealed recently by one of that Savak’s chiefs who was in charge of the Kurdish file and trying laboriously to use all methods to exploit it in serving the Shahdom Iranian government policy.

# ڕەنگدانەوەی هەندێ باری دەروونی لە چیرۆکەکانی شێرزاد حەسەندا

م.م. هەڵمەت بایز ڕەسوول
زانکۆی سۆران / کۆلێژی زمان
بەشی زمانی کوردی

پ.ی. د.عادل مەجید گەرمیانی
زانکۆی بەغدا / کۆلێژی زمان
بەشی زمانی کوردی

**پێشەکی**

دەمێکە وتراوە (ئەدەب ئاوێنەی ژیانە)، چیرۆك خاوەن پانتاییەکی باشی بۆ دەربڕینی هەندێ کێشەی دەروونی لە ژیانی مرۆڤدا هەیە، چونکە " بابەتەکانی چیرۆکی دەروونی هەمە چەشن و هەمە جۆرە وەك کێشەکانی غەم و دڵەڕاوکێ و بێ ئومێدی و نوشستی و غەمناکی و خۆشی و شادی و... هتد. ئالۆزی یان پەرەسەندنی هەر کێشەیەك لەو کێشە دەروونییانە لە ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤدا دەبێتە بابەتێکی دەروونیی باش بۆ چیرۆکنووس لە کاتی هەڵبژاردنی کەرەسەی دەروونیی باش بۆ نێو چیرۆکە دەروونییەکەیدا "(1).

ئەوەی چیرۆکی دەروونی لە جۆرە چیرۆکەکانی دیکەدا جیا دەکاتەوە ئەو قووڵبوونەوەی ناخی پاڵەوانە، کە لە چیرۆك یان ڕۆمان دەخرێتە ڕوو. ئەوەی چیرۆکە دەروونییەکان بەدەری دەخەن مامەڵەیەکی دەروونییانەی شتە شاراوەکانە بە هەماهەنگی لەگەڵ تیۆرییەکانی دەروونشیکاریدا دەوریان هەیە لە نزیکبوونەوە و خستنەڕووی بارە دەروونییەکانی مرۆڤ.

چیرۆکەکانی شێرزاد حەسەن(2)، وەك دەقێکی خاوەن ڕێبازێکی ڕیالیزمی سایکۆلۆژی، پابەندی شیکارییانەی دەروونی پاڵەوانان و تیۆرەکانی دەروونزانی و چەمك و ڕوونکردنەوەکانی دەروونزانی هاندەرێکی باشن، یان بڵێین ئامرازێکی کاریگەرن، بۆ لێدوان لە گرێ و نهێنییەکانی دەروون، یان باسکردن لە ئازادی و خۆشەویستی و کێشە دەروونییەکانی تاك و کۆمەڵ و دیاردە دزێوەکانی ناو

کۆمەڵ. دەبێ بە زمانێکی سایکۆلۆژی بێ بە دیدێکی سایکۆلۆژییانەوە ڕوو لە ئامانجی نووسینەکان بکات، ئەو خولیابوونەی شێرزادیش بۆ دەروونزانی لێرەوە خۆی دەنوێنێ، کە هۆکارێکی گرنگ بووە بۆ دەربڕینی ئازارەکان و تێگەیشتن لە نهێنییەکانی خود.

شێرزاد حەسەنیش، وەك کەسایەتییەکی ئەدەبی لە بواری چیرۆکی دەروونیی کوردیدا، خاوەن ئەزموونێکی دوورو درێژی ئەم بوارەیە. شێرزاد حەسەن زیاتر بەوە ناسراوە زۆر بوێرانەو بەڕاشکاوی ئەوەی لەناخەوەی هزرو دەروونی پەنگیخواردۆتەوە لە چاوپێکەوتنەکانی دەری دەبڕێت، بۆیە ڕەخنەگر و لێکۆڵەر ئەگەر بەوردی ئەو چاوپێکەوتنانە بخوێنێتەوە، کە لەگەڵ شێرزاد حەسەن کراوە، دەرك بەوە دەکات تا چەند دەقی ئەو چیرۆکانەی نووسیویەتی بوونەتە ئاوێنەیەك بۆ ڕەنگدانەوەی هەندێ لەو بەسەرهاتانەی لە هەردوو قۆناغی منداڵی و هەرزەکاری بەسەریدا هاتوونە. ئەم جۆرە دیاردەیە هاندەرێك بوو بۆ هەڵبژاردنی ئەم لایەن و بابەتە بۆ لێکۆڵینەوەکەمان لە بارەی ڕەنگدانەوەی هەندێ باری دەروونی لەناو چیرۆکەکانی شێرزاد حەسەندا، کەوا لەبوارەکانی شیعر و چیرۆك و ڕۆمان و شانۆ ئەسپی خۆی تاو داوە، بەڵام لەڕێی چیرۆکنووسینەوە زیاتر خۆی بە خوێنەرانی ئاشنا کرد، ئێمەیش ئەم لایەنەمان بە باشتر زانی بۆ چوونە قووڵایی باری دەروونیی کەسێتیی ئەم چیرۆکنووسە داهێنەرە لەناو چیرۆکەکانیدا.

لەم لێکۆڵینەوەیەدا پشتمان بە میتۆدی دەروونی بەستووە، کە میتۆدێکی ڕەخنەییەو زۆر لەبارە بۆ لێکۆڵینەوە لە چیرۆکەکانی شێرزاد حەسەن. ئەم لێکۆڵینەوەیە بریتییە لە پێشەکی و پێنج تەوەر، لەگەڵ ئەنجام و لیستی ئەو سەرچاوانە لە نووسینی ئەم لێکۆڵنەوەیە سوودمان لێ وەرگرتووە. تەوەرەی یەکەممان بۆ خستنەڕووی باری ترس تەرخان کردووە، تەوەرەی دووەم بۆ خستنەڕووی باری شەرم تەرخان کردووە، تەوەرەی سێیەم بۆ خستنەڕووی باری دڵەڕاوکێ تەرخان کردووە، تەوەرەی چوارەم بۆ خستنەڕووی باری خەمۆکی تەرخان کردووە، تەوەرەی پێنجەم بۆ خستنەڕووی باری نامۆیی تەرخان کردووە.. بەو هیوایە ئەم لێکۆڵینەوەیە سوودی خۆی هەبێت بۆ خوێنەرانی...

**تەوەرەی یەکەم : باری ترس**

ترس وەك جۆرە هەڵچوونێك وابەستەی مرۆڤ بووە لێی جیا نەبۆتەوە، هەر لە زووەوە ئاشنایەتی مرۆڤ بە ترس بەشێك بووە لەو شتانەی، کە لە دەوروبەر ڕووبەڕووی مرۆڤ بوونەتەوە. لە مێژووی مرۆڤایەتیش ترس لە دیاردە سروشتییەکانو گیانلەبەرانی دیکە لەپێناو مانەوەی مرۆڤ بووە، لە ژینگەیەکەوە بۆ ژینگەیەکی دیکە، لەگەڵ ئەوەش هۆکاری ترسو جۆری ترس دەگۆڕێتو ڕادەی ترس لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە جیاوازە، بە شێوەیەکی گشتی ترس " ئامادەباشییەکی بۆماوەی هەیە و بەشێکە لە سروشتی مرۆڤایەتی، بەڵام ئەو ئامادەباشییە بە تەنیا نابێتە مایەی ترس، بەڵکو دەبێت کۆمەڵێك فاکتەرو بارودۆخی تایبەتی لەناو کۆمەڵ هەبێت بۆ ئەوەی ترس لای مرۆڤ دروست ببێت"[3].

ترسو ترسان لە باری تایبەتی خۆیو لە چوارچێوە ئاساییەکەی خۆیدا پێویستییەکە بۆ مانەوەو ئاسوودەیی، کە زیاتر بە ترسی ئاسایی ناودەبرێت، بەڵام ئەو ترسەی کە لە سنوورە ئاساییەکەی خۆی بەشێوەیەکی وا تێپەڕ دەکات، کە مرۆڤ گیرۆدەی نەخۆشی دەکات و لەبارە ئاساییەکەی خۆی دەردەچێت و گۆڕانە دەروونی و فسیۆلۆجییەکانی بە هۆیەوە ڕوودەدەن. بەو پێیەی کە " ترس ڕیشەی غەریزیو خۆویستانەی هەیە"[4]. ئەو ترسەی کە لە دەوروبەرەوە لەو ژینگە کۆمەڵایەتییەوە هەر زوو منداڵ پێی ئاشنا دەکرێتو، شوێنەوارێکی پڕ مەترسی دەسەپێنێتە سەر ئەو کەسێتییە لە داهاتوودا. ترسو بەدواهاتنی شەرمیش ئەو قۆناغە سەرەتاییە بوون لە ئازارەکانی ڕۆحی شێرزاد حەسەن، لەم بارەیەوە دەڵێت : " ئاخ هەر خۆم دەزانم من بە چ ترسو شەرمێکەوە پەروەردە دەبووم، من تا سێ ساڵی باڵقبوون کوناو کون دەرپێ زەردەکانی خۆم دەشاردەوە نەم دەهێشت دایکم بیان شوات، ئاخر چەند عەیب بوو باڵغبوون چەند شەرم بوو گەورەبوون، تف لەو سێوە حیزە خڕەی بەر مل... لەو دەنگە گڕە"[5].

جگە لە هەژاریو مەینەتییەکانی ئەو کاتو خێزانێکی هەژار گەورەترین گرێی سەردەمی منداڵی شێرزاد (مێز) بەخۆداکردن بوو وەك دەردێکی ئەوەندە کوشندە

تا ڕادەی گوشارێکی دەروونی زۆر کاریگەر، کە منداڵێك بخاتە بارێکی دەروونیی ناخۆش بەو شێوەیەی، کە هەستی خۆ بەکەم زانین‌و شەرمەزاری‌و بێزاری دایك‌و باوك‌و خۆ بە دوورگرتنەوەی لێ بکەوێتەوە، کە خۆی دوورەپەرێز بگرێت لە هاوڕێ‌و هاو پۆلەکانی. ئەو (میز) بەخۆداکردنەی سەردەمی منداڵیی زوو درێژەی هەبوو تا قۆناغی کامڵبوون " سەرمای ڕەواندزو میز بەخۆداکردنم، زۆر بێزاریان کردبووم، تەنانەت دایك‌و باوکیشم بێزار کردبوو زۆرجار لێیان دەدام لەسەر ئەو میزکردنە، ئەو لێدانە زێتر منی دەترساند "[٦] . ئەگەرچی ترس جۆرو هۆکاری جیاجیای هەیەو، بۆ ڕوونکردنەوەی سەرچاوەکانی ترس ڕەنگە خۆی لە چوارچێوەی ئەو ژینگەیەدا ببینێتەوە، کە لە سەرەتاکانی پەروەردەی منداڵ‌و قۆناغەکانی گەشەی منداڵ‌و هەرزەکار زیاتر کاریگەر دەبن بەسەر خودی ئەو کەسێتییەی، کە لە قۆناغی پێگەیشتن‌و هەراشبوون وەك دیاردەیەك لە هەڵسوکەوت‌و مامەڵەی ڕۆژانەی دەربکەوێت. یەکێك لە خاسیەتەکانی ترس ئەوەیە، کە هۆکاری ترسەکە زانراوە لە هەمان کاتیش دیاریکردنی سەرچاوەی ترسیش دەزانرێت.

ئاشنابوونی چیڕۆکنووس بەو گرێیانەی، کە لە هیچەوە دروست بوون کاریگەرییەکی گەورەی بەسەر دڵ‌و دەروونیدا جێ هێشتووە. چیڕۆکی ئەو منداڵەی کە لە تەمەنی چوار پێنجساڵیدا لە گەڕەکی گلکەند لە هەولێر لە گۆڕستانێکی نزیك گەڕەکی شێرزاد حەسەن، شوێنی یاریکردن‌و گەمەی منداڵان بووە، یاریکردنی ئەو منداڵە کچەی کە شێرزاد خۆی باسی دەکات یاری لەگەڵ کردووە لە شوێنێکی نزیك ماڵیان، دوای گەڕانەوەیان بۆ ماڵ هاتوهاوارو دایك‌و باوکی کچەو خەڵکی گەڕەك هەڵیان کوتابووە سەر ماڵی باوکی شێرزاد حەسەن و هاتوهاوارو قرەیان دروست کردبوو، بە مەبەستی لێدان‌و کوتانی ئەو منداڵەی، کە یاری لەگەڵ کچەکەیان کردبوو. دوای.ئەو شەڕو هەرایە شێرزاد وەك هەستێکی منداڵانە تێدەگات ئەو ئاژاوەیە لەوە سەرچاوەی گرتووە، کە کچەکە بەبێ دەرپێی چۆتەوە ماڵ‌و دەرپێکەی لەکاتی میزکردن بەجێ هێشتبوو، بێ ئەوەی شێرزادی منداڵ ئاگای لێبێت بە مەبەستی دەستدرێژی سێکسی ئەو ئاژاوەیان نابووەوە. شێرزاد دەڵێ: " ئیدی ئەوە یەکەمین گرێی من بوو لەگەڵ شتێك کە من نەم

دەزانی چییە... دیارە تا ساڵ تێپەڕی دەکرد من پتر بەو حەرامە ئاشنا دەبوومو دەمزانی چ وێرانەیەکی دروست کردووە، تا تەمەن هەڵدەکشا ورد دەبوومەوە پتر حاڵی دەبووم کە لە پشت زۆر لە کارو کردەوەکانی مرۆڤ ئەم وزە کوژراوە ئێشی خۆی هەیە "[٧].

ئەم جۆرە ترسە بۆ دروستکراوەی شێرزاد حەسەن کاریگەریی خۆی دەبێت لە پاشە ڕۆژدا بەسەر هەست و هزریدا، کەوا لە چیرۆکی درێژی (من و قالە و سەگەکەی بافلۆف)دا ڕەنگی داوەتەوە کاتێك فەرهادی پاڵەوان دەکاتە شایەتحاڵی خۆی بۆ گێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتە. ئەو جۆرە کردەوە ساکارو بێمەقسەدانە دەکرا بەشێوەیەکی دیکە ڕێنماو ئامۆژگاری بکرابایە تا بەڕاستی و دروستی پەروەردە بکرێت. لەم بارەیەوە شێرزاد حەسەن دەڵێت : " لە خێزانی ئێمەدا بۆ ڕاستکردنو دروستکردنی منداڵو فەرزەندەی گوێڕایەڵ بە (کچو کوڕەوە)، جگە لە سزاو ترساندنو شکاندنو سەرکوتکردن هیچ شێوازێکی دیکەی پەروەردە پەیڕەو ناکرێ. هەمان فەلسەفەی سزا کە باوان بڕوایان پێیەتی، لەلایەن مامۆستاکانی قوتابخانەش پەیڕەوی دەکرێ، کام لە مەلاکانی کوردستان فەلاقە نەکراون ئەو وەختەی کە فەقێ بووبن "[٨].

ترس ئەو خەسڵەتە دەروونییە دیارو ئاشکرایەیە، کە لە چیرۆکەکانی شێرزاد حەسەن ئامادەییان هەیە، لە زۆربەی چیرۆکەکانیدا دیدێکی تایبەتی بۆ ترس خستۆتە ڕوو، لەگەڵ ئەوەشدا ترس لای شێرزاد چ وەك هۆکار یان سەرچاوەی دروستبوونیو کاریگەرییەکانی ترس بەسەر کەسێتی بە ڕوونی دەردەکەوێت. هێڵێکی تایبەتی چیرۆك لەسەر ترس دەڕوات، یان بەچەند دێرێك گۆشەنیگای نووسەر بۆ دیاردەی ترس خراوەتە ڕوو، وەك ئەوەی لە چیرۆکی (ترس) لە کۆمەڵە چیرۆکی (تەنیای) ناوەرۆکی چیرۆکەکە تەواو لە ترسو دڵەڕاوکێ دەدوێت، یان بەپێی سروشتی پێویستی چیرۆکەکانی دیکەش، ترس وەك دیاردەیەکی قێزەونو ترسی نائاگاییو ترسی ئاسایی بوونی هەیە.

ڕەنگدانەوەی ژیانو بەسەرهاتەکانی (شێرزاد حەسەن) بە تایبەتی لە قۆناغی منداڵیو هەرزەیی شێرزاد سەرەتایەکی کاریگەرن، بەپێی ژیاننامە لە پێکهێنانی دەقی ئەدەبی، کە هەوڵی سەلماندنی ئەو ڕاستییانە دەدات بۆ

ناساندنی بەشێکی دیار لە کۆمەڵگای کوردی لە بابەتی ترس وەك حاڵەتێکی نەستیی کۆ . باشترین دەزگا کۆمەڵایەتییەکانیش بۆ دروستکردنی کەسێتیی مرۆڤ خێزانە، بۆیە " هەموو شارەزاو لێهاتووی قۆناغی منداڵی ئاماژە بەوە دەکەن، کە نەمامی دروستی دەروونی یا نەمامی نەخۆشییەکانی دەروونی هەردووکیان لەناو خێزان لەو قۆناغەدا لە دەروونی ئەندامەکانیاندا دەچێنرێت"[(٩)].

ئەو خێزانەی نووسەر تێیدا گەورە بووە، هەمان ئەو خێزانانەی ئەو گەڕەکانە بوون، بۆیە یەکێك لە سیما سەرەکیو دیارەکانی چیرۆکەکانی شێرزاد حەسەن گەڕانەوەیە بۆ سەردەمی منداڵیو هەرزەیی، ئەو سەردەمانەی هیچ پێوەندییەکی بەهای پەروەردەیی لەناو خێزاندا ڕەچاو نەکراوەو، بنەمای پەروەردەکەش لەسەر ترسو شەرم بنیات نراوە. بۆ نموونە شێرزاد دەڵێت : " من لەخێزانێك گەورە بووم، کە هەموو سیفەتە ناشیرینەکانی کۆمەڵگەی کوردی هەڵگرتووە، خێزانێك کە بەڕێکەوتیش ڕێزو خۆشەویستیو سۆز نەدا بە منداڵەکانی"[(١٠)] . ژینگەی پڕ لە ترسو پەروەردەیەکی کلتووری بەشی ئەو پیاوەن " منداڵیەتیم جگە لە بێبەشیو سەرماو ترسو شەرمو دڵەڕاوکێ هیچی دیکە نەبوو منداڵیم بیر مەهێنەوە "[(١١)]. ترسو شەرمو شکانەوە لە هەرزەکاری درێژەی هەمان قۆناغی منداڵییە هەرزەکاری قۆناغێکی تازەی دیکەی ژیانە کە کۆمەڵێك گۆڕانکاری جەستەییو دەروونی دیکەن کە زیاتر لە ژینگەیەکی گونجاودا دروستی دەروونی پێکدێت کە پەروەردەیەکی ڕۆشنبیر باڵی بەسەر کۆمەڵدا کێشابێ.

باوك سەرچاوەی ترسە لە خێزانو، ڕاستەوخۆ پێوەندی بە هۆکاری دروستکردنی (ترس)ەوە هەیە، وەك ئەوەی لە چیرۆکی (عزرائیل)دا دەبیندرێت، کە باوك سەرچاوەیەکە لە نانەوەی شەڕو ئاژاوە بەتایبەتی لەو کاتانەی کە لە چایخانەو مەیخانەکانو قومارخانەکان دەگەڕایەوە داخو قەهری دەرەوەی لە منداڵەکانو ژنەکەی دەردەکرد " ڕۆژانی تەمەنمان.. شەوانمان پڕبوو لە نەعلەت، عومرێکی لەعنەتیمان بەسەر برد"(کۆچیرۆکەکان، ل٣٦٦). ئەو دیمەنە سامناکانەی شەڕو ئاژاوەکانی نێوان دایكو باوك وێنەیەکی زیندووە لە چیرۆکی (ترس)، هەمان شەڕو ئاژاوەو پیشەی باوکی پاڵەوانە، کە لەبەرچاوی منداڵەکان وەك باوکێکی دڵڕەق داخی خۆی هەڵدەڕێژێت " کە منداڵەکان پێکەوە لە پرمەی

گریانیـان دا و وەك جووجەڵـە لـە دەوری دایكیـان كۆبوونـەوە " (كۆچـیرۆكەكان، ل٣٦).

لەلایــەكی دیكــەش چــاندنی تــۆوی هەســتكردن بــە كــەمیو مامەڵەیــەكی ناهۆشیارانەی دایكو باوك، وەك دیاردەی میزكردنو خۆ پیسكردن لە منداڵێك هـەر لە قۆناغی زووەوە بووە بە گرێیەك لەو گرێ دەروونییانە، كە ترسی لەسەر بنیـات نـراوە، وەك لــە چــیرۆكی (مــنو قالــەو ســەگەكەی پــاڤلۆڤ)دا هــاتووە " ئــەو خۆپیسكردنە منی كوشت نەك هەر ئەوە.. سەدەها جار بـاوكو دایكـم لەبەرچـاوی ناسیاو و بێگانە جنێو بارانیان كـردووم... شـكاندوویانم"(كۆچـیرۆكەكان، ل١٥٧). یان لە هەمان چیرۆك لە گرمەی هەڵچوونی پاڵـەوان بـەردەوام وێنـە و دیمەنـەكانی سەردەمی منداڵی، وەكو یادێكی پڕ تاڵو ناخۆش دێتـەوە یـاد " ئـای كـە عـومری منداڵیم پڕ لە حەسرەت بوو... ئەو مێژووە ڕەشەم بیرناچێتەوە... ئێسـتا هەسـت بە لینجاوی ئەو تفـو بەڵغەمانە دەكەم كە باوكم نێو چاوانی منـی پـێ سـواغ دەدا "(كۆچـیرۆكەكان، ل١٥٨). بـاوك سەرچـاوەی یەكـەمی ترسـە لـەخێزان، لـەپاڵ ئەمەشـدا دایكـیش سەرچـاوەیەكی دیكـەی ترسـە لـەخێزان، بـەڵام بـە شـێوازو مامەڵەیــەكی جیــاوازتر لــە هــی بــاوك، دایــك لــە زۆربــەی چــیرۆكەكانی شــێرزاد سەرچـاوەی میهرەبـانیو سـۆزو خۆشەویسـتییە. ئـەوەی دایـك وەك (تـرس)ێـك دروستی دەكات سەرچاوەكەی نەزانینە، دایكێكـی كڵـۆڵو نەخوێنـدەوار ناتوانێـت لایـەنی دەروونـی منداڵـەكانی وا ڕەچـاو بكـات، كـە ئـەو قسـانەی بـۆ منداڵـەكانی دەیكات، تا چەند سوودو قازانجی هەیە، بۆیە كاتێك دایك باسی جنۆكەو عزرائیلو وا بكەو وا مەكە دەكات بۆ منداڵێك، كە هێشتا لە مانا شاراوەكان تێنەگەیشـتووە، هەموو ئەمانەی لەو چیرۆكانەدا بەرجەستە كـراون وێنـەو ئـامرازو هۆكـارو ڕەمـزی ترسن، وەك بگێڕەوە لە چیرۆكی (ترس) دا دەڵـێ: " لـە دایكـی بیسـتوویەتی كـە جنۆكە لـەوان بـەئاگاترن.. هـەر بـا نـەزانێ... هەترەشـی چـووبوو.. دڵـی خێراتـر كەوتە لێدان... ترس ژێر هەردوو پەردەی گوێی گـەرمتر كـرد.. هەناسـەی تـەنگتر كرد بینایی لێڵتر كرد"(كۆچیرۆكەكان، ل٣٥).

هەروەها لە چیرۆكی (عزرائیل )دا دایكی بەكوڕە منداڵەكـەی خـۆی دەڵـێ : "ڕۆڵە نەكەی لـەژێر لێفەكـە سـەر دەربێنـی... ئـەوەیان عزرائیلـە... هیلاكـی ڕۆح

کێشانی خەڵکەو شەو لێرەوە تێدەپەڕێ... هیچ دیوارو سەربانو بەربەستێك بۆ ئەوان نییە"(کۆچیرۆکەکان، ل٣٧١). وێنەی هەمان حاڵەت لە چیرۆکی (ئەو شەوەی سەگم تیا خۆشویست)دا هەیە " رۆڵە شیرینەکەم... بخەوە... هیچ نییە مەترسە...عزرائیله بۆ گیان کێشان دێتە خوارێ... لێفەکە ڕاکێشەو خۆت بشارەوە... ئەم سەگە بینیوێتی... تەنیا بێزمانەکان دەیبینن... بۆیە لوورەی ئاسمانی وا تەنیوە... خۆت بشارەوە کوڕم !"(کۆچیرۆکەکان، ل١٤).

گەڕەکێك پڕبێت لە باوکی دڵڕەقو بێبەشبوون لە سۆزو خۆشەویستیو پەروەردەیەکی لە خۆوەیی، یان کۆمەڵێك لە بابەتو مەسەلە هەستیارەکان مامەڵەیەکی پەروەردەی ڕێکوپێکیان بۆ نەکراوە، زۆر جاریش بوونە بە گرێی دەروونیو، سەرچاوەی ترس وەك مەسەلەی پەروەردەی (زایندەیی) سێکسی. د. نیل لە کتێبی (پەروەردەکردنی منداڵانی ئازادو سەربەخۆ)دا لەو کۆمەڵە ئەزموونانەی خۆی [١٢] لە پەروەردەی جنسی ئەگەر بە شێوەیەکی ڕێكو دروست ئەو مەسەلەیە بەڕێوە نەچێت ئاکامێکی باشی نابێت، بۆیە (ترس) وەك خەسڵەتێکی زۆر تایبەتو دووبارەبووی چیرۆکەکانی شێرزاد حەسەنە، یەکێکە لە سەرچاوەکانی دیکەی ترس بە هەڵە تێگەیشتنو تێگەیاندنی مەسەلە سێکسییەکانە وەك شێرزاد دەڵێ : " ئێمە لەناو خێزانێکدا گەورە بووین کە فێریان کردین دایكو باوك وەکو دوو بوونەوەر بێ سێکسن"[١٣].

هەروەك کارێکتەری چیرۆکی (عزرائیل) باس لەو خورپەو ختوورەیەی کردووە، ئەو منداڵەی دەخەسێو، دواتر خۆی فێری ئەو نهێنییەی دایكو باوك دەبێ، کە باوكو دایك نایانەوێ باسی بکەن، لە لایەکی دیکەش مامۆستاو قوتابخانە، وەك دەزگایەکی کۆمەڵایەتی سەرچاوەیەکی دیکەی ترسن، ئەو ترسو توندو تیژییەی ماڵەوە لە قوتابخانەش هەمان درێژکراوەی ترسەو " دەیەها جار لە ترسی مامۆستاکەم.... میزم بەخۆمدا کردووە بە قاچو قولما دەهاتە خوارێ.. کە بۆ سەر کورسییەکەی خۆم دەگەڕامەوە.. پێڵاوەکەم... یا پۆتینە لاستیکەکەم فلقەی دەهات.. منداڵە چەتوونەکانی هاوڕێم پێدەکەنین منیش چی بکەم.... لەشەرمانا بە دڵو چاو دەگریام"(کۆچیرۆکەکان، ل٤٥). ئەو ڕووداوەی سەردەمی منداڵی پاڵەوان بیرەوەرییەکی تاڵەو، لە هەمان کاتیشدا مامۆستاو باوك

سەرچاوەی زیاترکردنی ترسەکەن‌و، پانتاییەکی نەستی لە منداڵدا دروست دەکەن. ئەو لایەنە نەستییەی، کە ئامادەیی بەشێکی زۆری یادەوەرییەکانی منداڵی کارێکتەرەکانی چیرۆکنووسن، وەك لە چیرۆکی (من‌و قالەو سەگەکەی پاڤلۆڤدا)دا دەڵێ : " گەر لە منداڵییەوە شەق‌و تفو جوێن‌و خوێن‌و دەردێکی زۆرت نەبینیوە گوێم لێ مەگرە.. ئای کە عەبەی توونچی فەلاقەی کردووم، منداڵانی لەخۆم گەورەترو بچووکتر تێیان هەڵداوم، ئای کە مامۆستاکان بە ڕاستەو حەیزەران پشتە دەستیان داغ کردووم، ئای کە تفی ئەم‌و ئەوم لەڕووی خۆمدا سڕیوەتەوە "(کۆچیرۆکەکان، ل١٥٣). مامۆستا عەلی لە چیرۆکی (من‌و قالەو سەگەکەی پاڤلۆڤ)دا کاتێ پرسیارێك لە فەرهادی پاڵەوان دەپرسێ بە نەشارەزاو نەزانینی وەڵامەکەی فەرهاد مامۆستا دەکەوێتە گیانی، ئەویش لە ترسی لێدان خۆی پیس دەکات، ئەمە گرێیەکی دەروونی بووە، پاڵەوان لە گوێی دەزرینگایەوە لەوکاتەی فەرهاد وەك پاڵەوانێك بەرەو ڕابردووی خۆی دەگەڕێتەوە، ترس لە سەرەتای منداڵییەوە دەبێتە بەشێك لە یادەوەرییەکانی فەرهاد، هەروەك لە یەکێك لە هەڵوێستەکانی مامۆستا بەرامبەری هاتووە :

مامۆستا دەڵێت : " "وەرە دەرێ کەر باب منداڵی ساوایت "

دامە پڕمەی گریان....

" وەرە دەرێ کەر باب.... ئێرە ئاودەستخانەیە ؟"

نەجووڵام... هەر بەقیژە ڕایکێشام‌و بەربووە جەستەم"(کۆچیرۆکەکان، ل١٥٧).

پاڵەوانی (من‌و قالەو سەگەکەی پاڤلۆڤ)، کە ناوی فەرهادە ئەو گرێیەی ترس‌و شەرمیش بە دوو گرێی زۆر گەورە وەسف دەکات " ئەمن دوو نەخۆشی زۆر کوشندە وەك شێرپەنجە ناخیان خواردووم، هەر لە منداڵییەوە سەرم دەخۆن، دوو مارەکانی سەر شانی زوحاك بە مێشکی گەنجان تێریان دەخواردو دەسرەوتن.. وەلێ من...؟ ئەم دوو نەخۆشییە مێشکی خۆم دەخۆن"(کۆچیرۆکەکان، ل١٥٣). هەستکردن بەگرێی ترس لە لای (کاوە)ی پاڵەوانی چیرۆکی (ترس)، کە ترسی تاقیکردنەوەو شەڕی ڕابردووی نێوان دایك‌و باوکی‌و جنێوەکانی ئەوان هەموو ئەو شتانەی لێ بووە بە ترس، هەر لە ویزەویزی

با و شریقەی هەورو چرپەی بەر دەرگاو باران. خولیابوونی دەروونزانی لای (فەرهاد) لە چیرۆکی ( منو قالەو سەگەکەی پاڤلۆڤ ) هەر زوو هەستکردن بووە بەو ترسە نا ئاساییەی، کە زۆرجار باڵی بەسەر ژیانو بیرەوەرییەکانیدا کێشاوە، ئەویش هەمان ڕاستی دووبارە دەکاتەوە " هەر لەبەر پیرۆزی و گەورەیی و ترسی ئەو دوو گرێیە چوومە بەشی دەروونزانی"(کۆچیرۆکەکان، ل١٥٣). ترس کاریگەریی خۆی نواندووە بەسەر کەسێتی پاڵەوانەکانی چیرۆکەکانی شێرزاد، کە (ترس) مانەوەی خۆی لە دەروونی مرۆڤدا هەیە، بۆیە شەیدابوون بە نووسینەکانی دەروونزانیو ئەو نووسەرانەی، کە ڕەهەندی دەروونیی قووڵیان هەیە، وەکو (لۆرانس) و (چیخۆف)و (ولیەم جیمس)....هتد جۆرە وشیارییەکی کاریگەر دەردەخەن لەمەڕ لایەنە نەگەتیڤەکانی ترس لەلایەکو، لەلایکی دیکە ئاشنابوون بە بوونی ترس، وەك دیاردەو نەخۆشی لەناو پانتایی ئەدەبیات بوونی هەیە، کە کاری ئەدەبیاتە قسەی لەسەر بکات " (هیتشکۆك)یش گەر بەمنداڵی نەترسایە لەدوای خۆی پەنجا فیلمی ترسناکی بەجێ نەدەهێشت... ئای (کافکا)ی نەگبەت......؟ ئەو شەوە ساردەی کە تۆفانو باران خەریك بوو کاول بکا باوکی دەری دەکرد....کافکا شەوێك لەناو تاریکیو باران مایەوەو ترسا... گریا...نووسینەکانی پڕبوون لە ترسو تاوان"(کۆچیرۆکەکان، ل١٥٧). ئەمە نموونەیەکە لە زیرەکیو شارەزایی چیرۆکنووس بۆ دەوڵەمەندکردنو دەرخستنی لایەنی ترس، کەوا سوودی لەو چیرۆکنووسو هونەرمەندانە وەرگرتووە بۆ زیاتر خستنەڕووی کاریگەریی ترسەکانی ڕابردوو، بەتایبەتی سەردەمی منداڵی جارێکی دیکە لەسەر زاری پاڵەوانەکانو کەسانی نێو چیرۆك دەیانخاتە ڕوو.

(فەرهاد)ی پاڵەوان لە چیرۆکی (منو قالەو سەگەکەی پاڤلۆڤ) کاریگەریی بۆچوونە تیۆرییەکانی (فرۆیدو پاڤلۆڤ)ی لەناو ئەو چیرۆکەدا تواندۆتەوەو بۆ شیکردنەوەی سەرچاوەی ئەو ترسو شەرمە وای لە پاڵەوان کردووە بە دوای گرێ دەروونییەکانی خۆیدا بگەڕێت. سەرەتای خولیابوون بە فرۆید، کە لە سەرەتای چیرۆکەکەدا باسی دەکات سەرچاوەی ترس لەسەر کەسێتی مرۆڤ بۆ نەستو سەردەمانی ڕابردوو دەگەڕێتەوە گرێ دەروونییەکانی خۆی لە بۆچوونەکانی فرۆیدا دۆزیوەتەوە، " دەیان گرێو دەردی دەروونی سەردەمی منداڵیی خۆمم لە

فرۆیـددا دۆزیبـۆوه"(کۆچـیرۆکەکان، ل١٤٨). بۆیـه سـەنگو قورسـایی چـیرۆکەکه سـەرەتا بـەلای فرۆیـددا دەشـکێتەوه، بـەڵام دواتـر چـیرۆکنووس بـەرەو لای تیۆرەکەی پاڤلۆڤ دەیشـکێنێتەوه، ئـەویش بـەهۆی پـێڵاوی سەرخۆشـەکەی سـەر ژووری فەرهاد لەناو ئووتێلەکه کە زۆر بە دەنگی پێڵاو جووڵه و هەڵسـوکەوتەکانی سەرخۆش ڕاهاتبوو تـا شـەوێك دەنگـی پێڵاوەکـەی گـوێ لـێ نابێـتو خـەوی لـێ دەزڕێتو ناخەوێ، لەوێوەوه نووسەر بە دەستی ئەنقەست دەیەوێ فەرهاد بـەلای پاڤلۆڤ بشکێنێتەوەو، گرۆکەی لە فرۆید بباتەوه، ئەمەش بە پێی بیردۆزەی پاڤلۆڤ لە ئەنجامی ڕاهێنانو ڕاهێنـانی دەروونـی دەتـوانرێ کەسـێتییەکی دیکـه دروسـت بکرێت لە خودی ئەو کەسێتییەدا. نووسەر لـە گۆشـەنیگای خـۆی دەیـەوێت ئـەوه بسەلمێنێت، کە ماڵو گەڕەكو قوتابخانـەو بـاوكو مامۆسـتا، دەوروبـەرو کـەلتوور بەرهەمهێنەری ترسن. ئەو ترسەی کە لە منداڵییەوه گوێچکەو دەروونی پـێ ئاشـنا دەکرێتو، درێژبوونەوەیەکه تا کەسێتییەکی تەواو لـە ڕووی بـایۆلۆژیو دەروونـی کاریگەری خۆی هەر دەبێت لەسەر خودی کەسێتییەکه.

ئەو ترسەی کە شێرزاد لە چەندین چیرۆکدا باسی دەکـات، لەگـەڵ هاتنـەوه یادی بیرەوەرییەکان سەرچاوەی لەدەستدانی خۆشـییەکانه، هـەر وەکـو پاڵـەوانی چیرۆکی (لەو دیو دەرگا ئاسنینەکەوه) خراوەته ڕوو، کەوا پاڵـەوان دەیـەوێ بچـێ بۆ لای ئەو کچه دەوڵەمەندەی کە سەردەمانێك یارو دۆستی بووەو دواتر بێباکانـه شووی کردووه، پاڵەوانیش دەیەوێ دوای چەند گۆڕانێك لە هەستکردن بە کەسێتی خـۆی، هـەوڵی دەربڕینـی بێبـاکی خـۆی دەدات بـۆ کچـه دەوڵەمەندەکـه کـە ئـەم کوڕەکەی جاران نییەو، بە جۆرە زمانو گوڕو تینێکەوه لەبەر دەرگا ئاسنینەکەوه دەوەستێتو دەیەوێت دەست بە زەنگەکەوه بنێـت، بـەڵام ئـەو بیرەوەرییـه تـاڵو ترسانەی بیر دەکەوێتەوه ئەویش ترسی سـەردەمی منـداڵین، بۆیـه لـه حاڵـەتێکی خۆشی تووشی ساردبوونەوه دەبێتو، ئـەو گـڕو تینـه بێباکییـەی خـۆی نـامێنێ. هەروەها لە چیرۆکی (ئەو شەوەی سەگم تیـا خۆشویسـت) باسـی دەنگـی سـەگو بیرهاتنەوەی ڕووداوه ترسو تاڵەکانی سەردەمی منداڵی کە لەسەر سەگ بەشـێکی دیکەی ترسو تێهەڵدانی دیکـەن، لـە سـەردەمی منـداڵیو هـەرزەیی لـە ڕووداوێك لەسەر سەگ تێی هەڵدراوه، بە بیستنی دەنگی سەگو دیتنی بەشێك لـە خۆشـیو

خەو شادییەکانی دەبات، وەك پاڵەوان خۆی لە شرۆڤەی ئەو هەڵوێستەیدا دەڵێت: " تـا ئـەم شـەویش چـەندە دڵ پـڕ لـە کینـە بـووم ... ئـەم دوژمنایەتییـەش بـۆ سـەردەمی منـداڵیم دەگەڕێتـەوە"(کۆچـیرۆکەکان، ل١٤). بابـەتی تـرس بـوونێکی بەرفراوانو پانتاییەکی زۆری چیرۆکەکانی شـێرزادەو، تـرس لـە بـاوكو تـرس لـە مامۆستاو قوتابخانەو مەسەلە سێکسییەکانو، ترس لە سەگو بارانو با و مەرگو ترس لە خۆشەویستی... هتد بابەت گەلێکن شـێرزاد بـە دیـدو گۆشـەنیگای خـۆی لەژێر ڕۆشنایی نووسەران و بیردۆزەکـانی فرۆیـدو پـاڤلۆڤ شـرۆڤەی کـردوون، وەك ڕەهەنـدێکی قـووڵی دەروونـی پانتـایی چـیرۆکەکانی گرتـوون زیـاتریش بەسـتراون بەڕابردووەکانی سەردەمی منداڵیو هەرزەکاری، ئەمـەش وێنەیـەکی دووبـارەبووی نەستینو، بەردەوام کاریگەرییان لە هەڵسوکەوتو خۆشـییەکانو بیرکردنەوەکانـدا هەیە.

**تەوەرەی دووەم : باری شەرم**

شـــەرم، وەك دیاردەیـــەکی دەروونـــی زۆرجـــار دەبێتـــە گـــرێو کۆســـپێکی دەروونیی توند، کە تاك ناتوانێ بە ئاسـانی لێـی دەربـاز ببـێو، وەك دیاردەیـەکی ترسناك دەرگای خۆشییەکان دادەخات و، مرۆڤ دەخاتـە حاڵـەتێکی گۆشـەگیریو دوورە پەرێزی، زیاتر لە تێکەڵاوبوونو چوونە ناو خەڵكو هەستکردن بە شەرم ڕوو دەدات " شەرم لەڕووی دەروونییەوە شێوەیەکە لەشـێوەکانی تـرس"([٤]). تـرسو شەرم، وەك دوو دیاردەی ترسـناك زیـاتر پابەنـدن بـە نـاخی کەسـەکە، ئەگـەر لـە حاڵەتی نائاساییبوونی خۆیان لایان دا. ترس لە حاڵەتی تـەنیاییو بـێ تێکـەڵبوون زۆر جـار ڕوو دەکاتـە مـرۆڤ، بـەڵام شـەرم لەگـەڵ هەڵسـوکەوتکردنو تێکـەڵبوونو قسەکردن لەگەڵ کەسانی چوار دەوری خۆی شەرم ڕووی تـێ دەکـات، هەرچـەندە ئـەم دیاردەیـەش لـە هۆکارەکـانی دروسـتبووندا چ لـە قۆناغـەکانی دروسـتبوونو شێوەکانی دروستبووندا زۆر لەیەك نزیکنو، کاریگەریشـیان لـە داهـاتووی منـداڵو هەرزەکار بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ دەردەکـەوێت، چـونکە شـەرم چ منداڵ چ هەرزەکار هەستی پێدەکاتو کۆمەڵێ هۆکاریش لەپشت ئـەو هەسـتکردنە بوونی هەیە کە لەحاڵەتی ئاسایی خۆی تێپەڕی دەکات لەگەڵ هەسـتکردنی منـداڵ

یان هەرزەکار بە شەرم " ئەو جۆرە هـەرزەکارو منداڵانـە لـە ئـەنجامی شـەرمەوە لەناو کۆمەڵ‌و قەڵەباڵغیدا هەست بە دڵـەڕاوکێ‌و تـرس‌و ناخۆشـی دەکـەن نـاتوانن خۆیان لەگەڵیان بسازێنن "(١٥). لەگـەڵ ئەوەشـدا خـەیاڵ‌و زینـدە خـەون بـە هـەل دەزانن‌و، پەنای بۆ دەبەن بـۆ رزگـاربوون لـە نـاو کۆمـەڵ کـە سەرچـاوەی تـرس‌و دڵەڕاوکێیەکە بووە(١٦). پەروەردەی ماڵ‌و خێزان گـرنگترین هۆکـاری دروسـتبوونی شەرمە لای منداڵ، بەتایبەتی پەروەردەی سەرکوتکەر و توندو تیـژی پۆلیسـییانە دوور لە ڕەچاوکردنی لایەنی دەروونی. کاتێك منـداڵێك یـان هـەرزەکارێك خـۆی لـە حاڵـەتێکی ئاسـایی ڕۆیشـتن‌و چـوونە نـاو کـۆڕو کۆبوونەوەکانـدا بـە شـێوەیەکی ئاسـایی مامەڵـە دەکـاتو، هـیچ لـە گۆڕانـە فسـیۆلۆجییەکان‌و هەڵچـوونێك لـە ڕوخساری دیار نابێت، بە پێچـەوانەوە منـداڵ یـان هـەرزەکارێکی شـەرمن لـەکاتی ڕۆیشتن‌و بەشداریکردن لە کـۆڕو کۆمەڵـەکان‌و سـەردان‌و چـوونە سـینەماو شـوێنە گشـتییەکان، وا هەسـت دەکـات هـەموو خـەڵکی چـاوی تـێ دەبـڕن‌و چـاویان لـە هەنگاوەکانی ئەوە، ئیتر گۆڕانەکانی دەموچـاو هـەر لـە سـوور هەڵگـەڕان‌و تـرس‌و تەتەڵەی زمان‌و ڕۆیشتنی نائاسایی بەدەردەکەوێت. لە گرینگترین ئـەو هۆکارانـەی ناوەکی‌و دەرەکی، کە کار لە یەکتر دەکەن گرفتی دەروونی شەرم دروست دەکەن لەوانە پشتگوێ خسـتن‌و سـووکایەتی‌و ڕیسـواکردن‌و گـەورەکردنی هەڵـەکانی، لـە لایەکی دیکەش دانانی بەربەست‌و ڕێگر لەبـەردەم منـداڵ لەگـەڵ منـداڵانی دیکـەی کۆمەڵدا بەبیانووی پاراسـتنی ڕەوشـت‌و بـەهاکان(١٧). هـەموو ئەمانـە سەرچـاوەی دروستبوونی شەرمن، بەرهەمهێنانی ترس‌و دڵەڕاوکێشـن. بـەپێی لـێ توێژینـەوەی دەروونزانی دەرکەوتووە، کە " شـەرم لـە تەمـەنی (٢–٦) سـاڵیدا بەسـتراوەتەوە بەترس و، لە (٦–٩) ساڵیدا شەرم بریتییە لەترس لەبەرامبەر کەسانی غەریب‌و، لە تەمەنی (٩–١٢) ساڵی دژایەتی دەرەکـی نـامێنێ، بـەڵکو هەسـت بـە ڕێزگـرتن لـە بەرامبەر جنسی دیکە سەر هەڵدەدات "(١٨).

ئەو قۆناغە هەستیارەی کە منـداڵ‌و هـەرزەکار پێیـدا تێپـەڕ دەبـن قۆناغێکـە پێویستی بە ژینگەو خێزانێکی هـێمن‌و ئـارام‌و پشـوو درێـژ هەیـە، بـۆ دەرچـوونی منداڵەکانیان وەك لایەنێکی دروستی دەروونی، هەرچەندە شـەرم چ لەمنـداڵ چ لـە هەرزەکاردا تا ڕادەیەك سروشتی ئاساییبوون هەیەو، ئەوەی لە منداڵدا هەیـە وەك

دیتنی یەکەم جاری میوان گۆڕانە فسیۆلۆجییەکانی هەرزەکار وەك لە باڵغبوونی تا ڕادەیەکی ئاسایی بوونی هەیە، ئەویش ئەرکی پەروەردەی خێزانو کۆمەڵە لە منداڵ و هەرزەکار بەشێوەی ئاساییو، بە ئاستی بیرکردنەوەی ئەوان تێیان بگەیەنن. بە شێوەیەکی گشتی شەرم لە منداڵ بریتییە لە لۆمەکردنی ڕەوشت، چونکە حاڵەتێکی سۆزداریو هەڵچوونی ئاڵۆزە کە هەستکردنە بە کەمی دیارترین باری شەرم تێکەڵاوبوونی خەڵکە، شەرم دەکات پرسیار بکات ناتوانێ تەعبیر لە بیرو بۆچوونەکانی بکاتو، واز لە مافی خۆی دەهێنێ لە شەرمان وێکدێتو گۆشەگیر دەبێو یاری ناکات کە فاکتەرێکی پێویستە بۆ گەشەی سۆزداریو فیکری"[19].

بابەتی شەرم لە چیرۆکەکانی شێرزاد حەسەن بوونی هەیە، بە هەمان شێوەی ترس وەك دوو گرێی گەورەی سەردەمی منداڵین، ئەو شەرمەی باوك هۆکاری یەکەمی دروستکردنییەتی، چونکە شەرم وەك شێوەیەکی دیکە دەبێتە تارمایی منداڵ یان هەرزەکارو، ئەو سووکایەتیو تێهەڵدانەی باوك، وەك لە چیرۆکی (زەلکاو) و (دڵە) لە گەرمەی لێدانو ڕێ پێگرتنی منداڵەکان قسەیەکی باوکی خۆی بیر دەکەوێتەوە " زلحیز... کە سەیری ناوچاوت دەکەم... سەر شۆڕ مەکە"(کۆچیرۆکەکان، ل٢٥٤). ئەو شەرمەی کە گرێیەکی دیکەی زۆربەی ئەو پاڵەوانانەی چیرۆکەکانی شێرزاد حەسەنن، کە ئەمەش هەمان ئاستو ژیانی ڕاستەقینەی ئەو گەڕەكو قوتابخانەو ماڵو ژینگەیەیە، کە دەروازەیەکە بۆ چوونە ناو شەرم بەخشینی سیماکانی شەرمە بە تاکەکانی کۆمەڵ، کە بەستراوە بە قۆناغەکانی منداڵی هەر بۆیە باوەڕی چیرۆکنووس وایە: "منداڵی بۆ نووسەر کانگای سەرچەم داهێنانەکانیەتی "[20].

شێرزاد چ بێ ئاگاو چ بە ئاگا، وەك لایەنێکی نەستیی تاك گەڕاوەتەوە سەردەمی منداڵیو، دەردە شەرمەکانی وەك هۆکارو ئەنجامو کاریگەری، لە زۆربەی چیرۆکەکان بە دێرێکیش بێ لە ڕووداوەکانی نێو چیرۆکە هونەرییەکان ئاماژەی پێداوە. ڕووداوەکانی ترس لە دوورکەوتنەوە لە سێکسو مامەڵەکانی مامۆستای قوتابخانەو هەموو ئەمانە ئامرازەکانی بەرهەمهێنەری شەرمە لە هەموو شتەکانو، باوك بە هەمان شێوەی ترس بەرهەمهێنەری شەرمە بۆ منداڵەکانو،

دایکیش خۆی ملکەچو شەرمنە، بۆیە خۆشی منداڵێکی ترسنۆكو شەرمن دەخولقێنێ، چونکە ئەمە باوەڕی چیرۆکنووسە وەك خۆی دەڵێ: " دیارە یەکەمین پاڵەپەستۆی ئەو چەوسانەوەیە لە خێزانی کوردیدا دایك دەگرێتەوە، هەر ئەو زاتەیە، کە کوڕو کچەکانی لەسەر ترسو شەرم ملکەچی پەروەردە دەکات"[٢١]. ئەو ترسەی لە منداڵی شەرم دەیخولقێنێ، هەمان ئەو شەرمەش درێژکراوەی سەردەمی هەرزەییە، کە شەرم قاوغێکی دیکە وەردەگرێت، ئەویش دەستەوەستانبوون بوو لە ئاست خۆشەویستی شکست خواردنو شەرمکردن لە خۆشویستن، ئەو گرێیە دەروونییەی چیرۆکنووس کە لەڕێی نووسینەوە گوزارشتی لێ کردووەو خۆی پێ بەتاڵ دەکات، بۆیە هەروەك چۆن (دەیڤید دیچیز و جۆن ستالۆردی) لە نووسینێکیاندا بە ناوی (ڕۆمانی سەدەی بیستەم) لە بارەی کاردانەوەی ڕابردوو لە زەیندا دەڵێن: " ڕابردوو هەمیشە لە یەکێك لە ڕووبەرەکانی زیهنی ئێمەدا ئامادەیەو، هەمیشە کاریگەری لەسەر کاردانەوە ڕاستەقینەکانمان بەجێ دەهێڵێ"[٢٢]. لە چیرۆکی (منو قالەو سەگەکەی پاڤلۆڤ)دا پاڵەوان باسی خۆشویستنی کچە خاڵەکەی خۆی دەکات، کە دوای چلو چوار نامە نووسینو دڕاندن فەرهادی شاکەسە نەیوێراوە پێی بڵێ خۆشم دەوێی، بەڵکو بەپێچەوانەوە پاڵەوان خۆی دەڵێ : " ئەمن بە دزییەوە... لە ژێرەوە خۆشم دەویست، ئەو نەیدەزانی، هەرخۆم بە تەنیا بۆی دەسووتام"(کۆچەیرۆکەکان، ل١٥٤). ئەمە وێنەیەکی ڕوونی چەپاندنەو، ڕەنگدانەوەی باری سایکۆلۆژی ژیانی ڕابردوویەتی بەر لە گەیشتن بەو قۆناغە، کە کەسێتییەکی شەرمنە بنەمای ترس ئەو هەستەی لا دروست کردووە، چونکە فەرهادی پاڵەوان ڕماندنی کێوێك بەلایەوە ئاسانتر بوو لەوەی بە ئافرەتێك بڵێ خۆشم دەوێیت. پاڵەوانی چیرۆکی (منو قالەو سەگەکەی پاڤلۆڤ) نموونەی ئەو پاڵەوانە شەرمنانەی چیرۆکەکانی شێرزادە، کە بەهەموو خەسڵەتەکانی شەرمەوە خراوەتە ڕوو بە ئەندازەی گرێیەکی دەروونی " ئەوەندە شەرمن و بەستەزمان بووم نە دەچوومە ناو پاسیش نەبادا خەڵك سەیرم بکەن"(کۆچەیرۆکەکان، ل١٥٥)، چونکە پاڵەوان کە هەست بەخۆی دەکات وا دەزانێت خەڵك سەیری دەکەنو لێی ورد دەبنەوەو، گاڵتەی پێدەکەن، (فەرهاد)یش نموونەی ئەو پاڵەوانە شەرمنەی سەردەمی هەرزەییو منداڵییە، تا

ئەو ئاستەی کە خۆی هۆکارەکانی شەرمو سیماکانی شەرمی نیشان داوە لەڕێی (مەنۆلۆژ) " کە میوان دەهات خۆم دەشاردەوە.... دەمزانی ئارەقەی زۆر دەکەمو سوور هەڵدەگەڕێم، لە شەرمانا، نانم بۆ نەدەخورا "(کۆچیرۆکەکان، ل١٥٥). یان لە چیرۆکی (عیزرائیل)دا لەبەر نەبوونی سیستەمێکی جوانو هەماهەنگی خۆشەویستیو پەروەردەی نێوان دایكو منداڵەکان نێوان باوكو منداڵەکان، شەرم کۆمەڵێك لە دیاردەی سروشتی مرۆڤ لێی دەبوون بە شەرم و عەیبەی گەورە، وەك پاڵەوان خۆی دەڵێ: " هەموو شەوێك دەرپێی پیسو زەردەکانی خۆمم لێت دەشاردەوە..سمێڵم گووگرەو...دەنگم گڕ کەچی هەر نەم هێشت " (کۆچیرۆکەکان، ل٢٧٠). هەروەها هەمان ئەو ڕووداوە لە چیرۆکی (منو قالەو سەگەکەی پاڤلۆڤ)دا هەیە، وەك دەڵێ : " هەمیشە دەرپێیەکانم لەدایکم دەشاردەوە، دەترسام ئەو پەڵە زەردو نەعلەتییانە ببینێ) (کۆچیرۆکەکان، ل١٥٥). گرێی هەستکردن بەکەمی لەلای پاڵەوانی (منو قالەو سەگەکەی پاڤلۆڤ) دەرەنجامی شەرمێکە کە هەر لە زووەوە لە کەلتوورو پەروەردەی خێزانیدا پیادە کراوە.

بەشێك لە پاڵەوانەکانی شێرزاد لەژێر کاریگەریی نووسەرانو هونەرمەندان، ئەمەش هەماهەنگیو دیاریکردنی سەرچاوەکانی ترسو دیدی تایبەتی بۆ پێناسەکردنی ترس لای نووسەران جۆرە کاریگەربوونێکە بۆ هێنانە کایەی دیدێکی تازە لە بارەی شەرم، چونکە شەرم لە چیرۆکەکانی شێرزاددا گرێیەکی دەروونییەو کاریگەری بەسەر کەسێتی پێگەیشتووش هەیەو، وێنەی پاڵەوانێکی شەرمن لە (منو قالەو سەگەکەی پاڤلۆڤ)، کە دەچێتە بەشی دەروونزانی زیاتر دۆزینەوەی خەمو ترسو شەرمەکانیەتی، بۆیە دەروونزانی ڕێگایەکە بۆ خۆدەربازکردن لە شەرمو لاسەنگبوونی تەرازووی بەراوردی نێوان تیۆرەکانی فرۆیدو پاڤلۆڤەو سەرکەوتنی کەسێتییە بەسەر دیاردەیەکی شەرم، وەکو دەردێك، کە مرۆڤ دەتوانێت لە ئەنجامی ڕاهێنانی خۆی لە ئازارەکانی دەردە شەرم ڕزگار بکات، لەگەڵ ئەوەش ڕەخسانی هەر هەلومەرجێکی تازە بۆ ڕزگاربوون لە شەرمو مانەوەی جۆرێك لە شەرمنۆکی ڕەنگدانەوەی خۆی هەر دەبێت، وەك لە چیرۆکی (لۆزان) کە پاڵەوانێکە لە دەرەوەی کلتوور دوور لە

سانسۆر دەژیت، لە هەمان کاتیش بگێڕەوە وەسفی پاڵەوان دەکات " لەبەرچاوی حەشاماتێك کاوەی شەرمنۆك بە لۆزان دەنووسا " (کۆچیڕۆکەکان، ل٢٢٧). کەواتە شەرمی ڕابردوو شەرمی کەلتوور تارماییەکی رۆحی ئادەمیزادەکانە، هەروەها لە چیرۆکی (کەڵە کوڕانو ئاسکە کچان)دا وێنەیەکی دیکەی شەرم هەیە، بۆ نموونە هەڵبژاردنی تابلۆی (کەڵە ئاسکان) لەلایەن کوڕانو تابلۆی (کەڵە کێوی) لەلایەن کچان کە هەوەسێکی شەرمنانەیە شەرمی تێکەڵبوونو دوورکەوتنەوەی کوڕانو کچان دیدێکی دووربینیو قووڵی نووسەرە، لە بەرهەمهێنانی شەرمو درێژبوونەوەی ئەو بەرهەمهێنانە، کە کوڕو کچێکی گەنج ناتوانێ دەری ببڕێو، ئەو شتانەی کە لە ناخیاندا پەنگی خواردووەو ناتوانن هەستی خۆشەویستیو حەزو ئارەزووەکانیان دەرببڕن. هەرزەکاری شەرمن لە چیرۆکی (گوڵی ڕەش )و (منو قالەو سەگەکەی پاڤلۆڤ)و (لەودیو دەرگا ئاسنینەکەوە) نموونەی پاڵەوانی شەرمنن لەئاست سۆزو پێوەندی خۆشەویستی، کە ناتوانن گوزارشت لە حەزە شاراوەکانی ناخیان بکەنو، شەرمو شەرمکردن دەبێتە بەشێك لە شتە شاراوەکانی ناخو پاڵەوان لەناخی خۆیدا هەستی پێ دەکات، کە ئەو شەرمە دەبێتە ڕێگر لە بەرامبەر گوزارشتکردنو دەربڕینی هەستو خۆشەویستی بەرامبەر بە کچو، سەرەنجام ئەو ڕێگرییەو نەتوانینی دەربڕینی شتەکانی ناخی خۆی حەمەی پاڵەوانی (گوڵی ڕەش) دەکەوێتە دڵەڕاوکێو وەك عاشقێکی دۆڕاو دەردەکەوێت.

هەروەها فەرهاد لە (منو قالەو سەگەکەی پاڤلۆڤ) دەکەوێتە حاڵەتی خەمو ناخۆشی بە تایبەتی لەو کاتەی کە کچە مێرد دەکات، ئەو نەیتوانیوە ئەو هەستەی خۆی بۆ دەربڕێت. ئەو چیرۆکانەی شێرزاد حەسەن پڕن لە عاشقی شکستە باڵ ناڵاندنیانە بەدەستی ترسو شەرم. چۆن شەرم بەدیاردەیەکی ئاسایی وەسف بکرێت؟ کە بووبێتە سیمایەك یان ڕەوشتێکی نائاساییو سەیر، کە لە هەڵسوکەوتێکی ئاسایی ڕۆژانەی کەسێك ڕەنگ بداتەوە بەشێوەیەکی وا کە نەتوانێ لەگەڵ خەڵکیدا بە شێوەیەکی ئاسایی ڕۆژانە هەڵسوکەوت بکات. هەموو ئەو سیمایانەش بۆ سەلماندنی بوونی ئەو ڕاستییانەش لە ڕەوشتی پاڵەوانێکی وەکو فەرهاددا لە چیرۆکی (منو قالەو سەگەکەی پاڤلۆڤ) دا دەردەکەوێت

"ئەوەندە شەرمن‌و بەستەزمان بووم نەدەچوومە ناو پاسیش، نەبا خەڵکی سەیرم بکەن وام هەست دەکرد هەموویان لەمن ورد دەبنەوە لە ژێرەوە سکیان پێ دەسووتێم یان پێم پێدەکەنن" (کۆچیرۆکەکان، ل١٥٤–١٥٥).

**تەوەرەی سێیەم : دڵەڕاوکێ**

دڵەڕاوکێ (القلق) بارێکی ناخۆشی دەروونییە، تاك بەرەو ڕێگایەکی پەرێشانی‌و دڵتەنگی دەبات‌و، مرۆڤ تووشی ئازارو دڵتەنگی دەکات لە گۆڕانە فسیۆلۆجی‌و دەروونییەکان‌و، سیماو ڕەوشتی مرۆڤ بەشێوەیەکی نائاسایی لەباری دڵەڕاوکێ دەردەکەوێت، هەرچەندە دڵەڕاوکێی ئاسایی تا ئاستێك بێ کاریگەرییە لەسەر تاك، لەگەڵ ئەوەش دڵەڕاوکێ " لەهەموو جۆرەکانی نەخۆشی دەروونیدا ڕەگەزێکی هاوبەشەو هەستکردنێکی درێژخایەنە بە ئارامی‌و ترس‌و تۆقینی دوورە وەخت"[٢٣]. دڵەڕاوکێ ڕەگێکی قووڵ‌و هاوبەشی هەیە لەگەڵ ترس، چونکە " دیاردەو خاسیەتەکانی دڵەڕاوکێ زۆر نزیکن لە دیاردەو خاسیەتەکانی ترس‌و لە زۆر لایەنەوە لەیەك دەچن، تەنیا جیاوازیی سەرەکی لە نێوان ترس‌و دڵەڕاوکێدا ئەوەیە، کە ترس سەرچاوەو هۆکارەکانی زانراوە"[٢٤]. هەروەها ئالۆزیی قووڵی دڵەڕاوکێ وەك بارێکی دەروونی " بەکاکڵەکەی هەموو جۆرەکانی نەخۆشییەکانی دەروونی دادەنرێ "[٢٥].

فرۆید لەو باوەڕەدایە دڵەڕاوکێ " ڕەتکردنەوەی حاڵەتی ترسە بە دوو شێوە خۆی دەنوێنێ، یەکەمیان دڵەڕاوکێی بابەتی کە ڕەتکردنەوەی ترسی ئاشکرای دەرەوەیە، دووەمیان دڵەڕاوکێی (دەمارگیری)یە، کە ڕەتکردنەوەوی ترسی ناوەوەیە یاخود غەریزەیە "[٢٦]. دڵەڕاوکێی دەمارگرژی ترسێکی ڕاستەقینەیە، وەکو پەرچە کردارێکە بەرامبەر غەریزەکانی ناوەوە، واتە دڵەڕاوکێ بەلای فرۆیدەوە ئەنجامی " خەفەو کپکردنی ئارەزووە سێکسی‌و دەستدرێژییەکانەوە دروست دەبێت، کە منداڵ ناتوانێت تێریان بکات لەبەر ئەوەی دژ بە داب‌و نەریت‌و یاسا کۆمەڵایەتییەکانە "[٢٧].

ترسی خەساندن ئەو ترسەیە، کە فرۆید بە ترسی ڕاستەقینەی ناوەوەی دەزانێت‌و " دڵەڕاوکێ لەخودی ئەو هێزەوەیە کە چەپاندن دروستی دەکات،

کەواتە دڵەڕاوکێ چەپاندن دەسازێنێ "[٢٨]، ئەمەش دەبێتە ترسێکی ناوەوە هەستکردن بەوەش (مـن/ الانـا) ئاگـادار دەکرێتـەوە، کـەوا خەریکـە ڕووداوە کپبووەکـانی بـواری نەسـتی دەگەڕێنـەوەو، (مـن) دەبـێ فریـای خـۆی بکـەوێو لەلایەکی دیکەش (منی باڵا– الانا العلیا) مەترسی دابونەریت ڕوو لە (مـن) دەکـات کـە دووبـارە هـەوڵی خەفـەکردنو دوورخسـتنەوەی ئـەو تـرسو حـەزو ئـارەزووە کپکراوانە بدات بۆ نەست[٢٩]، سەرەنجام ترسێکی ناوەکی دروست دەکات، کە لـە جـۆری دووەمـی دڵـەڕاوکێی نەخۆشـییە هەسـت پێنـەکراوەو، گۆڕانـە فسـیۆلۆجییەکانو دەروونییـەکان لـەو ململانـێ دەروونییـەدا ڕوودەدەن، وەکـو دیـاردەی دڵـەڕاوکێ هـەر لـە ( دڵـە خـورپێ، خـەو لێ زڕانو، سـوور هەڵگـەڕان، وشکبوونی دەموچاو، هەستکردن بەبێزاریو ماندووبوونێکی زۆر... هتد ).

(دڵەڕاوکێ) وەك بابەتێکی هەڵچوونی دەروونـی نزیکبوونـەوەی بەشـێك لـە کارەکتـەرەکانی پاڵـەوانی چـیرۆکەکانی شـێرزاد حەسـەن، درێـژکراوەی ترسـێکی نادیارەو سەرچاوەکەی نازانرێت. پاڵەوانی چیرۆکی (ترس)، کە (کاوە)ی نـاوە لـە ژووری ماڵەکەیان شەوێك لەو شەوانەی ترسێك لە ناخی کاوە چـەقی گرتـووە، کـە ترسێکی ناوەوەیەو وەك بابەتێکی ناوەوە ڕوو دەکاتـە کۆئەنـدامی دەروونـی، کـە خۆی ئامادە بکاتو ڕووبەڕووی ئەو دڵەڕاوکێیە ببێتەوە بێ ئـەوەی هـیچ ترسـێکی ئامـادەکراو لـە ئـارادابێ ". کـاوە تونـد پەنجەرەکـەی داخسـت... بـە ترسـەوەش دەرگاکـەی کلیـل دا... هـەموو کـونو کەلەبـەرە زۆرەکـانی ئـەو ژوورەی گـرت "(کۆچیرۆکەکان، ل٣١).

ئەو ترسەی ناخەوەی پاڵەوان هەڵسووڕێنەری هەڵسوکەوتەکانی (کاوە)یەو، دڵەڕاوکێکەی کاوە هـیچ بـەرەنجامی بەردەسـتی نییـە جگـە لـەو شـوێنەی " ئـەو ژوورەی هەر لە منداڵییەوە تا ئەم نیوە شەوە درەنگە... هەزارەها مۆمی خۆزگەو ئاواتی تیا کوژاونەتەوە "(کۆچیرۆکەکان، ل٣١). ئەو ژوورەی خۆزگـەو حـەزەکانی تیا کوژراوە، وێنەی چرکەیەکی دەروونی دڵەڕاوکێن سەرچاوەی ئەو دڵەڕاوکێیە لە نەستەوە هەڵدەقوڵێو، لە بواری هەستیدا نییە تا هۆیەکی بەرجەستەکراو هـەبێت بۆ ململانێی دەروونی. ئەو دڵەڕاوکێو ڕاڕایەش لای کاوەی مێـر منـداڵ بەشـێك لـە یـادەوەری کێشـەو ئازارەکـانی نـاو خێزانـەو هۆکـاری جـووڵانی ئـەو ململانـێ

دەروونییەیە " لەبەر ئەوەی سەرچاوەی زۆربەیان بۆ قۆناغی منداڵیو کێشەو گرفتەکانی ئەو کاتە دەگەڕێتەوە لەوانە "بێبەشبوون لە سۆزو خۆشەویستیی دایکو باوکو کەسانی نزیك، پەیوەندی خراپی نێوان دایکو باوکو منداڵ، کپکردنو خەفەکردنی زۆر لە حەز و ئارەزووەکان....هتد" "[30].

وێنەی شەڕو ئاژاوەی نێوان دایکو باوکی لە خودی چیرۆکی (ترس) بوونی هەیەو، بەشێکە لە یادەوەری (کاوە)ی پاڵەوان. هەموو ئەمانەش دەبنە بەشێکی ئەمبارکراوی نەست، کە ڕۆڵیان هەیە لە ورووژاندنی ئەو دڵەڕاوکێیە. لەپاڵ ئەمەش زیادبوونی دڵەڕاوکێ لە پاڵەوانی چیرۆکی (ترس) پەیوەستە بە چرپە ئاساییو نائاساییەکانی دەرەوە لە زیادکردنی دڵەڕاوکێکە " هەر چرپەیەکی ئاساییو نائاسایی دنیای دەرەوەی ژوورەکە دەیخاتە سەر دڵەکوتێو کسپە لە جەرگیەوە دێنێ "(کۆچیرۆکەکان، ل31) هاوڕێك بوونی ترسی ناخو ترسی دەرەوە جۆرێکن لەو ترسانەی دڵەڕاوکێ دەخولقێنن، چونکە ترسی ناخەوە ئەو دڵەڕاوکێیەیە کە وێنەیەکی دووبارەبووی دڵەڕاوکێی نائاساییە بەپێچەوانەی دڵەڕاوکێی ئاسایی.

جۆرێکی دی لە دڵەڕاوکێ کە سەرچاوەی لە گومانەوە دروست دەبێت، ئەو گومانەی وێنەیەکی دروستبووی کۆمەڵە، کە دڵەڕاوکێ بەرهەم دەهێنێ دیاردەی دڵەڕاوکێ پەیوەستە بەباری نەستی کارەکتەرەکەو لەناو کۆمەڵدا سەرچاوەی گرتووە. کارەکتەری چیرۆکی (گرێ)و ئەو مەلا کوێرەی کە بە کۆڵێك لە گومانو دوودڵی دەژی لەو کاتەی ژنەکەی لە ژانی منداڵبوونە ترسی لەدایکبوونو مردنی منداڵەکەو خیانەتی مەنیجی مامانو ژنەکەی بەشێکی ئەو گومانانەی (مەلا کوێر)ن، کە دەیخەنە باری دڵەڕاوکێو خەیاڵی گومانکردنەوە " نا... ناخەوی مەنیج نیازی چی هەیە ؟ دەیەوێ لەم چاوەڕوانییە بێ بەشت بکا... پێویستە چاوەڕوان بیت.... نە مەنیج جێی متمانەیەو نە ژنەکەت "(کۆچیرۆکەکان، ل61) هەروەها مەلا کوێر دەڵێ: " دەشێ ئەو دەڵەمەیەی ناو منداڵدانی دایکیشی ببەن... ئەم شەو دارو بەرد... وێنەی سەردیوار... مەنیجی مامان... ژنەکەت... پشیلە ڕەشە... ببنە شەوارەو منداڵەکەت بمرێنن... دەیبەن... دوور دوور دەیبەن... بۆ دوورگەیەکی پڕ لە نهێنی ئەم جیهانە "(کۆچیرۆکەکان، ل55).

بـوونی دڵـەڕاوکێ لای ئـەمینی پاڵـەوان لـە چـیرۆکی (مـیم)و مـەلا کـوێر لـە چیرۆکی (گرێ) سەرچاوەکەی کۆمەڵە مرۆڤێکی ماندوو لـە ژیـان دەخەنـە حاڵـەتی دڵەڕاوکێ کە دەوروبەر لێیان تێناگات، چـونکە مـەلا کـوێر هـەموو ئـەو هەڵچـوونو شڵەژانانەی لە ئـەنجامی ئاگادارکردنەوەیـەکی ترسـناکە لەبـەر ئـەوەی دەسـەڵاتی بەسەر بینینی ڕاستییەکانی دەرەوە ناشکێت، چونکە نابینێ لـە سـایەی کەسـانی چواردەوری خۆی تووشی گێرەشێوێنیو دڵەڕاوکێ دەبێت، کە لەڕاستیدا ئەوان لـە هزرو بیرکردنەوەیاندا کوێرن بەرامبەر بە مەلا کوێر بەهەمان شـێوەش لای خـەڵکی بەدبینو ئیفلیج ئەمینی پاڵەوان دەخەنە باری دڵەڕاکێوە.

### تەوەرەی چوارەم : خەمۆکی

ئـەدەبو هونـەر لەگـەڵ کێشـەو بابەتـەکانی ژیانـدا هەماهـەنگن و، تاکـە ڕاسـتییێکی بـەجێماوە کـە هـەتا بـەردەوامی کێشـەکانی ژیـان بوونیـان هـەبێ ئـەدەبیاتو، هونـەریش بوونیـان دەبـێ، خـەمۆکیش یەکێکـە لـەو بابەتانـەی کـە پێوەندییەکی زۆری لەگەڵ ئەدەب و هونەردا هەیە. ڕەنگە بەشێك بێ لە ئەزموونی ژیانی نووسەران خۆیانو هۆکاری خۆ ڕزگارکردنیش " پەیوەندییەکانی خـەمۆکیو هونەر لە هەندێ بیردۆزەی ئەفراندندا ڕۆڵی خۆیان دەبینن"[31]. هەروەها خەمۆکی " بریتییـە لـە خـەمێکی تونـدو بـێ نـەواییو دوودڵـیو تەنگـە نەفەسـی، ئەمـەش حاڵەتێکە هەندێ جـار ئـەنجامی باشـی لـێ دەکەوێتـەوە وەك بەرهـەمی ئـەدەبیو فیکری"[32]، بە پێچەوانەشەوە هەندێ جار دەبێتە جۆرێك لەخۆگرتنو پـەنا بردنـە بەر هۆکاری دیکە، وەکو مەی خواردنەوەو مادە بێهۆشکەرەکان کە ئەمەش زیانو شـڵەژانی زیـاتری بەدواوەیـە جـاری واش هەیـە دەبێتـە ڕێگـە خۆشـکەرێك بـەرەو مەرگ. خەمۆکی وەك نەخۆشییەکی دەروونی تووشی گەلێك کەس دەبێتو، کەمتر خـەڵك لەدەسـت ئـەم نەخۆشـییە ڕزگاریـان دەبـێ بەهـەموو چـینو توێژەکانـەوە. جـۆری خـەمۆکی لـە کەسـێکەوە بـۆ کەسـێکی دیکـە جیـاوازەو، " زۆرتـرین ئـەو کەسانە تووشی دەبن کـە هەسـتی خۆیـان لـە دەروونیانـدا خەفـە دەکـەنو دەری نـابڕن و، زۆریـان ڕوو دەکەنـە هەنـدێ کـار بـۆ دوور خسـتنەوەی ئـەو هەسـتە خەمۆکییـە وەك بەرهـەمی وێـژەییو بـیری هونـەری"[33] . (کەتـەر)و (فـاربرۆ) بـۆ

یەکەم جار ڕاپۆرتێکیان لەسەر هونەری خۆکوشتن نووسی، ئەوان هەوڵی ئەوەیان دا کە وای دابنێن، ئەوانەی بیری خۆکوشتنیان هەیە کەمتر خۆیان دەکوژن، ئەگەر ئەو بیرە خۆکوژییە لە بەرهەمەکانیان ڕەنگ بداتەوە، بەپێچەوانەی ئەمەش ئەگەر بیری خۆکوشتن لە بەرهەمەکانیان کەمتر ڕەنگی دایەوە یان بەکاریان نەهێنا زیاترە[٣٤].

لە چیرۆکی (تەنیایی شەوێکی باران) پاڵەوانێکی تەنیاو پڕ لە دەردو کەسەر لەو کاتەی سەردانی بەغدا دەکات ئەو شوێنەی، کە چوار ساڵی پڕ لە مەینەتیو هەژاریو خەمەکانی لە ماوەی خوێندنیدا لەوێیدا بردۆتە سەر هاوکات بوونی خەمەکانی ڕابردوو ئێستا بەشێکی ئەو خەمۆکییە، کە کاریگەری خۆی دەبێت بەسەر نووسینی شیعرو مەیخواردنەوە، چونکە شەوێکی تەنیاو شوێنە یادەوەرییە کۆنەکانی پڕە لە ڕۆژانی برسیو هەژاریو کڵۆڵی هەموو ئەو خەمانە هەماهەنگ دەبن لەگەڵ داهێنان یەکێك لەو هۆکارانەی خەمۆکی بریتییە لە "خەفەت خواردن بۆ ڕابردوو زۆر بیرکردنەوە لە ڕووداوەکانی ڕابردوو ئازارو ژانەکان"[٣٥]، وەك لە چیرۆکەکەدا هاتووە " ئەم شەو دەچمەوە ئوتێلە ساردەکەم.... ئاگری زۆپایەك نابێ... بەدیار ئاگرە زەردەکەیەوە خەمێکی زەردتر بخۆم... مەگەر ئاگری جگەرە گەرمم بکاتەوە... من لەزەتی ئافرەتێك لە جگەرەیەك دەکەم.. یادی ساڵانی کۆن نەبوایە.. ئەم ئوتێلە پەرپووتە جێی من نییە.. ژوورەکەش گەرم بێ.. دڵم هەر ساردە.... لەوەتەی خۆم ناسیوە دڵم ئاگردانێکە هەر دادەگیرسێو دەکوژێتەوە.... هەر دادەگیرسێو دەکوژێتەوە.... ئێستا ئاگردانێکی پڕ خۆڵەمێشە... دونیای خەیاڵمو دەروونم ئەوەندە ساردو سایەقەیە.... ئەگەر لە ئاسمانی هیچ وڵاتێ بەفر نەبارێ..... بێشك بەسەر وێرانەی دڵی منە کلۆکلۆ دەبارێ "(کۆچیرۆکەکان، ل٧٤). نەبوونی خۆشەویستیو تەنیایی لە شوێنێکی غەریبیو یادی تفتو تاڵی ڕۆژانی ڕابردوو بەشێکی دیکەی ئەو خەمۆکییەی کارەکتەری چیرۆکی (تەنیایی شەوێکی باران)ە " دوا کەسیش خۆمم.... بەنێو تاریکیو بێدەنگیدا مل دەنێم... وەك وڵاتێکی ژێر تەم کەوتوو... دەکەومە ناو خەمێکی بێ سەرو شوێن... ئەو خەمەی، کە تەنیا خۆشەویستی ڕاوی دەنێو بەس ئەوش نیمە !" (کۆچیرۆکەکان، ل٧٥). لە

چیرۆکی ( گوڵی ڕەش) وێنەی حەمەی پاڵەوان لە رووی چینایەتییەوە بنەماڵەیەکی هەژارن، ئەو کچەی کە ناوی (هێرۆ)یە دڵداری (حەمە)یە. لە (گوڵی ڕەش) پاڵەوانێکی بێبەشە لە سۆزو خۆشەویستی بەرامبەر بە (هێرۆ). دایکی حەمە هەر لە دوای تەمەنی منداڵی، وەك دیوارێکی ئەستوورو تەلبەند دادەنیٚو پایەکانی ترسو شەرم بیٚ " ئەوەندە بەرامبەری ئەو کچە مەوەستە.... ئاگام لێیە کە دەیبینیت ئەبڵەق دەبیت... ئەوەندەش مەچۆرە سەربانو بەردەرگا... شەرمو شکۆت لا نەماوە"(کۆچیرۆکەکان، ل١٠٤). بۆیە حەمە تەنیا دڵی بەو دیتنو ئەو خۆشەویستییە خۆشە، کە هێرۆ لە بەلەکۆنەیماڵیان دەیبینی لەو کاتەی گوڵە مۆرەکان ئاو دەداتو، حەمەش لەسەر بان سەیری دەکات (نەمانو وشکبوونی گوڵی مۆر) نەهاتنی (هێرۆ) حەمەی چاوەڕوان بەرەو بارێکی خەمۆکی دەڕوات کە سەرچاوەی هەژاریو جیاوازی چینایەتیو ترسو شەرم دواتریش لەدەستدانی یارو کەوتنە نێو بارێکی دەروونیو خۆزگە خواستنو ورێنە. نزیکەی پازدە جار پاڵەوانی چیرۆکی (گوڵی ڕەش) دەستەواژەی (دە دەرکەوە... پەنجەرەکە بکەوە) دووبارە دەکاتەوە، کە پەیوەستە بەخەمۆکیو دڵەڕاوکێکەی پاڵەوان.

پەنابردنی پاڵەوان بۆ چیرۆكو ئەدەب وەك خۆزگەیەكو سەرچاوەیەکە، بۆ گوزارشتکردنو ڕەواندنەوەی خەمۆکی "خۆزیا چیرۆکنووس دەبووم... ئەوسا دەتدی چ چیرۆکێکی جوانو غەمگینی ئەم وێنەیەم دەنووسییەوە... چیرۆکی ئەو گوڵە سیسو ژاکاوانە، تۆرانو دووریت، تاسەو سووتانو شەونخوونی هەفتەیەکم، خەمو ژانو حەژمەتی تەنیایی، برینی جودایی، ماتەمینی، بێزاریو مەستییەکی تاڵ... گریانو شتی تر حەزیشم دەکرد چیرۆکەکەم هەر بەناوی ئەو گوڵە مۆرە بووایە"(کۆچیرۆکەکان، ل٨٨). ئەو بارە دەروونییەو خەمۆکییەی، کە پاڵەوان تووشی دەبیٚ جۆرێك لە ورێنەو ئازاری دەروونی لە توانا جەستەییو دەروونییەکانی کەم دەکاتەوە"، بەڵام کەی لەتاو ئازارو خەمو دەردی خۆمو خەڵکی دەپرژێمە سەر ناوی گوڵو مەل، هۆگەلی زۆرن... باخچەکانیش وێران کرانو بوون بە شۆستەو شەقام، کران بە دەزگاو باڵەخانە، ئوتێلی دە نهۆمو بیست نهۆم، تێك درانو وێران کران... وەك ئەو دڵە کەلاوەی من بوون بە خاكو خۆڵی ژێر پێی ڕێبواران"(کۆچیرۆکەکان، ل٨٨).

کارەکتەری چیرۆکی (میم) کەسێتییەکی ڕۆشنبیرەو لە ململانێدا لەگەڵ دەوروبەرو ئەو کەسانەی بیر تەسکن‌و جیهان بینینیان بۆ ژیان کزەو پڕن لە هەڵەو ناشیرینیی ژیان، کە هەموویان بەدوای حەز و ئارەزووەکانیان دەگەڕێن، بەپێچەوانەوە ئەمینی پاڵەوان کەسێکە دڵی پڕە لە هیواو خەون پێچەوانەی ئەوانیش بیر دەکاتەوە، لەگەڵ ئەوەش کەسێکی ئیفلیجە لە هەمان کاتیش کەسایەتییەکی ڕۆشنبیرەو ئەوانەی بەرامبەری هەر لە ئەنوەری برای‌و برادەرانی دیکەی ئەنوەر، کە شەوانە دێنە لای‌و گاڵتە بە بیرکردنەوەی دەکەن، ئەوان لەئاست (ئەمین)دا ئیفلیجن هەرچەندە کتێب‌و خوێندنەوەو گفتوگۆکردن لەگەڵ نووسەران ڕەوانەوەی ئەو خەمانەی (ئەمین)ن، هەر لەدەستدانی ژن‌و تەڵاقدان‌و ژیان بەسەربردن لە ماڵی ئەنوەری برای تا ئەو تەنیاییەی، کە ئەمین بە تەنیا لەماڵ جێ دەمێنێ‌و دڵنەوایی دەکەن " من بە چیرۆکێکم سەدەها ڕێگەو تونێل‌و دەربەندم دەنێو زاتی مرۆڤ خۆش دەکرد... ئەوەتا بێ ترس‌و شەرم چیرۆکی خۆم‌و گوڵناز دەنووسمەوە" (کۆچیرۆکەکان، ل٢٠٦). بەشێك لە دڵنەوایی پاڵەوان ئەو نووسینانەن، کە خەو و ئازارەکانی بە چیرۆك دەردەبڕێ‌و تف لەوانەش دەکات، کە شتە جوانەکان ناشیرین دەکەن، لەگەڵ ئەوەش تەنیاو لەدەستدانی ئەو خۆشەویستی‌و ئەوینەی ژنەکەی‌و منداڵەکانی دەبێتە سەرچاوەی خەمۆکی "کاری ژینگە وەك کێشەی دارایی‌و خێزانی‌و ناکۆکی‌و دووبەرەکایەتی لە کاری ڕۆژانەدا لەگەڵ هاوڕێیاندا یان تووشبوونی کێشەیەکی بێ چارەسەر یان سەرنەکەوتن لە هێنانەدی ئامانجەکانی مرۆڤ "[٣٦].

وەك هۆکاری خەمۆکی " ئەوانەی تامی خۆشەویستییان نەکردبێ... حەز ناکەن کەس یەکدی خۆش بووێ، خەڵکانی نەگریس‌و دڵڕەش زۆرن، توانییان کەعبەی ئەوینی من بڕووخێنن، ئێستا تەنیام.... پیاوێکی بێوە مێرد، خۆم‌و ژوورێك‌و کۆمەڵێ کتێب، سەرینی تەنیایی، بۆن‌و ڕەنگ‌و تۆزی غەریبیم لێ نیشتووە، ریش ناتاشم "(کۆچیرۆکەکان، ل٢٠٩). هەروەها پاڵەوان لەبارەی خۆیەوە دەڵێت : " دوای هەفتەیەك ڕۆیشتن، تەنیاتر بووم... خۆم‌و کۆشکێکی چۆڵ... بۆنی ئەشکەوتێکی ترسناکی لێ دەهات، دە.دوازدە ژوور، جار جار پوورە خەجێ سواری عارەبانەکەی دەکردم‌و بە ژوورەکاندا دەگەڕام، مۆبەق،

ژووری میوان، ژووری نووستن سیسەمی نەرمی دوو کەسی... کە دەچوومە ئەو ژوورە ئاخم هەڵدەکێشاو دوو دڵۆپ فرمێسك لە چاوانم دەتکا، لەئاوێنە بازنەییەکەوە لە ڕوخساری خۆم ڕادەمام... لەوە دەچوو سەیری کابرایەکی نامۆو نەناسیاو بکەم.. بەسەر ڕوومەوە تۆزی مەرگو غەریبیم بینی"(کۆچیرۆکەکان، ل٢٢٧).

ماندووبوونو بێزاریو هیلاکی لایەنێکی دیکەی ئەو خەمۆکییەیە " لەتاو تەنیاییو... بیّ ئۆقرەی خۆمدا بە شەو و ڕۆژێك ڕۆمانێکم دەخوێندەوە... زۆرم نووسی مندالّی، هەرزەیی، ئێستام.. غوربەتو تەنیایی نێو گەرەکی خوا پێداوان... بەیانییەکیان لەخەو هەستامو تانەیەك... کتوپڕ تانەیەك نیشتبووە سەر چاوەکانم.. دونیایەکی تاریكو لێڵ، ئاخر لەو ماوەیەدا هیچ کەسێك لەو گەڕەکە سەری لیّ نەدام"(کۆچیرۆکەکان، ل٢٢٨). نامۆبوون بە گەڕەکی خوا پێداوان، کە تەنیاییەکان زیاتر دەکەنو ئازاری خەمۆکی قووڵتر دەکەن ئەو کاتەی پاڵەوان تەنیایەو باجی خەجێش دیار نییە " لەم گەڕەکە تێرەو لەبرسانا بمرم؟! سەیرە... زۆر جار لەسەر پارچە کاغەزەکان لەبرسیەتی دەدوام، لەناو کتێبەکاندا برسیەتیم دەخوێندەوە... بەلاّم ئێستا خۆم هەستی پێدەکەم... دەمار دەمار... ڕیشالّ ڕیشالّ... موو.. موو کوا با گویّ بگرم... ئەو ئەم نووزەیە چییە..؟ خیزەی سینگی خۆمە یان نووزەی سەگەکەیە"(کۆچیرۆکەکان، ل٢٢٩).

یەکێك لە سیماکانی خەمۆکی پەنا بردنەبەر مادە سڕکەرەکانو جگەرەیە، لە چیرۆکی (ئێوارەو شتی تر) بگێڕەوە لەوەسفی پاڵەواندا دەڵیّ : " بە حالّ لوولەیەکی باریکی دووکەڵەکەی بەڕەڵا دەکرد مات و نیگەران ڕووەو خۆری ئاوابووی دەم کەل دەیڕوانی... ماتییەك خەمێك، کە هیچ هۆیەکی بەرجەستەی نەبیّ خەمێك لەو خەمانەی کتوپڕ ئیفلیجت دەکا، هەرچوار دیوارو بن میچەکە دادەخزانو وێك دەهاتنەوە ڕووەو ئەو پنتەی ئەمی لیّ وەستابوو"(کۆچیرۆکەکان، ل٣٠٩).، ئەو پاڵەوانەی کە لە بارێکی خەمۆکیدا دەژی جۆرە تەنگەنەفەسیو دلّ تەنگییێکی وای تووش بووە، بەلایەوە بۆنی مەرگی لیّ دێت هەروەك دەڵیّ : "جگە لە کتێبەکانی هەموو شتێك بۆنی مەرگی لیّ دیّ... ڕەنگی غوربەت... وای هەست کرد گەر ئەم ژوورە جیّ نەهێڵیّ تۆزێکی دیکە دەخنکیّ"(کۆچیرۆکەکان، ل٣٠٩)..

ئەو پاڵەوانەی کە دڵی بەهیچ شتێك خۆش نییەو سیماو نیشانەکانی تەواوی خەمۆکی لە هەڵسوکەوتەکانی دیارە " نە لەم ژوورە دەحەسایەوەو نە دڵیشی بە پیاسەی ئێواران خۆشە "(کۆچیرۆکەکان، ل٣٠٩).. پاڵەوانی چیرۆکی (ئێوارەو شتی تر) بە پێچەوانەی بارە خەمۆکییەکانی دیکە لە پاڵەوانو چیرۆکەکانی دیکەی شێرزاد حەسەن، پەنا ناباتە بەر ئەدەبیاتو هونەر بۆ داهێنانو جۆرێك لە سووککردنی بارە دەروونییەکەی، بەڵکو زیاتر پەنا بۆ خواردنی جگەرە دەبات " پاشان خانمەکەم من گەر جگەرە نەسووتێنم دەبێ یان خۆم یان دونیا بسووتێنم... تۆ قەت ناتوانی بەئاسانی وەڵامی پرسیارێك بدەیتەوە..! کە دونیا بوو بە شێتخانە چاوەڕێی چ حیکمەتێك لە من دەکەی" (کۆچیرۆکەکان، ل٣١٠) هەرچەندە ئەو خەمۆکییەی پاڵەوان درێژەی هەیە بە تایبەتی لەدەمەو ئێواران " زۆرجار خەمۆکی ڕۆحی داگیر دەکا خاولیەکو لیفکەو سابوونێك دەخاتە نێو زەرفێكو لە گەرماوەکە چڵکی قەهرێك لە خۆی دەشواتەوەو تاوێك ئاسوودە دەبێت.. تەنیا تاوێك... هەموو ئێوارەیەکو خەمێکی تازە"(کۆچیرۆکەکان، ل٣١٠).. ئەگەرچی پەنابردنە بەر ئەدەبیاتو هونەر لای پاڵەوانی چیرۆکی (ئێوارەو شتی تر) لەئارادا نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پاڵەوان خەمۆکییەکەی نابێتە مایەی خۆکوشتن یان پەنا بردنە بەر مادە بێهۆشکەرەکان، بەڵکو سووتانو گریانی هەر بۆ دڵی خۆیەتی " تۆ بڵێی زیندانی ژیانی لا خۆشتر نەکات..؟ تا دەهات خەم پتر دڵی دەکوشی هێدی هێدی لەژێر لێفەکەوە هەنسکی دەدا... هەنسکی بێهوودەیی" (کۆچیرۆکەکان، ل٣١٠).. لە چیرۆکی (شاعیر) خەمی لەدەستدانی یار ئەو هەستەی کە شاعیرێك دەیدۆڕێنێ بۆیە شەیدابوونی شیعرو بیرەو جگەرە هۆکارگەلێکن بۆ خۆ ڕزگارکردن لە تەنیاییو خەمی لەدەستدانی یار، باوەشی یار بۆ کارەکتەری چیرۆکی (شاعیر) ئەو خەمانەی کە ڕەنگێکی دیکەو جۆرێکی دیکە بوون " ئەو کەسە چیمەن بوون...خەمیش ڕەنگێکی دیکەی هەبوو...لەو خەمە پەمەییانەی لە چاوانیا ڕەنگی دەدایەوە!"(کۆچیرۆکەکان، ل٧٧). بە یەکەوە دەبوون شیعرەکانی کارەکتەر بۆنی قژو تامی ماچ ڕەنگی چاوی چیمەنیان دەبەخشی، بەڵام ئێستا بۆنی تەنیاییو خەمو دابڕانو نامۆییە لەو ڕۆژەوەی چیمەن دەستی لێ بەرداوە شیعرێکی ئەو کارەساتەی بۆ نەهاتووە

(شاعیر) دەکەویتە حاڵەتێکی خەمۆکی "دەستێکی بۆ قەرەوێتەکەی برد... شلتری کردەوە... هەموو ئەو پردانەی ڕووخاند کە ئەمیان بۆ شاری پڕ لە یادو ترسو تاڵ دەبردەوە... هەزارەها نەفرەتی لەو حەزەش کرد... ڕایهێنا کە شەو نیوە شەو سەر بە بارەکاندا بکات... لەو ڕۆژەوە نەفسی کورت بووە... ڕۆمانێکی تەواو بۆ نەخوێندراوەتەوە...مانگێکە کۆتایی بە (بەرزاییەکانی وێزەرینگ) نەهێناوە... کەی وا تەمبەڵ بووە...؟ ئەوسا بە شەو و ڕۆژێك ڕۆمانێکی تەواو دەکرد... هەموو چیرۆکێکی ئەوینێك چیرۆکێکی خۆی بیر دەخاتەوە... ئەو پاپۆڕەشی نغرۆ کرد کە بۆ بەندەری داهاتووی نادیار هەڵی دەگرێ... ئێستا نەداهاتوو دەمێنێ نەڕابردوو" (کۆچیرۆکەکان، ل٧٧).

ئەو خەمۆکییەی بە لەدەست لێبەردانی یار وای لێ هاتووە پاڵەوان ڕوو لە دەشتاییو باوەشی سروشت بکات، تا شاعیرێك دڵەی خەمباری هێمن بکاتەوە، لەو کاتەی ناتوانێ شیعر بۆ ئەو هەڵوێستو ساتە بنووسێ ئەوسا پاڵەوان دەگەڕێتەوە سەر خوێندنەوەی ڕۆمانی (بەرزاییەکانی وێزەرینگ). تا بزانێ (هیسکیفلی) عاشقو شێت دوای مردنی (کاترین)ی دڵبەر چی بەسەر دێ، بۆیە لەگەڵ خوێندنەوەی ڕۆمان زیاتر کاریگەری دەبێو سەرچاوەی نەبوونی ئیلهامی شیعر بۆ (چیمەن)ی خۆشەویست دەگاتە ئەو ڕایەی، کە دەفتەرەکەی دەربهێنێ لەجیاتی شیعر دەنووسێ " ئەم عیشقەی من چەشتم... شایستەی شیعرێکی گەورە نەبوو... ئەگینا شیعرەکەی منی دەنووسی....! " (کۆچیرۆکەکان، ل٨٣).

### تەوەرەی پێنجەم: نامۆیی

نامۆیی دیاردەیەکی دەروونیی کۆنو هاوچەرخەو، کەم کەس هەیە لەم ڕۆژگارە بەدەست ئەم دیاردەیە نەتلابێتەوە، چونکە مرۆڤ زۆر جار لە ناوەوەی وڵات یان لە دەرەوەی وڵات تووشی ئەم حاڵەتە دەبێتو ئارامیی ژیانی لێ تێکدەداتو لەناخەوە هەست بەجۆرە ئازارێکی دەروونی دەکات. نامۆیی لەگەڵ ئەوەی ڕیشەیەکی قووڵی مێژوویی هەیە، یەکێکە لەو بابەتو مەسەلانەی کە جێی مشتمڕێکی زۆرەو " تەنیا لەبەر تەمومژی ماناکەی نا، بەڵکو بەهۆی ئەو فرە پێناسانەی کە بۆی کراوە "[٣٧]. نامۆیی لەو جۆرە پێناسانەداو دیدی جیاوازو

تێگەیشتنی جیاوازی بۆ کراوە لەڕوانگەی فەلسەفیو سیاسیو کۆمەڵایەتیو سایکۆلۆژی، کە لەوانەشدا ڕەگێکی سایکۆلۆژی هەیە، هەرچەندە لەڕووی سایکۆلۆژیش بەپێی ڕێبازو تیۆرە جیا جیاکان پێناسەی جیا جیای بۆ کراوە، بۆ نموونە فرۆید " نامۆبوونی مرۆڤ دەگەڕێنێتەوە بۆ ئەو کۆتو بەندەی کە لە پێوەرو یاسا کۆمەڵایەتییەکاندا دەردەکەوێتو لەسەر چالاکییە غەریزەییو بایەلۆژییەکانی مرۆڤ لەڕێگەی دامەزراوە کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیریو مادداییەکانی کۆمەڵەوە دەسەپێنرێ وەکو پێوەرێك نابێ مرۆڤ لێی لابدات، ئەم نامۆبوونەش هەر لە سەرەتای تەمەنی منداڵییەوە دەست پێدەکات"[٣٨]. نامۆبوون بەپێی ڕێبازی سلووکییەکان " یاخیبوون وەلامێکە بۆ چەند بزوێنەرێکی نامۆ بەستراکچەری نەتەوەییو مەزهەبیو ئینجا ئۆرگانە بچووکە کۆمەڵایەتییەکانی دیکەی کە بەیەکەوە ستراکچەری کەسێتی تاکێکی مرۆڤ دروست دەکەن "[٣٩]. هەروەها بەلای ئەریك فرۆم مرۆڤی نامۆ " پێوەندی لەگەڵ خودی خۆیدا بە هەمان شێوە پێوەندی لەگەڵ کەسێکی دیکەدا لەدەست دەدات "[٤٠].

نامۆیی پەیوەست نییە بە کەسانی پڕ لە بەهاو ئاکار لە کۆمەڵگا، بەڵکو کەسانی ڕاستو لاریش دەگرێتەوە. ئەوەی جێی سەرنجە، نامۆبوون لەگەڵ ئەو پێناسە جیاوازانەی کە بۆی کراوە، وەك دیاردەیەکی دەروونیو پەیوەست بە بارە کۆمەڵایەتییەکان کەسی نامۆ ناتوانێت دەستەمۆی ڕەوشتو ڕەفتارەکانی کۆمەڵ بێت. سەرەنجام لە زۆر لایەنی کۆمەڵایەتیو خۆگونجاندن نامۆ دەبێت " هەرچەندە نامۆیی گرفتی هەر سەردەمێکەو لە قۆناغە پێشکەوتووەکانیدا دەبێ بە هۆی سەرەکی زۆربەی نەخۆشییە کۆمەڵایەتیو دەروونییەکان "[٤١].

نامۆیی لە چیرۆکەکانی شێرزاد حەسەندا سیمایێکی دیارو بەرچاوی هەیە، وەك لایەنێکی دەروونیو کۆمەڵایەتی وێنەیەکی دووبارەبووی پاڵەوانەکانی ئەو چیرۆکانەن کە نمایندەی کەسانی هەژار لە ڕووی چینایەتیو کەسانی ڕۆشنبیرن لە ڕووی پلەو پایەی کۆمەڵایەتییەوە، کە دیدێکی جوانو پەیامێکی کۆمەڵایەتی بەرزو مەعریفەییبیان هەیە، ئەو پاڵەوانانەش وێنەی کەسانێکن لە هەموو ئەو توێژە جیاوازانەی کۆمەڵ کە دەیانەوێ بیر بکەنەوەو بوونی خۆیان لە خودی خۆیاندا بێتو نەچنە ژێر باری بیرکردنەوەی کەسانی چواردەوری خۆیان، ئەگەرچی

نەشیان توانیبێ کەسانی دیکەی کۆمەڵگا لەگەڵ خۆیان بگونجێننو بە پێچەوانەی پاڵەوانێك، کە تووشی گۆشەگیری و شکستێکی وا بێت، کە ناسنامەی بوونی کەسێتی خۆی لە دەست بدات، چونکە " ئەگەر ئەوان نەشتوانن واقیعی دەوروبەریان هەڵگەڕێننەوە سەر جیهانی واقیعی هزری خۆیان، ئەوا دوا جار جیهانێکی تایبەتو ژیانێکی دیکە بۆ خۆیان دروست دەکەن"(٤٢).

کارەکتەری چیرۆکی (شاعیر)، وەکو کەسێتییەکی هۆشیارو شاعیریشە لەگەڵ ڕووتێکردنی خەمو تەنیای حەزی پشتکردنی هەیە لە شار بەرەو دەشت ئەو دەیەوێ لە باوەشی سروشت خۆی ببینێو تەمی ئەو خەمەی لەدەستدانی یارە بڕەوێنێو خۆی لێ بە دوور بگرێ " سووکتر هەنگاوی دەنا... بێ وەستان... بە پەلە... دەیویست بۆ چەند ساتێکیش بێ لە ئاژاوەو ژاوەژاوی شار دوور کەوێتەوە"(کۆچیرۆکەکان، ل٧٧). ئەو شارەی بەهۆی زیادبوونی پێداویستیو نەگونجاو نەبوونی ئەو ژینگەیەی لە ئاست پێداویستییە ڕۆحییەکان جۆرێکە لە نامۆبوون لە شارستانییەت.

بەلای کارەکتەر ژینگەی شار درۆیەکی گەورەی شارستانیەتە "دوور کەوتنەوە لە شار یا زەلکاوی لیكو خوێن...؟ شار گەورەترین درۆی شارستانیەتە" (کۆچیرۆکەکان، ل٧٨). هەروەها دیسان پاڵەوانی چیرۆکی (شاعیر) لە بارەی ژینگەی شاردا دەڵێ: " شارستانیەت سفلسەو چارەسەری قوڕسە... ئەوەندە دوور کەوتەوە... بەپێوەش سەرتۆپی خانووە هەرە بەرزەکانو گومەزی زۆری منارەکان لەچاو ون بوون " (کۆچیرۆکەکان، ل٧٨). ژینگەی شار درۆیەکی گەورەیەو شاعیر نامۆیە بەو ژینگەیە، کە تێکەڵە لە ئاڵۆزی بە پێچەوانەی شار، دەشت ژینگەیەکی سروشتییە بەشێکە لە سەرچاوەی پاکییەتیو هەوێنی عەشقو پاکییەتییە، لەگەڵ ئەوەشدا شار شوێنگەی ئاڵۆزیو کێشەکانەو خەمی ڕابردوو یا تفتو تاڵەکانە، لەو ساتەی شاعیر لەنێو هێزە نەستییەکاندا دەژین لە دیاری تفتو تاڵی ناو شار لەلایەكو، لەلایەکی دیکە یادەوەری نەورۆزی پار لەگەڵ یارەکەی بەیەکەوە بوونیان سەرمەست بوون، بۆیە بەلایەوە سروشتی ئەوێ سروشتی ڕمانی ترسو شەرمە لەگەڵ حەزەکانی دڵدارەکان بەیەك دەگەن " ئەم دەشتە لە باوەشی پڕ لە میهری دایکی دەچێ...

ترس‌و بێ ئۆقرەیی ناهێڵێ" (کۆچیرۆکەکان، ل٨٠). نامۆبوون بە ژینگەی شار جۆرێکە لەو ئاژاوەو سانسۆرە لە چیرۆکی (تێك ئالان) دیسان بەراوردی نێوان سروشت‌و شارە. ئەو دوو عاشقەی، کە ڕاونراون لە شار بەدەر نراون لەژێر دارو باڵو کەرتە شاخەکان لە باوەشی سروشت بەیەك گەیشتوون، ئەو بووك‌و زاوایەی کە وەکو دوو کێوی ئاوێزانی یەکدی دەبن دوور لەشار دەژین ئەو شارەی کە ناتوانن لەباوەشی ئەودا یەکتریان خۆشبوێت " ئاخر ناتوانم لە شارێکی پڕ لە ڕق‌و قینە تۆم خۆش بوێ..." (کۆچیرۆکەکان، ل٣٠٦).

ئەو پێوەندییەی شار پڕە لە ئالۆزی‌و ژیانی کۆیلەتی کە دەرگاکانی خۆشەویستی دادەخات وەکو بەندیخانەیەك ناکرێ مومارەسەی خۆشەویستی تێدا بکرێت، لەنێو ئەو هەموو سانسۆر حەشاردان‌و خەفەکردنی سۆزو خۆشەویستییە " شار بە پێچەوانەی سروشتە ئەو زەمینەیە کە هەموو شتێکی تێدا دەشاردرێتەوەو حەشار دەدرێت، واتە گەوهەری شتەکان لەشاردا ئاشکرا نابن"[٤٣]. سروشتی شار وێنەیەکی ئالۆزو سەرچاوەی نامۆبوونی پاڵەوانە، نامۆبوونی تاك لەو ڕوانگە سایکۆلۆژییەوە " واتە دابڕانی تاك لە چێژە هاوسەنگەکانی خودی خۆی لەگەڵ پێداویستی‌و حەزو ئارەزووەکانی دەوروبەری"[٤٤]

جگە لە نامۆبوون لە شارستانیەت‌و ژینگەی شارو گەڕانەوە بۆ سروشت بەشێکی دیکەی نامۆیی‌و نامۆبوونی ئەو کارەکتەرانەن، کە ڕۆشنبیرن‌و جۆرە جیهانبینێکی بەرفراوانیان هەیە کەسانی ڕاستگۆن لە ئاست بیرکردنەوەکانیاندا ئەو کەسانەن، کە لە ململانێدان لەگەڵ دابونەریت‌و کەلتوورێکی نادروست، نامۆن بە کۆمەڵێك کەس‌و چینە کۆمەڵایەتی‌و عەقلی خێڵەکی‌و بیرکردنەوەی تەسك دیاردەی نامۆبوونە، وەك لە چیرۆکی (میم)و چیرۆکی (تابلۆیەکی ناتەواو) بەرهەمی بارودۆخێکی کۆمەڵایەتی‌و مەسەلە چینایەتییەکان‌و مەسەلە سیاسییەکانی ئەو ژینگەیەی کارەکتەرن.

هۆشیاری‌و ئاستی تێگەیشتنی (ئەمین)ی پاڵەوان لە چیرۆکی (میم) بەرامبەری کۆمەڵێك لە دەوڵەمەندانی شارو قۆنتەراتچی‌و ئەندازیار باسەکانیان، تەنیا پارەو ئافرەت‌و خواردنەوە بوو لەگەڵ ئەوەی بەرامبەر ئەمین دەکەوتنە

گفتوگۆو گاڵتە پێکردن بە (ئەمین)، کە باوەڕی بەپیتی (میم) نییە وەکو ژنەکەم، ماڵەکەم، خانووەکەم، هەستی بیرکردنەوەو داکۆکیکردن لەسەر ئافرەت کە سەرچاوەی زۆر شتی پاکو جوانە بەهایی ئەدەبیات بۆ پێکانی ڕاستی شتەکانو خوێندنەوەی بیرکردنەوەی ئەوان هەمیشە (ئەمین) بەرامبەریان ڕووبەڕوو دەبووەوە، بۆیە (ئەمین) زیاتر هەست بەتەنیایی دەکات " من تەنیا نیم... کە ئێوە دێنە ژوورەکە هەست بەتەنیاییو غەریبی دەکەم"(کۆچیرۆکەکان، ل٢٢١). گاڵتەکردن بە ئەمینو کتێبو ئەقڵ و بیرکردنەوەی، کە خۆی کەسێکی ئیفلیجە لەماڵی ( ئەمین)، بەڵام هزرو بیرکردنەوەی (ئەمین) زۆر جیا لەوان بیرکردنەوەی ئەوان جۆرێکە لە ئیفلیجی، کە هەموو بازرگانو قۆنتەراتچیو دەوڵەمەندو ئەندازیارەکان مامەڵەو پارە لەیەکتری نزیك کردوونەتەوە ئەنوەری برای هەمان هەستی هەیە، کە دەڵێ : " بۆ کەس ناناسن...؟ بەڵام ئەوان لەگەڵ کەسانی وەك خۆیان هەڵدەستنو دادەنیشن... چی لە شاعیرو ماعیر بکەن... ئەوان چ کەڵکێك لە تۆ دەبینن...؟ "(کۆچیرۆکەکان، ل٢٢٤). لێرەوە " تاك تووشی ونبوون دەبێتو هەست دەکات ناتوانێت بە شێوەیەکی دروست حەزەکانی خۆیو ئاواتو هیواکانی، وەکو خۆی دەیەوێت گوزارشتی لێوە بکات، ئەوان هەردەم لە دڵەڕاوکێو پەشۆکاوی دەژین هەست دەکات جێگای نابێتەوەو دنیای لێ تەنگ بووەو هەست بە سستی دەکات"[٤٥]. ئەو نامۆبوونە دەروونییە هەستکردنە بەوەی کە نە ئەمین باوەڕ بەوان پەیدا دەکاتو، نە ئەوانیش لە ئەمین تێدەگەن، ئیتر پاڵەوان ناتوانێ حەوسەڵەی ئەوەی ببێ لەگەڵیان بژی.

لە چیرۆکی (تابلۆیەکی ناتەواو ) هەردوو شاکەسی چیرۆك شێرۆ و ڕەهبەر لە وڵاتی (فینلەندا) (هلسنکی) دەژین شێرۆ، وەك بگێڕەوەی چیرۆك بە شێوازی (مەنۆلۆژ) لەگەڵ ڕەهبەر قسە دەکات کە هەردووکیان دوورە وڵاتنو، ئەوان بەوڵاتی خۆیان نامۆن لە وێ ناچار کراون ڕوو لە دەرەوە بکەن " دەگریان بۆ خاکێك کە زۆر زوو زۆر هەرزان فرۆشتیان، تۆ هەر هاوارت دەکرد ئەوان بوون خاوەنی ئێمەیان دۆڕان، تاماون، دەبێ بەر غەزەبی منو نەفرەتی هەتیوەکانو بێوەژنەکانی وڵات بکەون"(کۆچیرۆکەکان، ل٤٦٧). (کوردستان) وەك وڵاتێکی هەردوو پاڵەوان (ڕەهبەرو شێرۆ) ئەو خاکەیە، یان ئەو شوێنەیە کە بەردەوام

هـەردووکیان بـە عشـق‌و سـووتانی ڕاهـاتوون، ئەگەرچـی هـەردووکیان وان لـە (هلسنکی) بەڵام بە ڕۆحێکی شەکەت‌و ماندووان لـە کوردسـتان شـێرۆ لـە وەسـفی ڕەهبەردا دەڵێ : " هاوڕێی بێ ئۆقرەم.. لە کوردستان گێچەڵێك، شـەڕێك، دەمـە بۆڵەیەك هەبوایە تۆ لـەوێ خـەوت لـێ نەدەکـەوت" (کۆچـیرۆکەکان، ل٤٦٩). ئـەو باردۆخەی کوردستان وێنا کراوە لە چیرۆکی (تابلۆیەکی ناتەواو) وێنەیەکە پڕە لـە جـەنگ‌و پـڕە لـە حەسـرەت، کـە ئـەوانی نـامۆ کـردووە پـڕە لـە خـەونی دۆڕاو "سیاسەت بازەکان خەڵکیان فێرکرد کە تاماوین گەرەکە ڕقمان لـە یەکدی بـێ... تەواو سیاسەت... سیاسەت لێکدی کردین، سـەد سـاڵە دەجـەنگین‌و هەنووکـەش دەجەنگین " (کۆچیرۆکەکان، ل٤٦٩).

شاکەسی چیرۆکی (تابلۆیەکی ناتەواو) ڕەهبەرو شـێرۆ هـەردووکیان وێنـەی کەسانێکی ڕۆشنبیرن‌و ناتوانن لەگەڵ تفـەنگ‌و جـەنگ‌و سیاسـەتی چـەوت گـوزەر بکـەن، بۆیـە ئـەوان نـامۆن بـە ژینگـەی سیاسـی‌و ڕەهبـەر دەبێتـە گۆزەیـەکی درزبردوو، کە دواتر لە وڵاتێك دەشکێ کە وڵاتی غەریبییە‌و میدیای ژنی کە کچێکی فینلەندییە تاوانی شکانی گۆزەی دڵی ڕەهبەر بـۆ شـەڕو جـەنگی نێـوان خێڵـەکان دەگەڕێنێتەوە " دڵبەردانە نیشانەتان لە گۆزەی دڵی ڕەهبـەر گـرت‌و کردتـان بـە هەزار پارچە، ئەو بۆ وەستانی ئەو شەڕەی نێوان خێڵەکان، قەبیلە سەرمەستەکان بە تەپڵی شەڕ گۆزەی دڵی خستە سەر دەستان‌و هاتە ناوبژیتان" (کۆچیرۆکەکان، ل٤٧١). ڕەهبــەرو شـێرۆ هــەردووکیان پــەروەردەی ژینگەیــەکی کۆمەڵایــەتی‌و ژینگەیەکی سروشتی کوردستانن، هەر بۆیە سەهۆڵ بەندانی ئەوێ وەك ئەوە وایـە سەهۆڵ بەندانی نێو دڵیان بێ ڕەهبەر دەڵێ: "بیری شاخ دەکـەم میـدیا... شـاخ.. شاخ برا گەورەمانە... کاول بێ ئەم وڵاتەتان کە چیایەکی تیا نییە... ئاه.. میـدیا گیان.. ئەو زستانە من‌و ڕەهبـەر بـۆ هەشـت مـانگ سـەیری بـەفربارینمان کـرد... بەفرە ئەبارێ... بەفرە ئـەبارێ، لـە دەرەوە نـا، بـەڵکو هـەموو دەنێـو دڵـی مـن‌و ڕەهبــەردا دەبــارێ" (کۆچـیرۆکەکان، ل٤٧١). دڵــەڕاوکێی ئــەوان دڵــەڕاوکێی نیگـەرانی‌و مەرگـە ئـەو سـووتانە ڕۆحـەی ئـەوێ بـۆ دواجـار ڕەهبـەری لەوێـدا لـە (هلنسکی) کردە میوانی مەرگ.

شێرۆ وەك نامۆبوونێك بە ژینگەی ئەوێو ئەو ژینگەیەی پڕە لە ترسو دڵەڕاوکێو مەرگ" تف لەو زەمەنە وای کرد کوڕان بەجحێڵی باوەشی گەرمی دایکانیان جێهێڵن، بەر لە پەڕو باڵ دەرکردن ناچاریان کردین بەنێو ئاسمانەکانی مەنفا هەڵفڕین" (کۆچەیڕۆکەکان، ل٤٦٤). بەرامبەر ئەمەش وڵاتێك لە وڵاتی سەهۆڵبەندان هەمان نامۆبوون دووبارە دەبێتەوە بە جۆرێك ئەو کوڕانەی کوڕی یادەوەری نیشتمانو ڕابردوون، چونکە " مرۆڤ کە لە وڵاتەکەی نامۆبێ کە ئاوارە بوو بۆ شوێنێکی تر زیاتر تووشی نامۆیی دەبێ، سووتانی شاعیر سۆزو کڵپەی دەروونی وەکو کانییەك دەتەقێتەوە، نامۆبوونیش بارێکی دەروونی دەگرێتەوە"[٤٦]، بۆیە تەقینەوەی ئەو بارە دەروونییەش بیرخستنەوەی ڕۆژانی ڕابردوون " ساڵانێکی زۆر حەمەو بەرك هێشتا هەردوو تۆلاز بووین لە هەولێر تۆ کوڕێکی مەشرەف خۆشو نوکتەباز بوویت، ساڵان هاتنو ساڵان ڕۆیشتن، دواجار کە لە قوتبی باکور بەیەك گەیشتین: تۆ گۆڕابوویت هەرزوو هەستم کرد کە تۆ چەند تووڕەی" (کۆچیڕۆکەکان، ل٤٦٤). ناتوانن لەوێدا بخەون لەوێدا ئاسوودەبن لەوێدا غوربەتێك لەگەڵ ڕۆحیاندا دەژێیت کە بەربەستێکەو ناتوانێت بگوزەرێن (شێرۆ) وەك لە کۆتایی چیرۆکەکەدا جارێکی دیکە لە وڵاتی نیشتمانو دایك دەژێیت تارماییو دڵەڕاوکێی هەر هەیە " کێ نالێ... خوا نەکردەو گوێی شەیتان کوێربێ... کێ نالێ نابەڵەد دوژمنکارێك بەجوانیو ئەڤین نیشانە لەگۆزەی دڵەکەی منیش ناگرێتەوە کە دەمێکە درزی بردووە، لێرە پیاوە تفەنگ بەدەستەکان شێتی ئەوەن تەقە لە کۆترو کوکوختیو ڕەنگاڵەو هەر هەموو ئاوێنەو میناکانی دڵ بکەن" (کۆچیڕۆکەکان، ل٤٧٣). باوەڕی شێرۆو تێگەیشتنی لەپیاوانی وڵات کە جەنگ لە تارمایی ترسو ڕاوەدونان هیچی تر نییە " ئەوان سوێندیان خواردووە کە تا ماون دژ بە جوانی بجەنگن ... ئاخر کەی ناشیرین توانیویەتی جوان پەرست بێ؟ " (کۆچیڕۆکەکان، ل٤٧٣). نامۆیی پاڵەوانەکان قوربانی جۆرە سیاسەتێکی هەڵەو بارە ناهەموارەکانی دەستی سیاسەتن نامۆبوونی پاڵەوان لەلایەکی دیکە بە ژینگەی ئەوێ واتە دەرەوەی وڵات کە جۆرە نامۆبوونێکە لە حاڵەتی سووتانی ڕۆح بە کڵپەی نامۆیی بۆیە گەڕانەوە بۆ شوێنی دایكو باوەشی دووەمی دایك شاکەسی دیکەی چیرۆك ڕەهبەر هەمان حاڵەتی دەروونیو

گەڕانەوەی هەیەو بێزاری دەستی ژینگەی شارستانییەتە" هەر وایە... منیش لێرە ماندووم... بەدەست ڕاکە ڕاکەی گۆڕینی میترۆ ئۆتۆو شەمەندەفەرەوە تا هەنووکەش هاتوهاوارت وا لە گوێما دەزرنگێتەوە" (کۆچیرۆکەکان، ل٤٦٤).

جگە لە نامۆبوون لە وڵاتێکی سەهۆڵبەندان لە چیرۆکی (تابلۆیەکی ناتەواو) نامۆبوون بە ژینگەو گەڕەکێك کە پڕن لە پیاوانی بازرگانو قۆنتەراتچیو دەوڵەمەندانو پیاوانی (میم) دوای نەگەڕانەوەی (پوورە خەجێ)، کە دوای ڕۆیشتنی ئەنوەرو خێزانەکەی بۆ دەرەوەی وڵات ئەمین کە پێویستی بەکەسێك هەیە خزمەتی بکات لەوساتە دەروونییەدا دەژی، کە ترسو دڵەڕاوکێ تەنگی پێهەڵدەچنن زیاتر ئەو بارە نامۆیە لە ڕوویدا دەردەکەوێت، جگە لەوەی ئەو حەزی گەڕانەوەی هەیە بۆ گەڕەکی هەژارەکانو گەڕانەوە بۆ ئەو باوەشەی کە مرۆڤایەتیو هەستی بەزەییو ئاگابوونو تێگەیشتن لە برسیەتیو نەهامەتی لای ئەوان هەیەو ماوە، واتە بەشێکی دیکەی نامۆیی گەڕانەوەیە بۆ سروشتی لادێو گەڕەکە میللییە هەژارەکان " ئاخ بۆ ژیانێکی سادە لە کوێرە گوندێکی لای خۆمان کە بە هاوارێك هەموو ئاوایی لەخۆت کۆ دەکەیتەوە" (کۆچیرۆکەکان، ل٤٦٤). هەروەها لە چیرۆکی (میم) نامۆبوون بە گەڕەکە دەوڵەمەندو بازرگانەکان ئەو گەڕەکانەی بەلای کارەکتەر هیچ بەهایەکی مرۆڤایەتیو حەزی یارمەتیدانیان تێدا نابیندرێت ئەو گەڕەکانەی کە کەس بەمردنو لەدایکبوونی یەکتری نازانێ لەو کاتەی پاڵەوانی (میم) دڵی پڕە لە ئێشو ئازارو نزیكو لە هەڕەشەی مەرگو نوقمی تەنیایی وەك کەسێکی ئیفلیج بۆیە ئەوان کەس نابینن پاڵەوانی چیرۆکی میم بەو هۆشیارییەی خۆیەوە دەیەوێ بڵێ کەس لەو گەڕەكو ماڵانە تەنیاکان ناناسن پیاوانی ماندوو دڵ پڕ لە ئێشو ئازار ناناسن " کەس منی نەبینی من هەموو کەسم دەدی، جا کێ ڕوحێکی تەنیاو برینداری دەبینێ " (کۆچیرۆکەکان، ل٢٣١). چیرۆکنووس بەهۆی فەنتازیاوە هەستی مردووی کەسێك دەخاتە قسە ئەوانی گەڕەکە دەوڵەمەندەکان بە مردنێکیش نایەنە قسە " ڕۆژێکی تریش لەو کۆشکەدا مامەوە دواجار لە چاوەڕوانی بێزار بووم کەس دەنگی نەبوو... ڕەنگی نەبوو... خۆم تەرمی خۆم خستە سەرشانو ڕووەو دەرگای دەرەوە ملم نا، تەرمەکەم گەیشتە نێو کۆڵانو کەس نەیدی، من کە زیندوو بووم کەس سەیری

نەدەکردم، کەس نەی دەبینیم... ئێستا کە مردم کێ دەمبینی" (کۆچیرۆکەکان، ل٢٣١). بەرامبەر ئەمەش چیرۆکنووس لە سەر زاری پاڵەوان بەراوردێکی هەردوو گەڕەکی دەوڵەمەندەکانو گەڕەکی هەژارەکان دەکات کە پێشتر پاڵەوان لە گەڕەکی هەژارەکان ژیاوە" ئەم گەڕەکە زۆر کپو مەنگە، مەنگە، مەنگە وەك زۆنکاوە وەستاوەکان، ئەو زۆنکاوانەی نە ئاویان دێتە سەرو نە ئاویان لەبەر دەڕوا دیوارەکان زۆر سپینو دڵەکانیش زۆر ڕەش ئێرە دۆزەخێکی زۆر ڕەنگینە، ئێرە وەك ئەوێ نییە.. لەوێ ئاگامان لە چرپەو خشپەو هەناسەی یەکدیش هەبوو، گریانو پێکەنین، شاییو پرسە، بەشەڕ دەهاتینو زووش ئاشت دەبووینەوە، لە هەموو هەورازو نشێوێکدا دەستی یەکدیمان دەگرت جنێومان بەیەکدی دەداو یەکتریشمان ماچ دەکرد" (کۆچیرۆکەکان، ل٢٢٢).

## ئەنجام

١- چیرۆکەکانی شێرزاد حەسەن بەشێوەیەکی گشتی ئەو ڕەهەندە دەروونییە قووڵەیان تێدا هەیە، کە بە چیرۆکی دەروونی ناویان ببەین، چونکە پڕن لە هەڵچوونی دەروونی و خەسڵەتە دەروونییەکان. چیرۆکەکانی شێرزاد حەسەن ئاوێنەی ڕاستەقینەی بارە دەروونییەکانە، ئەو بارە دەروونییەی، کە پاڵەوانی فەرامۆشکراون، وەك لە چیرۆکی (ڕیشۆڵە و گرێ و شاعیر و میم و ڕەنگاڵە و.... هتد)دا بە دەردەکەون.

٢- دڵەڕاوکێو خەمۆکیو خەم جۆرێکە لە سیمای پاڵەوانەکانی شێرزاد حەسەن لەڕووی دەروونییەوە، هەروەها هەڵچوون و نامۆیی لە چیرۆکەکانی شێرزاد حەسەندا خەسڵەتێکی دیکەیە و سیماییێکی دیکەی بەشێك لەو پاڵەوانانەن، کە بە هۆی هۆکاری ئابووری و سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە پاڵەوانەکان تووشی بوون.

٣- پاڵەوانی چیرۆکەکانی شێرزاد حەسەن هەمە جۆرن لە ڕووی قۆناغەکانی تەمەن و پلەو پایەی کۆمەڵایەتییان، بۆ نموونە پاڵەوان هەیە، وەکو هەژارو ڕۆشنبیرو ئافرەتەو کەم ئەندامو...هتد. دەکرێ بڵێین هەندێ لە ڕەفتاری پاڵەوانەکانی ڕەنگدانەوەیەکی ڕاستەقینەن بۆ هەندێ ڕەفتاری ڕابردووی خۆی لە سەردەمی منداڵی و هەرزەکاری، بەمە دەقی چیرۆکەکانی تا ڕادەیەك دەبنە ئاوێنەی ڕاستەقینە بۆ بەرجەستەکردنی هەندێ لە بەسەرهاتەکانی خۆی.

٤- چیرۆکنووس سوودی لە شێوازەکانی شەپۆلی هۆش وەرگرتووە، وەك دەربڕینی ڕەهەندێکی دەروونی، هەروەها سوودی لە خۆدواندن و بەدوایەکداهاتن و پەنابردنە بەر خەون بۆ دەرخستن و پیشاندانی لایەنی نەستی وەرگرتووە. هەروەها لە چیرۆکەکانی شێرزاد حەسەندا فانتازیا سوودی لێ وەرگیراوە، وەك دیواربەندێکی شووشەیی بۆ پیشاندانی ئەو دیوی ڕاستییەکان و خستنەڕووی بارە دەروونییەکان.

٥- ئەو ڕەهەندە دەروونییەی چیرۆکەکانی شێرزاد حەسەن هەر لە ناونیشانی چیرۆکەکانەوە دەست پێدەکات، وەك لە چیرۆکەکانی (ترس، گرێ،

تەنیایی، نهێنی،  من و قاله و سەگەکەی پاڤلۆڤ... هتد ) هەموو ئەمانە لایەنی دەروونزانین و ئاماژەیەکی دەروونین بۆ ناواخنی ناوەڕۆکی چیرۆکەکانی شێرزاد حەسەن.

٦- ئەو کارەکتەرانەی شێرزاد حەسەن هەڵی بژاردوون و لە چیرۆکەکانیدا باسی کردوون بە شێوەیەکی گشتی دوو جۆرن، یەکەمیان ئەوانەی بە بەردەوامی سەرنجی رادەکێشن و شێرزاد حەسەن لە ژیانی ڕابردوویی و ئێستاشدا ئاگای لە مەینەتی و ئازارەکانی ئەوان هەیە و بەردەوام سەرنجی ڕادەکێشن. دووەمیان پاڵەوان و کارەکتەری چیرۆکەکانی چیرۆکنووس نزیکە لە ژیانی خۆیی و کەسانی چواردەوری خۆی.

## پەراوێزەکان

١– د. عادل گەرمیانی – ڕەهەندی دەروونی لە چیرۆکی درێژی (من و قالەو سەگەکەی پاڤلۆڤـ)دا، دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ٢٠٠٦، ل٢٧

٢– شێرزاد حەسەن یەکێکە لە چیرۆکنووسە ناسراوەکانی ئەدەبی کوردیی هاوچەرخمان، ئەم چیرۆکنووسە ساڵی ١٩٥٠ لە شاری هەولێر لە دایك بووە، ساڵی ١٩٧٥ خوێندنی لە بەشی ئینگلیزیی زانکۆی المستنصریە لەبەغدا تەواو کردووە، شانزە ساڵ مامۆستای وانەی ئینگلیزی بووە لە ئامادەیی پیشەسازی سلێمانی، خاوەن ئەم سێ کۆمەڵە چیرۆکەیە : (تەنیایی / ١٩٨٣) و (گوڵی ڕەش / ١٩٨٨) و (گەڕەکی داهۆڵەکان / ١٩٧٧ ). هەروەها خاوەن کورتە ڕۆمانی (حەسارو سەگەکانی باوکم / ١٩٩٦) و ڕۆمانی (پێدەشتی کارمامزە کوژراوەکان /٢٠٠١) و، لە بواری وەرگێڕانیش لە زمانی ئینگلیزییەوە خاوەن ئەم بەرهەمانەیە : (بە تووڕەیی ئاوڕێك لە ڕابردوو بدەرەوە ــ نووسینی : جۆن ئۆزبۆرن، شانۆنامە / ١٩٨٦) و، (فرمێسکەکانی کوکوختی – کۆمەڵە چیرۆك / ١٩٨٧) و (مارا ــ ساد ــ نووسینی : پیتەر فایس / ١٩٩٩) و، (هەقتە بزانی ــ ڕۆژنامەگەری و ڕاگەیاندن /٢٠٠) و، (مەرگەساتی شا لیر ــ نووسینی : وەلیەم شەکسپیر، شانۆنامە / ٢٠٠٠). هەروەها خاوەن کتێبی (بێ کتێب هەڵناکەم ــ تێڕوانینی ئەدەبی /٢٠٠٠ ــ ٢٠٠١). هەروەها خاوەن دوو ڕۆمانی دیکەیە یەکێکیان بەناوی (ژنێکی منگن) و (ژنێك بەسەر منارەوە).

٣– د. کەریم شەریف قەرەچەتانی– سایکۆلۆژیای منداڵ، بەشی سێیەم، چا/ زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ٢٠٠٤، ل٧٠

٤– د.نیل– پەروەردەکردنی منداڵانی ئازادو سەربەخۆ، و: قادر وریا، بەرگی یەکەم، چ. یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل٤٢

٥– هیوا قادر– ئەو پیاوەی لە تووڕەبووندا جوانە (گفتوگۆیەك لەگەڵ شێرزاد حەسەن)، ل٢٤٢

٦– هەمان سەرچاوە، ل٣٣

هیوا قادر– ئەو پیاوەی لەتووڕەبووندا جوانە (گفتوگۆیەك لەگەڵ شێرزاد حەسەن)، ل٢١٤

٨– شوان ئەحمەد – لە هەولێرەوە تا هلسنکی (گفتوگۆیەك لەگەڵ شێرزاد حەسەن)، ل١٠٧

٩– د.عومەر یاسین جەباری– ژیانی مرۆڤ لە ڕوانگەی دەروونزانییەوە، لە بلاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٤، ل٤٤–٤٥

١٠– ڕێبوار حەمە ڕەحیم – شێرزاد حەسەن لە کازیوەی ئەم بەیانییە دەڕوانێت (چاوپێکەوتن)، ل٢٣

١١– هیوا قادر – ئەو پیاوەی لەتووڕەبووندا جوانە (گفتوگۆیەك لەگەڵ شێرزاد حەسەن)، ل٢٤٢

١٢– " شارەزایەکی بەناوبانگی دەروونزانی ڕۆژێك لە بارەی ئالۆزییەکی دەروونیی لاوێکەوە قسەی بۆکردم کە لەئاکامی کردەوەیەکی هەڵەی باوکیدا بۆی پێك هاتبوو. ئەو دەیگوت : ئەو لاوە کاتێك ٦ ساڵە بوو ڕۆژێك لەگەڵ کچێکی (٧) ساڵە لە حاڵەتێکدا کە زۆربەی لەشیان ڕووتو بەدەرەوە بووە، پێکەوە یارییان کردووە. باوکی بەسەریاندا هاتووەو ئەوی تێروپڕ کوتاوە. ئەم چەشنە ڕەفتارە ئەو منداڵەیان کردووە بە بوونەوەرێك، کە تا لەژیاندایە بە داماویو ترسنۆکی بمێنێتەوە" بڕوانە : د. نیل، پەروەردەکردنی منداڵانی ئازادو سەربەخۆ، ل٤٤. ئەم ڕووداوە هەمان ڕووداوی سەردەمی منداڵیی شێرزادە کە لە بابەتی ژیانو سەرچاوەی چیرۆکەکانی شێرزاد حەسەن لە باسەکەماندا باس کراوە، هەروەها شێرزاد بەسەرەتایەکی ترسو گرێی دەروونی دەزانێ.

١٣– شوان ئەحمەد – لە هەولێرەوە تا هلسنکی (گفتوگۆیەك لەگەڵ شێرزاد حەسەن)، ل١٠٥

١٤– یوسف عوسمان حەمەد– گەنجو گرفتە دەروونییەکان، بەرگی یەکەمو دووەم، چ. سێیەم، لە بڵاوکراوەی نواڵەی نوێ، هەولێر، چا. منارە، (ب– س)، ل٢٧

١٥– د. کەریم شەریف قەرەچەتانی– سایکۆلۆژیای هەرزەکارو لاوان، چا. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤، ل٤٤

١٦– هەمان سەرچاوە، ل٤٤–٤٥

١٧– د. کەریم شەریف قەرەچەتانی– سایکۆلۆژیای منداڵ، بەشی یەکەم، چا. زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ١٩٩٧، ل١٠٢

١٨– یوسف عوسمان– گەنجو گرفتە دەروونییەکان، بەرگی یەکەمو دووەم، چ. سێیەم، لە بڵاوکراوەی نواڵەی نوێ، هەولێر، چا. منارە، (ب– س)، ل٢٧–٢٨

١٩– هەمان سەرچاوە، ل٢٨

٢٠– ڕێبوار حەمە ڕەحیم – شێرزاد حەسەن لە کازیوەی ئەم بەیانییە دەڕوانێت (چاوپێکەوتن)، ل٢٢

٢١– هیوا قادر – ئەو پیاوەی لەتووڕەبووندا جوانە (گفتوگۆیەك لەگەڵ شێرزاد حەسەن)، ل٢٢٣

٢٢– کۆمەڵێ نووسەر– تیۆری ڕۆمان، و: محەمەد کەریم، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل١٤٥

٢٣– د. عومەر یاسین جەباری– دەروونزانی، چا. زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ٢٠٠٠، ل١١٣

٢٤– د.کەریم شەریف قەرەچەتانی– دەروونزانی، هەولێر، ١٩٩٦، ل١٦

٢٥- د. عومەر یاسین جەباری- دەروونزانی، ل١١٣
٢٦- عەبدولموتەلیب عەبدوللاّ- چەمکی دڵەڕاوکێ لە تێڕوانینی فرۆیددا، دۆسیەی فرۆید، گ. کاروان، ژ. ١٣٥، ١٩٩٩ ل٧١
٢٧- د.کەریم شەریف قەرەچەتانی - دەروونزانی، ل١٧
٢٨- عەبدولموتەلیب عەبدوللاّ - چەمکی دڵەڕاوکێ، چەمکی دڵەڕاوکێ لە تێڕوانینی (فرۆید)دا، ل٧٧
٢٩- د.کەریم شەریف قەرەچەتانی - دەروونزانی، ل١٧
٣٠- د.کەریم شەریف قەرەچەتانی- سایکۆلۆژیای هەرزەکارو لاوان، ل٤١
٣١- د. و. پۆڵدینگەر- پەیوەندی نێوان خەمۆکیو هونەر، و: فەیسەل عارەب بڵباس، گ. کاروان، ژ. ١٥٨، ٢٠٠١، ل١٤٨
٣٢- د. عومەر یاسین جەباری- دەروونزانی، ل١١٥
٣٣- محەمەد کەریم شەیدا- نەخۆشییە دەروونییەکانو دەروون لەشییەکان (سایکۆسۆماتی)یەکان، بەڕێوەبەرایەتی چاپو بلاوکردنەوە، سلێمانی، ٢٠٠٠، ل٦٧-٦٨
٣٤- د. و. پۆڵدینگەر - پەیوەندی نێوان خەمۆکیو هونەر، ل١٥٠
٣٥- د. عادل مەلا حوسێن- دڵەڕاوکێو خەمۆکی دیاردەو هۆکارو چارەسەر، و: عومەر عەلی محەمەد،گ. کاروان، ژ. ١٢٨، ١٩٩٨، ل١٢٢
٣٦- محەمەد کەریم شەیدا- نەخۆشییە دەروونییەکانو دەروون لەشییەکان (سایکۆسۆماتی)یەکان، ل٧٠
٣٧- محەمەد زەنون - ڕوانینێکی گشتیو مێژوویی بۆ نامۆبوون، و: دیار عزیز شەریف،گ. ڕامان، ژ. ٩١، ٢٠٠٤، ل٨٧
٣٨- کەمال فارووق- فرۆیدیزمو نامۆبوونی مرۆڤ، گ. کاروان، ژ. ١١٥، ١٩٩٧، ل١٤
٣٩- محەمەد تەها حوسێن- چەمکی یاخیبوون لەبەر ڕۆشنایی ڕێبازی سلووکییەکاندا، گ. ڕامان، ژ. ٣٩، ١٩٩٩، ل٢٢٦
٤٠- دەقی ئەو پێناسە وەرگیراوە لە: نامۆبوون لە چیرۆکەکانی حوسێن عارف دا، ڕەفیق سابیر، گ. گەلاویژی نوێ، ژ. ٢، ١٩٩٧، ل٣٥
٤١- غیاث الدین نقشبندی- نامۆیی، لە( nor the stprint & copy center )، لە چاپدراوە، ئەوسترالیا، ٢٠٠٢، ل٤٢
٤٢- سەدیق سەعید ڕواندزی- پاڵەوان لە چیرۆکەکانی شێرزاد حەسەن، ڕ. هەولێر پۆست، ژ. ٢٩، ٢٠٠٦/٣/١٣، ل ٧

٤٣– عەتا قەرەداغی– گەڕانەوە لە خەیاڵەوە بۆ واقیع، (خوێندنەوەی هەڵبژاردەیەك لە چیرۆکی کوردی)، سلێمانی، ٢٠٠٤، ل١١٤
٤٤– یوسف عوسمان – دەروونزانی، وتارو لێکۆڵینەوە و شیکردنەوە، ل١٤١
٤٥– یوسف عوسمان – دەروونزانی، وتارو لێکۆڵینەوەو شیکردنەوە، سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکریو ئەدەبی نما، چا. ڕەنج، هەولێر، ٢٠٠٤.، ل١٤٤
٤٦– د. کەمال مەعرووف– ئەدەبیاتی کلاسیکیو نوێخوازی کوردی، چا. ژین، سلێمانی، ٢٠٠٣، ل ٨٤

**سەرچاوەکان**

١– تەها حوسێن– چەمکی یاخیبوون لەبەر ڕۆشنایی ڕێبازی سلووکییەکاندا، گ. ڕامان، ژ. ٣٩، ١٩٩٩
٢– ڕەفیق سابیر – نامۆبوون لە چیرۆکەکانی حوسێن عارف دا، گ. گەلاویژی نوێ، ژ. ٢، ١٩٩٧
٣– ڕێبوار حەمە ڕەحیم – شێرزاد حەسەن لە کازیوەی ئەم بەیانییە دەڕوانێت (چاوپێکەوتن)، گ. کازیوە، ژ. ٦، ١٩٩٤
٤– سەدیق سەعید رواندزی– پاڵەوان لە چیرۆکەکانی شێرزاد حەسەن، ڕ. هەولێر پۆست، ژ/٢٩، ٢٠٠٦/٣/١٣
٥– شوان ئەحمەد– لە هەولێرەوە تا هلسنکی (گفتوگۆیەك لەگەڵ شێرزاد حەسەن) گ. ڕامان، ژ. ٧١، ٢٠٠٢
٦– د. عادل گەرمیانی – ڕەهەندی دەروونی لە چیرۆکی درێژی (من و قالەو سەگەکەی پاڤلۆڤـ)دا، دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی، بەغدا، ٢٠٠٦
٧– د. عادل مەلا حوسێن– دڵەڕاوکێو خەمۆکی دیاردەو هۆکارو چارەسەر، و: عومەر عەلی محەمەد، گ. کاروان، ژ. ١٢٨، ١٩٩٨
٨– د. عومەر یاسین جەباری– دەروونزانی، چا. زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ٢٠٠٠
د.عومەر یاسین جەباری– ژیانی مرۆڤ لە ڕوانگەی دەروونزانییەوە، لە بلاوکراوەکانی وەزارەتی ڕۆشنبیری، هەولێر، ٢٠٠٤
١٠– عەتا قەرەداغی– گەڕانەوە لە خەیاڵەوە بۆ واقیع، (خوێندنەوەی هەڵبژاردەیەك لە چیرۆکی کوردی)، سلێمانی، ٢٠٠٤
١١– عەبدولموتەلیب عەبدوللا– چەمکی دڵەڕاوکێ لە تێڕوانینی فرۆیددا، دۆسیەی فرۆید، گ. کاروان، ژ. ١٣٥، ١٩٩٩

١٢- غياث الدين نقشبندی- نامۆیی، لە (nor the stprint & copy center)، لە چاپدراوە، ئەوسترالیا، ٢٠٠٢
١٣- د. کەریم شریف قەرەچەتانی- دەروونزانی، هەولێر، ١٩٩٦
١٤- د. کەریم شەریف قەرەچەتانی- سایکۆلۆژیای منداڵ، بەشی یەکەم، چا. زانکۆی سەلاحەددین، هەولێر، ١٩٩٧
١٥- د. کەریم شەریف قەرەچەتانی- سایکۆلۆژیای منداڵ، بەشی سێیەم، چا. زانکۆی سەلاحەدین، هەولێر، ٢٠٠٤
١٦- د. کەریم شەریف قەرەچەتانی- سایکۆلۆژیای هەرزەکارو لاوان، چا. وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤
١٧- د. کەمال مەعرووف- ئەدەبیاتی کلاسیکیو نوێخوازی کوردی، چا. ژین، سلێمانی، ٢٠٠٣
١٨- کەمال فارووق - فرۆیدیزمو نامۆبوونی مرۆڤ، گ. کاروان، ژ. ١١٥، ١٩٩٧
١٩- کۆمەڵێ نووسەر- تیۆری ڕۆمان، و: محەمەد کەریم، دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، ٢٠٠٣
٢٠- محەمەد کەریم شەیدا- نەخۆشییە دەروونییەکانو دەروون لەشییەکان (سایکۆسۆماتی)یەکان، بەڕێوەبەرایەتی چاپو بڵاوکردنەوە، سلێمانی، ٢٠٠٠
٢١- محەمەد زەنون - ڕوانینێکی گشتیو مێژوویی بۆ نامۆبوون، و: دیار عەزیز شەریف، گ. ڕامان، ژ. ٩١، ٢٠٠٤
٢٢- د.نیل- پەروەردەکردنی منداڵانی ئازادو سەربەخۆ، و: قادر وریا، بەرگی یەکەم، سلێمانی، ٢٠٠٠
٢٣- هیوا قادر - ئەو پیاوەی لە تووڕەبووندا جوانە (گفتوگۆیەك لەگەڵ شێرزاد حەسەن)، گ. ڕەهەند، ژ. ٥، سوید، ١٩٩٨
٢٤- د. و. پۆڵدینگەر- پەیوەندی نێوان خەمۆکیو هونەر، و: فەیسەل عارەب بلبناس، گ. کاروان، ژ. ١٥٨، ٢٠٠١
٢٥- یوسف عوسمان حەمەد- گەنجو گرفتە دەروونییەکان، بەرگی یەکەمو دووەم، چ. سێیەم، لە بڵاوکراوەی نواڵەی نوێ، هەولێر، چا. منارە، (ب- س)
٢٦- یوسف عوسمان - دەروونزانی، وتارو لێکۆڵینەوەو شیکردنەوە، سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکریو ئەدەبی نما، چا. ڕەنج، هەولێر، ٢٠٠٤

## خلاصة البحث

## انعكاس بعض الجوانب النفسية في قصص شيرزاد حسن

كل قصة فنية قصيرة، كنتاج وكجنس أدبي تحمل في طياتها نفحات نفسية تزداد درجاتها كلما اتخذت القصة في الاسلوب النفسي منهجاً لها، وكل قصة تعبر عن نفسية كاتبها او تعبر عن وجهة نظرهُ النفسية في تصوير الحدث القصصي واظهار الواقع النفسي للقاص.

غالبية النتاجات القصصية النفسية في الادب العالمي برزت بعد الحرب العالمية الاولى، لكون تلك الحرب كانت لها عواقب وخيمة، وكان لها تأثيرها النفسي في اعماق الذين ساهموا في تلك الحرب، وكان لها ايضاً تاثيرها النفسي في اعماق ابناء المجتمع الاوروبي، وتطور ابراز الجانب النفسي بعد الحرب العالمية الثانية وماتلتها من اعوام حتى اصبح البعد النفسي له حضوره الفاعل في بناء القصة القصيرة. ومن يقرأ النتاجات القصصية الكُردية سيجد هناك ملامح من البعد والتناول النفسي فيها، لكن شيرزاد حسن كقاص وروائي كُردي برز من بين القاصين الكُرد في توظيف البعد النفسي في قصصه، حيث برز هذا الجانب في العديد من قصصه التي امتازت بتوظيف اتجاهات المدارس النفسية في عوالم قصصه بشكل علمي مبسط وبشكل ادبي مثير لانتباه القارىء. تم اختيار هذا الموضوع لدراستنا الاكاديمية لكي نوضح طبيعة التناول النفسي لاحداث القصص وطبيعة الشخصية من الناحية النفسية في عوالم قصص شيرزاد حسن، ومن هنا تبرز اهمية هذه الدراسة الاكاديمية في واقع النقد الادبي الكُردي. تتكون هذه الدراسة من مقدمة وخمس مباحث مع خلاصة بالنتائج التي توصلنا اليها في هذه الدراسة، وهناك في الخاتمة قائمة باسماء المصادر التي أستفدنا منها لكتابة هذه الدراسة الأكاديمية الموسومة بـ (أنعكاس بعض الحالات النفسية في قصص شيرزاد حسن). تناولنا في المقدمة مفهوم القصة النفسية ودورها في تصوير بعض الحالات النفسية، ومدى اهتمام وتخصص القاص شيرزاد حسن في مجال القصة النفسية الكردية. خصصنا المباحث الخمسة للحديث عن أنعكاس بعض الحالات النفسية في نتاجاته القصصية، ولهذا الغرض تناولنا كل حالة نفسية بالحديث عنها مع ايراد العديد من الأمثلة كدلالات من نتاجاته القصصية.

# Abstract

## Reflection of Some Psychological States in Sherzad Hassan's Stories

Every short story, as a literary work and genre, contains psychological touches escalating more with the adoption of the psychological approach by the author. Moreover, every story expresses its author's psychology or his psychological perspective employed for portraying the plot and demonstrating the storyteller's psychological reality.

Notably, the aftermath of the First World War witnessed the birth of the majority of the psychological fictions in world literature, much due to the grave consequences of the said war and the profound psychological impacts on both the participants and the entire European community as well.

More development of the psychological aspect in world literature came in the aftermath of the Second World War in such a way as to become a potential element in the structure of short story. Furthermore, close examination of Kurdish short stories reveals many examples of psychological treatments. Sherzad Hassan is the novelist and short story writer whom we have singled out for our study owing to his prominence and extensive, simple, attractive and highly literary use of the psychological dimension in his works.

The study consists of an introduction and five sections. The introduction covers the concept of the psychological fiction and its role in portraying some psychological states as well as Sherzad Hassan's concern with this literary trend in Kurdish literature. However, the other five sections have been devoted to an analysis of the reflection of psychological states in Hassan's short stories, each of which has been supported by examples from his works.

## لیستی سەرچاوەكان:

**یەكەم: كتێب ((بەزمانی كوردی))**


١- ڕاجی (دیوان)، ئامادەكردنی د. عوسمان دەشتی، ئیسماعیل ڕاجی، هەولێر، چاپخانەی ڕۆژهەلاَت، ٢٠١١ م.
٢- عەبدولڕەزاق بیمار، كێش و مۆسیقای هەڵبەستی كوردی، بغداد، چاپخانەی (دار الحرية)، چاپی یەكەم، ١٩٩٢ م.
٣- عەزیز گەردی، كێشی شیعری كلاسیكی كوردی، هەولێر، چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری، چاپی یەكەم، ١٩٩٩ م.
٤- عەزیز گەردی، ڕابەری كێشی شیعری كلاسیكی كوردی، سلێمانی، چاپخانەی دێكان، ٢٠٠٣ م.
٥- محەمەد بەكر، كێش و ریتمی شیعری فۆلكلۆری كوردی، هەولێر، دەزگای ئاراس، ٢٠٠٤م.
٦- مەلا عەبدولكەریمی مودەڕیس، بەدیع و عەرووزی نامی، بەغدا، چاپخانەی (دار الجاحظ) ، ١٩٩١ م.
٧- نووری فارس حەمەخان، عەرووزی كوردی، هەولێر، دەزگای ئاراس، چاپی یەكەم، ٢٠٠٤ م.
٨- یادگار رەسول باڵەكی، عەرووز وەكو پێوەر بۆ ساغكردنەوەی شیعری نالی، هەولێر، چاپخانەی ڕۆشنبیری، ٢٠١١ م.

**((بەزمانی عەرەبی))**

١- ذیاب شاهين، العروض العربي في ضوء الرمز والنظام، الاردن، دار الكندي للنشر والتوزيع، الطبعة الاولى، ٢٠٠٤ م.
٢- علم العروض، د. ياسين عايش خليل، عمان، الطبعة الاولى، ٢٠٠٧ م.
٣- العروض العربي البسيط، يحيى معروف، تهران، سازمان چاپ و انتشارات وزارت فرهنگ وانتشارات اسلامی، چاپ پنجم، پایز ١٣٨٩هـ.

نامەی ئەكادیمی:

لێكۆڵینەوەیەكی شیكاری لە شیعرە كوردییەكانی ڕاجیدا، كانیاو عوسمان مستەفا، نامەی ماستەر، كۆلێژی پەروەردە، بەشە مرۆڤایەتییەكانی زانكۆی سەلاحەددین، ٢٠١٠ز.

**گۆڤار و ڕۆژنامەكان:**

گۆڤاری زانكۆ، زانكۆی سەلاحەدین، ژمارە ١٣.

**ملخص البحث:**

**هذا البحث بعنوان ((الاوزان وقوالب الاوزان العروضية في ديوان راجي))**

يتكون البحث من المقدمة وفصلين، المقدمة تبحث عن سبب اختيار الموضوع وخطة البحث وعراقيل ومعوقات البحث، وفي الفصل الاول، توضيح كل الاوزان والقوالب الشعرية بالامثلة الشعرية الذى عددها (٧) أوزان شعرية من مجموع (٣٧) قالب شعري، كما يأتى: هزج (٩) قالب، رمل (١٠) قالب، رجز (٦) قالب، مضارع (٤) قالب، بسيط (٤)، متقارب (٢)، سريع (٢).

أما في الفصل الثاني، عيننا عدد ونسبة الاشعار وعدد الصفحات من ديوان الشاعر لهذه الاشعار المصنفة حسب حروف اللغة (ا، ب، ت، ث....الخ)، والاشعار الملقات بالمناسبات.

## Abstract

This study is entitled "Rhythm and Prosodic Rhythmic Templates in Raji'sAnthology "which consists of an introduction and two chapters.

In the firstchapter, we have reviewed all the rhythms and rhythmic templates used by Raji with poetic examples which are (7) rhythms and (37) rhythms form like this:

hazaj (9) ,ramal (10) ,rajaz(6), muzaria(4) , basit (4), mutagarib(2), saria(2).

In the second chapter, we have determined the ratio numbers and numbers of poems in the poet's anthology which are arranged by language'sletters.

# شیکردنەوەی هەندێك وشە و زاراوەی نوێ لە زمانی ئێستای کوردیدا

م.ی. هیوا ئەحمەد عەصاف
م.ی. عومەر ئەحمەد عەبدولڕەحمان

## پێشەکی

لەگەڵ پێشکەوتن و فراوانبوونی کۆمەڵدا زمانیش دەگۆڕرێت، یەکێك لە ئاڕاستەکانی گۆڕانی زمان (فراوانبوون)ە. ئەمەش بەهۆی لەدایکبوون و دروستکردنی وشە و زاراوەی نوێوە دەکرێت، لە پێناوی ئەوەی زمان بە زیندوویی بمێنێتەوە و هاوشانی کۆمەڵ بڕوات. ئەم پرۆسەیەش دەبێت لەژێر ڕۆشنایی دەستوور و یاسای زمانەکەدا بێت و لەلایەن خەڵکی شارەزا و لێزانەوە ئەنجام بدرێت.

ئەم لێکۆڵینەوەیە، هەوڵێکە بۆ لێکدانەوە و شیکردنەوەی هەندێك لەو وشە و زاراوە نوێیانەی، کە بەم دواییە پەیدابوونە و لە بڵاوکراوە و ڕاگەیاندنەکاندا دەبیسترێن. ئەم کارە لێکۆڵینەوەیەکی (وەسفی – شیکاری)یە، کە تیایدا وشە و زاراوەکان لەگەڵ یاسا و دەستووری زمانی کوردیدا بەیەك گیراون و لەڕووی پێکهاتنەوە شی کراونەتەوە. هەروەها لەڕووی واتا و بەکارهێنانەوە لێیان کۆڵراوەتەوە.

گرنگیی لێکۆڵینەوەکە لەوەدایە، کە هەوڵێکە بۆ دەستنیشانکردنی ئەو هەڵانەی، کە لە ڕۆنان و بەکارهێنانی وشە و زاراوەکاندا بەدی دەکرێن. ئەمەش لەپێناوی دوورخستنەوەی وشە و زاراوەی نادروست لە زمانەکە، کە هەر ئەمەش ئامانجی لێکۆڵینەوەکەیە.

لێکۆڵینەوەکە، جگە لەم پێشەکییە، لە دوو بەش پێکهاتووە، لە بەشی یەکەمدا باسی چەمك و بنەمای دروستکردنی زاراوە کراوە لەگەڵ خستنەڕووی ئەو مەرجانەی، کە پێویستە لەو کەس/دەستانەدا هەبن، کە زاراوە سازدەکەن.

هەروەها بەکورتی باس لە ڕۆنانی وشە کراوە. بەشی دووەم پێکهاتووە لە دوو تەوەرە، لە تەوەرەی یەکەمدا ئەو وشە و زاراوانە شی کراونەتەوە، کە لە ڕووی پێکهاتنەوە گرفتیان تێدا بەدی دەکرێت. لە تەوەرەی دووەمدا باسی ئەو وشە و زاراوانە کراوە، کە لەڕووی بەکارهێنانەوە تێبینییان لەسەرە و بۆ واتای دروستی خۆیان بەکار ناهێنرێن.

لە کۆتاییدا ئەنجام و لیستی سەرچاوەکان، لەگەڵ پوختەی لێکۆڵینەوەکە بە زمانی کوردی و عەرەبی و ئینگلیزی خراوەتەڕوو.

## بەشی یەکەم: دروستکردنی زاراوە و وشەی نوێ لە زماندا

کۆمەڵی مرۆڤایەتی بەردەوام لە گۆڕان و بەرەوپێشچووندایە، لەو گۆڕانەشدا فراوان دەبێت و بیر و کەرەستەی نوێ پەیدا دەبن، دەبێت زمانیش، کە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە، هاوشانی کۆمەڵ بگۆڕێت و قسەپێکەران بتوانن کاری خۆیانی پێ ڕایی بکەن، بۆیە دەبێت لەگەڵ فراوانبوونی کۆمەڵ و زۆربوونی کەرەستە و بیردا کەرەستەی زمانیش زیاد بکات، بۆ ئەمەش قسەپێکەران ناچاردەبن وشە و زاراوەی نوێ دروست بکەن. واتە ((هەرچەندە شارستانییەتی نەتەوە پێشکەوێت و پێداویستی ژیان زۆرتربێت و بیری پێشکەوێ، ...زمانی دەبووژێتەوە و ... وشەی نوێی بۆ دێن))[1].

زاراوە ((وشەیەکە.. سنوورێکی تەنگەبەری هەیە، کە بە بەکارهێنانی لەلایەن تاقمێك لە خەڵکی لە کۆڕێك لە کۆڕەکانی ژیاندا شوورەی کێشراوە و لە وشەی فەرهەنگییەوە وەرگیراوە))[2]. واتە وشەی سەر زاری هەموو خەڵك نییە و تەنیا دەستەیەك لە بوارێکی دیاریکراودا چەمکێکی تایبەتی پێ دەدەن. ئەمەش پێویستی بە ڕێککەوتنی دەستەکە هەیە لە ڕووی فۆرم و چەمکەوە. هەر هەمان دەستە زاراوەکە دیاری دەکەن، یان دروستی دەکەن. ئەمەش کاری هەموو کەس نییە و کارێکی سەرپێیی و ڕەمەکی نییە. هەندێك لە زمانەوانان پێیان وایە، ئەوانەی زاراوە سازدەکەن، پێویستە چەند مەرجێکیان تێدابێت[3]. لەگەڵ ئەوەشدا دەگونجێت قسەپێکەرێکی ئاسایی زمان زاراوەیەکی گونجاو دروست بکات و خەڵکیش وەری بگرن و بڵاو ببێتەوە.

دەستنیشانکردن و دروستکردنی زاراوەش بەپێی بنەما و دەستووری تایبەتی دەبێت و ناکرێت بە ئارەزوو و بێ بنەما بێت، بەڵکو ڕێباز و ڕێگای تایبەتیی خۆی هەیە، کە بریتین لە ((ڕێبازی وەرگرتن، ڕێبازی فرەواتا، ڕێبازی لێکدان، ڕێبازی داتاشین، ڕێبازی دارشتن، ڕێبازی وەرگێڕان، ڕێبازی زرەریژ))[٤]. زاراوە بەپێی مەرج و دەستووری یەکێك لەو ڕێبازانە ساز دەکرێت. واتە ناکرێت زاراوە بە ئارەزووی تاکەکەس ساز بکرێت، بەڵکو ((پێویستە ئەو بنەمایانە یەکبخرێن، کە کاریان پێدەکرێت بۆ دۆزینەوە و گۆڕینی چەمکەکان و دانانی زاراوە بەرامبەرییەکان))[٥].

ئەو وشەیەی، کە دەکرێت بە زاراوە پێویستە لە ڕووی واتا و فۆرم و بەکارهێنانەوە لەبار بێت. تاکو وشەی کورت و پڕواتا و جوان لە زمانەکەدا هەبێت، نابێت پەنا بۆ دروستکردنی وشەی گەورە و لاواز ببرێت. هەتا زاراوە کورتتر و سادەتر بێت پەسندترە، کە وشەی وا دەست نەکەوت، هەتا بکرێ زاراوەکە لە کەمترین ژمارەی کەرت پێکهاتبێ[٦]. هەروەها پێویستە زاراوەکە چەمکەکە لەخۆ بگرێت و ڕەچاوی باری ڕێزمانی و تایبەتییەکانی زمانەکە و ڕێسای باوی زاراوەسازی و ڕێبازەکانی زمانەوانی لە دانانی زاراوەی نوێدا بکرێ[٧].

ئەمانە و چەندین بنەما و ڕێسای بنچینەیی هەیە[٨]، کە پێویستە لە دانانی زاراوەدا لەبەرچاو بگیرێن.

یەکێکی تر لەو ڕێگایانەی، کە بەهۆیەوە زمان بە زیندوویەتی دەهێڵرێتەوە و پێویستییەکانی سەردەمی پێ پڕ دەکرێتەوە، (وشەڕۆنان)ە. هەموو زمانێکی زیندوو لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمەڵدا ((بۆ دەربڕینی چەمکە نوێیەکان پەنا دەباتە بەر داتاشین و لێکدان و ..))[٩]. لەکاتێکدا وشەی بنجی (وشەی سادە، ڕەگ) لە هەموو زمانێکدا سنووردارە و چەمکەکان بێ سنوورن، بەهۆی وشەڕۆنانەوە زمان هێما بۆ چەمکەکان دادەنێت. واتە لە کاتێکدا ((ژمارەی ڕەگەکان (جذور Roots) لە هەر زمانێکدا لە چەند هەزارێك زیاتر نییە، کەچی ژمارەی ئەو چەمکانەی، کە ... هەن، چەند ملیۆنێك دەبێت))[١٠]، بەهۆی زاراوەسازکردن و وشەڕۆنانەوەش هێما بۆ ئەو چەمکانە دادەنرێت. هەر زمانێك دەستوور و یاسای تایبەتیی خۆی

هەیە بۆ وشەڕۆنان[11]، كە پێشینەی هەیە و پێشتر پەیڕەو كراوە، كە دەتوانرێت ئەو یاسایانە لە ((فۆلكلۆر و هۆنراوەی میللی))[12]دا بدۆزرێتەوە.

كەواتە زاراوەسازكردن و وشەڕۆنان دەستوور و ڕێبازی تایبەتیی خۆی هەیە و ئەوەی بەو كارە هەڵدەستێت تایبەتمەندیی خۆی هەیە و ئەو وشەیەی هەڵدەبژێردرێت یان دروست دەكرێت دەبێت لەبار و گونجاو بێت و بەر یاسای زمانەكە بكەوێت، بەڵام بەم دواییە كۆمەڵێك وشە و زاراوەی نوێباو لە زمانی ڕۆژنامەگەریی كوردی، یان لە ڕاگەیاندن و لە باری فەرمیدا، بەكار دەهێنرێت، كە لە ڕووی پێكهاتنەوە نامۆن بە یاساكانی زمانی كوردی، یان لەڕووی واتاوە گونجاو و لەبار نین، یان واتای مەبەست نادەن بەدەستەوە، وەك لە خوارەوەدا دیارە.

## بەشی دووەم: هەندێك وشە و زاراوەی نویٚ لە زمانی ئێستای كوردیدا

بەم دواییە هەندێك وشە و زاراوە لە ڕاگەیاندنەكانەوە دەبیستین، كە هەندێكیان لە زمانەكەدا نامۆن، نامۆییەكەشیان لەوەدا نییە، كە تازە دروست كراون و پێشتر نەبیستراون، بەڵكو لە بەزاندنی بنەمای پێكهاتن یان نادروستیی واتا و بەكارهێناندایە.

### تەوەرەی یەكەم: لادانی ڕێزمانی لە دروستكردنی زاراوەدا

لە دروستكردنی هەندێك لەو وشە و زاراوە نوێیانەدا پەیڕەوی ئەو یاسا و دەستوورانەی زمانی كوردی نەكراوە، كە لە زمانەكەدا بەكار دەهێنرێن بۆ دروستكردنی وشە و زاراوەی نویٚ و پێشینانی ئێمە لە زانا و زمانزان و زمانەوانان پەیڕەوییان كردووە، وەك:

**یەكەم: (چالاكوان)**

ئەم زاراوەیە لە زمانی ڕاگەیاندنی ئێستادا بەزۆری بەكار دەهێنرێت بە واتای كەسی چالاك و بزێو یان ڕاپەڕ، كە چالاكیی ڕۆشنبیری یان ڕێكخراوەیی ئەنجام دەدات، كە لە بەرامبەر (ناشط)ی عەرەبیدا بەكار دەهێنرێت.

ئەم زاراوەیە لە (چالاك+وان) دروست كراوە، كە (چالاك) ناوەڵناوە و (وان/ەوان) پاشگرێكی وشەدارێژە لە زمانی كوردیدا، بەڵام ئەم پاشگرە لە زمانەكەدا ((بەناوەوە دەلكێ))[13]، وەك (گاوان، دەرگاوان، ئاشەوان،

بەرخەوان...). بەم پێیە یاسای پێکهێنانی ئەم زاراوەیە لەگەڵ یاساکانی زمانی کوردیدا یەك ناگرێتەوە و یاسای لەو جۆرە بەرچاو ناکەوێت.

لەڕووی واتاوە پاشگری (وان/ەوان)، ((بەزۆری یارمەتی دارشتنی ناوێك دەدەن، کە پیشە و ئیشی یەکێکی پێ دیاری بکەن))[١٤]، پیشەکەشی بریتییە لە چاودێریکردن و ئاگالێبوونی ئەو شتەی، کە ناوەکەی لە دارشتنی وشەکەدا بەشدارە، وەك: (گاوان) بۆ کەسێك بەکاردێت، کە چاودێریی (گا/مانگا) بکات، (دەرگاوان) بۆ کەسێك بەکاردێت، کە چاودێریی (دەرگا) بکات ... بەم پێیە بێت، دەبێت (چالاکوان)یش بۆ کەسێك بەکاربهێنرێت، کە چاودێریی (چالاك) بکات، کە نە (چالاکوان–ناشط) ئەو کارە دەکات، نە (چالاك)یش شتە، تا چاودێریی بکرێت. ڕاستتر وایە لە بری (چالاکوان)، (چالاك) بەکار بهێنرێت، کە ڕەسەنترە و لە زمانەکەدا ڕۆیشتووە و هەمان ئەو مەبەستەش دەگەیەنێت، کە (چالاکوان)ی بە هەڵە بۆ بەکاردێت، چونکە (چالاك) بۆ کەسێك بەکاردێت، کە چالاکی ئەنجام بدات و لە کەسی ئاسایی چاپووکتر بێت. ئەمەش هەمان ئەو مەبەستەیە، کە (**ناشط**)ی عەرەبی بۆ بەکار دێت. بۆیە پێویست بە دارشتنی زاراوەی نوێ ناکات، چونکە ((هەرگیز نابێت بەرامبەر بە وشەی بێگانە زاراوە دابتاشین، تا بە تەواوی دڵنیا نەبین لەوەی، کە ئەو وشەیە لە کوردیدا نییە))[١٥]. هەروەها بەهۆی ئەوەی وشەی (چالاك) پێشتر لە زمانەکە هەبووە واتاکەی ڕوون و دیارە و کێشەی گەیاندنی واتای نییە، ئەو وشەیە لەپێشترە تاکو بکرێتە زاراوە، نەك وشەیەکی وای بۆ دابڕێژی، چونکە ((هەتا زاراوە کورتتر و سادەتربێ پەسندترە))[١٦]. هەرچەندە (چالاك) ئاوەڵناوە و لە بەرامبەر ئاوەڵناوی (نشیط)ی عەرەبی هەموو خەڵك بەکاری دەهێنێت، بەڵام لە بەرامبەر (ناشط)یش بەکار دەهێنرێت، کە (ئاوەڵناوی بکەر[١٧]–اسم فاعل)ە[١٨] و دەتوانێت ببێت بە زاراوە بۆ ئەو کەسانەی، کە چالاکی ڕێکخراوەیی یان ڕۆشنبیری .. ئەنجام دەدەن، چونکە ((دەشێ زاراوە ... لەلای کۆمەڵانی خەڵکی واتایەکی دیکەی هەبێ، بەڵام پسپۆڕەکانی ئەو بابەتە بۆ واتا تایبەتییەکەی و بۆ مەبەستە زاراوەییەکەی بەکاری بهێنن))[١٩].

ئەگەر لە ڕوانگەی ئیکۆنۆمی و وزە سەرفکردنیشەوە سەیری هەردوو وشەی (چالاك) و (چالاکوان) بکەین، دەبێت وشەی یەکەم هەڵبژێرین، چونکە لە هەموو

بارێکدا زمان ((تا بۆی بکرێت باڵانسی سەرفکردنی وزە ڕادەگرێت و بەردەوام خۆی لەگەڵ هەموو بارودۆخێکی نوێدا ڕێکدەخات، تا ڕێگا بگرێت لە بەفیڕۆدانی وزە و نەهێڵێت بەخۆڕایی لەکیس بچێت))[٢٠].

**دووەم: هاوسەرگیری**

زاراوەیەکە لە بەرامبەر (زواج)ی عەرەبی بەکار دەهێنرێت. وشەکە لە (هاوسەر+گیر+ی) دروست بووە، (هاوسەر) ناوی داڕێژراوە لە پێشگری (هاو) و ناوی (سەر) دروست بووە، (ی) مۆرفیمێکی وشە داڕێژە، بەڵام کێشەکە لە (گیر)دایە. بێژەی (گیر) وەکو وشەیەکی سەربەخۆ لە زمانەکەدا بەکار دەهێنرێت و دەبێتە ئاوەڵناو و بۆ شتێك، کە ڕەت نەبێت و بەربەستی بێتە پێش بەکار دەهێنرێت، وەك (شتەکە گیرە، گیر بووە، گیری خواردووە ...). بێگومان ناکرێت لە (هاوسەرگیری)دا بەو واتایە بەکار هاتبێت. هەروەها (گیر) لە وشەی وەك (خواگیر)دا هاتووە، کە لە زمانی فارسیدا بەکاردێت و بە واتای (خواگرتوو) دێت، کە بۆ کەسی ((بەر ڕك و کینەی خودا کەوتوو))[٢١] بەکاردێت، واتە کەسێك خوا بیگرێت. لە زمانی کوردیدا چاوگەکەی (گرتن)ە و دەربڕینی وەك (خوا بتگرێ، خوا بیانگرێ ...) بەکار دەهێنرێت. بەم پێیە بێت (گیر) لە (گرتن)ەوە هاتووە، لە کاتێکدا (گرتن) ڕەگی ڕابردوو و ڕانەبردووی هەیە، کە (گر، گرت)ە. خۆ ئەگەر بگوترێت، (گیر) لە (گر)ەوە هاتووە و (هاوسەرگیر)ی دروست کردووە و پاشان بەهۆی مۆرفیمی بەندی وشەداڕێژی (ی)ەوە (هاوسەرگیری) دروست بووە، کە ناوی پرۆسەکەیە، وەکو زۆر وشەی تر، کە بەو جۆرە دروست بوون، وەك (پیاو+کوژ+ی، ڕێ+گر+ی...)، ئەوا دەبێت بگوترێت، (ی) لە نێوان (گ..ر)دا ناوگرە، کە ئەمەش ڕووبەڕووی چەند ڕەخنەیەك دەبێتەوە، لەوانە:

١- زۆربەی زمانەوانان پێیان وایە، ناوگر لە زمانی کوردیدا نییە، ئەوانەی باوەڕیشیان پێیەتی چەند نموونەیەکی دیاریکراو دەکەن بە بەڵگە بۆ قسەکانیان و هیچیشیان (گیر)یان بە نموونە دانەناوە[٢٢].

٢- بۆچی و لە پێناوی چیدا (گر) دەکرێت بە (گیر)؟ لە کاتێکدا (گر) دەخرێتە هەمان ئەو یاسایەی، کە (هاوسەرگیری) پێ دروست کراوە و وشەی وەك (ڕێگری، باجگری..) دروست دەکات، کە لە (ڕێگرتن،

باجگرتن)ەوە هاتوون، ئیتر بۆچی لە (هاوسەرگرتن)ەوە وشەی (هاوسەرگری) دروست نەکرێت و ببێت بە (هاوسەرگیری)؟

٣- ئەو دەنگە زیادەیە هیچ ئەرك و واتایەکی زیادەی نەخستووەتە سەر ڕەگەکە، بۆیە ناکرێت وەکو مۆرفیمێکی (ناوگر)یش سەیر بکرێت.

لە زمانی کوردیدا بۆ ڕەگەزی نێر (ژنهێنان) و بۆ ڕەگەزی مێ (شووکردن) بەکار دەهێنرێت، بەڵام بۆ بەیەکگەیشتنی هەردوو ڕەگەز ناوێکی تایبەت نییە، کە دەکرێت (هاوسەرگری) یان (هاوسەرگرتن) بەکار بهێنرێت، چونکە لە کوردیدا (گرتن) بۆ (یار، خۆشەویست) بەکار دەهێنرێت و دەگوترێت (یارێکی تازەم گرتووە).

**سێیەم: ئاشتەوایی**

زۆرجار ئەم وشەیە لە دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە دەبیستین، کە بە واتای (ئاشتی، یان پرۆسەی ئاشتی) بەکار دەهێنرێت و لەم جۆرە ڕستانەدا بەکار دەهێنرێت (هەوڵ بۆ بەدیهێنانی برایەتی و ئاشتەوایی نێوان ڕۆڵەکانی گەلەکەمان دەدەین...). وشەکە لە (ئاشت+ەوایی) دروست کراوە، (ئاشت) ئاوەڵناوە و بەواتای (نێوان خۆش، بێ شەڕ و تووڕەبوون) دێت و وشەی تری وەك (ئاشتبوونەوە، ئاشتکردنەوە ...)ی لێ دروست دەکرێت.

لە زمانی کوردیدا (ی) وەکو مۆرفیمێکی وشەداڕێژ دەچێتە سەر (ئاوەڵناو) و (ناو) دروست دەکات، وەك (جوان+ی، پاك+ی، خۆش+ی ..) بەهەمان شێوە (ئاشت+ی) دەبێتە ناو. ئەم زاراوەیە لە زمانەکەدا کۆنە و ((لە پەندی پێشینانی دێرینمان (ئاشتی دوای شەڕ خۆشە).. بەرامبەر بەزاراوەی (السلام)ی عەرەبی))[٢٣] بەکارهێنراوە و زمانەکە پێویستی بەزاراوەیەکی وەك (ئاشتەوایی) نییە. جگە لەوە (ئاشت) ئاوەڵناوە و چۆنیەتی پەیوەندییەکە پیشان دەدات، (ئاشتی)یش ناوی جۆری پەیوەندییەکەیە، کە (نێوان خۆشی)یە، (ئاشتەوایی)یش جگە لە ناو، ناتوانرێت بە هیچ بەشە ئاخاوتنێکی تر (ئاوەڵکار، کار، چاوگ ..) دابنرێت. بۆیە لە کاتی بوونی زاراوەیەکی وەك (ئاشتی) کە ڕەسەن و باوە و لە زمانەکەدا ڕۆیشتووە، پێویستە ئەوەیان بەکار بهێنرێت، چونکە یەکێك لە بنەماکانی دانانی زاراوە بریتییە لە ((پەسندکردنی وشەی باو بەسەر وشەی

دەگمەن یان نـامۆ و نائاشـنادا))[٢٤]. هـەروەها دانـانی زاراوەیـەکی تـر بـۆ هـەمان مەبەست تەنیا دەبێتە هۆی سەرلێشێوانی گوێگر و خوێنەر. جگە لەوەش ((نابێت یەك شت یان چەمك بە زیاتر لە یەك زاراوە دەربڕدرێت))[٢٥].

**تەوەرەی دووەم: لادانی واتایی لە بەکارهێنانی زاراوەدا**

کێشەی کۆمەڵێکی تر لە وشە و زاراوە نوێیەکان لەوەدایە، کە واتـای مەبەسـت نـادەن بەدەسـتەوە، یـان پێکچـوون نییـە لـە نێـوان واتـای فەرهـەنگی و واتـای زاراوەییەکەیاندا. یان دروستکردن و بەکارهێنانیان لە زمانەکە زیادە و پێویست نییـە، چونکە لە زمانەکەدا وشە و زاراوەی پێویست بۆ ئەو مەبەستانە هەیە. هەندێك لەو وشە و زاراوانە:

**یەکەم: پارساڵ**

ماوەیەکە، ئەم وشەیە لە بواری ڕاگەیانـدن و لـە بـاری فەرمیـدا بەشـێوەیەکی بەربڵاو بۆ مەبەستی (ساڵی ڕابردوو) بەکاردەهێنرێت. ئـەم وشـەیە لێکـدراوە و لـە (پار+ساڵ) پێکهاتووە، کە (پار) (ئاوەڵکـاری کـات)ە و (سـاڵ) نـاوێکی گشـتییە. وشەکە لەڕووی پێکهاتنەوە کێشەی نییە، چونکە قالبی (ئاوەڵکاری کات+نـاو) لـە زمانەکەدا هەیـە وەك (دوێنـیێ شـەو)، بـەڵکو کێشـەکە لـە بـەکارهێنان و پێویسـت نەبوونی وشەکەدایە، چونکە وشەی (پار) خۆی بە واتـای (سـاڵی ڕابـردوو) دێـت و هەردوو چەمکی (ساڵ) و (ڕابردوو)ی تێدایە و ماوەی کاتەکەی بریتییە لە (سـاڵێك = ٣٦٥ ڕۆژ) لـە کـاتی ڕابـردوودا. (سـاڵ)یش لـە بەرامبـەر مەودایـەکی کـاتیی دیاریکراودا بەکار دەهێنرێت، کە (٣٦٥) ڕۆژە. بەم پێیە لە وشەی (پارساڵ)دا دوو جـار مـەودای کاتەکـە دیـاری کـراوە، بۆیـە یـەکێکیان زیـادە، زیادەکـەش دەبێـت (ساڵ) بێت، چونکە (ساڵ) هیچ ڕۆڵێکی نییە و هیچ زیادەیەکی نەخستووەتە سـەر واتای وشەکە و بە لابردنیشـی واتـای وشـەکە تێـك ناچـێت. هەرچـەندە لـە زمـانی کوردیدا (سـاڵی پـار) بـەکار دەهێنرێت، بـەڵام ئەمـەیان گرێیـە و (پـار) بـووە بـە دیارخـەری (سـاڵ) و ڕێگەپێـدراوە، چـەندین دیارخـەری تریشـی بـۆ زیـاد بکرێـت. دیارخەریش پێکهاتەیەکی بنجی و پێویست نییە لە ئاخاوتندا، بـەڵکو زانیارییـەکی پـتر دەخاتـە سـەر تێکـڕای پێکهاتەکـە، هەرچـی وشـەی ناسـادە یـان زاراوەی

دروستکراوە، دەبێت پێکهێنەرەکانیان ئەرکێك یان واتایەکیان هەبێت و زیادەی تێدا نەبێت، ئەگینا زیادییەکە دەبێتە (مۆرفیمی بەتاڵ)، تاکو کورت و واتاداریش بێت، پەسندترە. لە زمانەکەشدا وشەیەکی سادەی وەك (پار) هەیە و لەڕووی واتاوە کێشەی نییە و ئەرکی خۆی بەجێ دەگەیەنێت، بۆیە پێویست بە دروستکردنی وشەی (پارساڵ) ناکات، چونکە ((هەتا بشێ تاکە وشە پەسندە بۆ زاراوە، کە نەشیا، ئینجا داڕێژراو، .. کە ئەو مومکین نەبوو، ئینجا وشەی لێکدراو و ئاوێتە و دەستەواژە ... دەبێ ئەمە دەستووری گشتیمان بێت))[٢٦]. لەلایەکی ترەوە وشەی (پارساڵ) لە سەرچاوە و بەرهەمە نووسراوەکانی وەکو شیعرەکانی (نالی، سالم...)دا نییە و تا کۆتایی سەدەی بیستەم بەرچاو ناکەوێت و لە کاتێکیشدا، کە وشەی (پار) هەبێت و واتای مەبەست بدات بەدەستەوە، هیچ پێویست بە دروستکردنی وشەیەکی نامۆی وەك (پارساڵ) ناکات. وشەکە هیچ واتایەکی نوێی دروست نەکردووە و چەمکێك یان شتێکی نوێش پەیدا نەبووە، تاکو وشەیەکی نوێی بۆ دروست بکرێت، لە کاتێکدا ((وشەی نوێباو پەیدا دەبێ لە ئەنجامی هاتنەکایەی شت و مانا و دیاردەی نوێ))[٢٧].

**دووەم: کوشتارگە**

ئەم زاراوەیە بۆ شوێنی سەربڕینی ئەو ئاژەڵ و پەلەوەرانە بەکار دەهێنرێت، کە گۆشتیان دەخورێت، لە زمانی عەرەبیدا (مجزرە)ی بۆ بەکارهاتووە، کە (اسم مکان)ە لە کاری (جزر+بڕین)ەوە هاتووە. زاراوە کوردییەکە لەڕووی ڕۆنانەوە پێکهاتووە لە (کوشت+ار+گە). (کوشت) لە چاوگی (کوشتن) وەرگیراوە و و (ار) پاشگرێکی وشەداڕێژە و ((بە ڕەگی کرداری ڕابردوو ئێستا و ناوی چاوگەوە دەلکێ و ناوی داڕێژراوی لێ دروست دەکرێت))[٢٨]، وەك (گوت+ار)، (گە)یش پاشگرێکی وشەداڕێژە و (شوێن) نیشان دەدات. (کوشتن) لە ڕووی واتاوە بۆ کرداری کۆتاییهێنان بە ژیانی مرۆڤ و گیانلەبەران بەکار دەهێنرێت، بەڵام سەبارەت بە گیانلەبەران، بەگشتی بۆ ئەو گیانلەبەرانە بەکار دەهێنرێت، کە گۆشتیان ناخورێت، یان بۆ ئەو گیانلەبەرانەش بەکار دەهێنرێت، کە گۆشتیان دەخورێت، بەڵام دوای کردارەکە گۆشتەکەیان بە کەڵکی خواردن نایەت، چونکە کرداری (کوشتن)یان بەسەردا جێبەجێ کراوە، نەك (کوشتنەوە) یان (سەربڕین).

کورد بۆ کۆتاییهێنـان بـە ژیـانی ئـەو گیاندارانـەی، کـە گۆشـتیان دەخورێـت (بـە مەبەسـتی خـواردنی گۆشـتەکەیان)، (کوشـتنەوە)ی بـەکارهێناوە. (کوشـتن) و (کوشتنەوە) دوو چاوگی جیاوازن لە ڕووی ڕۆنان و واتاوە.

لە ڕووی ڕۆنانەوە (کوشتن) چاوگێکی سادەیە و ڕەگـی داهـاتووی بریتییـە لـە (کـوژ) و ڕەگـی ڕابردووەکەشـی (کوشـت)ە. هەرچـی (کوشـتنەوە)یە، چـاوگێکی داڕێژراوە لە (کوشتن+ەوە) پێکهاتووە و ڕەگی داهاتووی بریتییە لـە (کـوژ..ەوە) و ڕەگی ڕابردووەکەشی (کوشت..ەوە)[29]یە. (ەوە) پاشگرێکی وشەداڕێژە و ((بە ڕەگ و قـەدی کـارەوە دەنووسـێ و واتـای جیـا دەبەخشـێ))[30]. بۆیـە لێرەشـدا واتایەکی نوێی بە (کوشتنەوە) داوە.

لە ڕووی واتاوە ئـەم دوو چـاوگە واتـای جیـاواز دەگەیـەنن، (کوشـتن)، وەك لـە سـەرەوە بـاس کـرا، بـۆ لـەناوبردنی مـرۆڤ و گیانلەبـەر بـەکار دەهێنرێـت لەلایـەن بکەرێکـەوە، بـەڵام (کوشـتنەوە)، بریتییـە لـە لێکردنـەوەی سـەری گیانـدار لـە لاشەکەی و تەنیا بۆ ئەو گیاندارانـە بـەکار دەهێنرێـت، کـە ئـاین و کۆمـەڵ ڕێ بـە خواردنی گۆشتەکەیان دەدات.

ئەم دوو کردارە بە ئامێری جیاواز ئەنجام دەدرێن، (کوشتن) بە جۆرەها ڕێگـا و ئـامێری وەك (بـەرد، دەرمـان، چـەك، چـەقۆ ...) ئـەنجام دەدرێـت، بـەڵام (کوشتنەوە) تەنیا بەهۆی (تیغ)ەوە تەنیا لەلایەن مرۆڤەوە ئەنجام دەدرێت.

وشەی (کوشتار)، کە (کوشت+ار)ە و بە هەمان یاسای (ڕەگی ڕابردوو+پاشـگر) دروست کراوە و بە واتای ((کوشتنی دەستەجەمعی، کوشتنی بە کۆ))[31] دێـت و زیاتر بۆ کوشت و بڕی مرۆڤ بەکار دەهێنرێـت بـەهۆی جەنگـەوە، وەك دەگوترێـت (لە جەنگی عێراق و ئێراندا کوشتارێکی زۆر بوو)، بۆیـە واتایـەکی نـەرێنی هەیـە و ناکرێـت بخوازرێـت بـۆ سـەربڕینی ئـاژەڵ و پەلـەوەر و زاراوەی (کوشـتارگە)ی لێ دروست بکرێت. بەپێچەوانەوە لە زمانی عەرەبیدا (مجزرە) کـە شـوێنی سـەربڕینی ئاژەڵ و پەلـەوەرە بەمەبەسـتی پیشـاندانی دڕنـدەیی هێزێـك بـۆ کوشـتاری مـرۆڤ دەخوازرێت، بۆئـەوەی پیشـان بـدرێت، کـە مـرۆڤ وەکـو ئـاژەڵ مامەڵـەی لەگەڵـدا کراوە، لەکاتێکدا مرۆڤ سەربڕینی لەسەر نییە.

هەندێك جار لە بری (کوشتارگە) زاراوەی (سەربڕخانە) بەکار دەهێنرێت، کە ئەمەیان گونجاوترە، چونکە زاراوەکە هەمان واتای مەبەست دەگەیەنێت، کە شوێنی سەربڕینە. لە رووی ڕۆنانیشەوە، لە (سەربڕ= ڕەگی سەربڕین[٣٢]) و پاشگری (خانە) دروست بووە، کە دەچێتە سەر (ڕەگ، ناو..) و مەبەستی شوێن دەگەیەنێت، وەك (سەرتاش[٣٣]+خانە، نەخۆشخانە).

**سێیەم: کاتژمێر**

وشەیەکی لێکدراوە و لە (کات+ژمێر) دروست بووە، کە (کات) ناوە و (ژمێر) ڕەگی چاوگی تێپەڕی (ژماردن)ە. لە زمانی کوردیدا بەم یاسایە (ئاوەڵناوی بکەر) دروست دەکرێت[٣٤]، کە وەکو ناو بەکار دەهێنرێت[٣٥]، وەك (ڕۆژنامە+نووس، ماسی+گر، سەر+تاش...).

ئاوەڵناوی بکەر بە چەندین ڕێگا دروست دەکرێت[٣٦]، ئەم دوو ڕێگەیە لە کاری تێپەڕدا بەکار دەهێنرێت[٣٧]:

١– ڕەگی کار+ مۆرفیمی (ەر): نووس+ ەر= نووسەر .. ئەو کەسەی، کە دەنووسێت.

٢– ناو+ڕەگی کار: ڕۆژنامە+نووس= ڕۆژنامەنووس.. ئەو کەسەی، کە ڕۆژنامە دەنووسێت.

ئاوەڵناوی بکەر چەمکێك بەدەستەوە دەدات ، کە ئەنجامدەری ئەو کارەیە، کە ڕەگەکەی لە پێکهاتی وشەکەدا هەیە، ئەگەر بە ڕێگای دووەم دروست کرابێت، کارەکە بەسەر ئەو ناوەدا دەهێنێت، کە لە پێکهاتەی وشەکەدایە. بۆ نموونە (ڕۆژنامەنووس) کەسێکە، کە کاری نووسینی ڕۆژنامەیە، (کاتژمێر)یش ئامێرێکە، کات دەژمێرێت. بۆیە بەکارهێنانی زاراوەکە بۆ ئامێری ژمێرەری کات دروستە و لە جێگای خۆیەتی.

لە زمانی ئێستای کوردیدا زاراوەی (کاتژمێر) جگە لەوەی بە واتای ئامێرەکە بەکار دەهێنرێت، بە واتای ماوەیەکی کاتیش بەکار دەهێنرێت، کە بریتییە لە (٦٠ خولەك). بەمەش زاراوەیەکی فرەواتا دروست بووە، کە واتایەکی بریتییە لە (ناوی ئامێرەکە) و ئەوی تریان بریتییە لە (ماوەی کاتەکە). ئەمەش لەلایەکەوە لە زاراوەسازکردندا پەسند نییە، چونکە پێوستە یەك زاراوە بۆ یەك چەمك

دابنرێت[٣٨]، لەلایەکی تـرەوە دروستـکردنی زاراوەکـە بـەپێی یاسـاکەی سـەرەوە تـەنیا واتـای ئامێرەکـەی لێ هەڵـدەهێنجرێت، کـە ئەنجامـدەری ژمـاردنی کاتـە و ناتوانێت ببێتە ناوی کاتێکی دیاریکراو.

لـە زمانەکـەدا جگـە لـەو زاراوەیـە کۆمـەڵێك زاراوەی تـری وەك (چـرکەژمێر، ڕۆژژمێر..) هەیـە، کـە بەهـەمان شـێوە (چـرکەژمێر) چـرکە دەژمێرێـت و ناکرێـت بگوترێت (دە چرکەژمێر چاوەڕێم بکە)، هـەروەها (ڕۆژژمێـر) ڕۆژ دەژمێرێـت، یـان تۆمـاری ژمـاردنی ڕۆژی تێدایـە و چـەند ڕۆژێـك (هەفتـە یـان مـانگ یـان سـاڵ) پێکدەهێنێت، ناکرێت لە بری هەفتە یان مانگ یان ساڵ بگوترێت (سێ[٣٩] ڕۆژژمێر لە سەفەردا بووم)، بۆیە ناشکرێت بەهۆی ئـەوەی (کاتـژمێر) کـات دەژمێرێـت، بـە ماوەیـەکی دیـاریکراوی کـات بگوترێـت (کاتـژمێر) و ئەگـەر بڵـێین، (سـێ کاتـژمێر چـاوەڕێم کـردی) واتـای ئـەوە دەگەیـەنێت، کـە (سـێ ئـامێری کاتـژمێر چـاوەڕێم کردی)، کە ئەمەش هیچ واتایەك ناگەیەنێت.

پێدەچێت ئەم بەکارهێنانەی زاراوەکە لەژێر کاریگەریی زمـانی عـەرەبی بێـت، کە بۆ ئامێرەکە و بۆ کاتەکە هـەمان زاراوە بـەکاردەهێنن، کـە (سـاعة)یـە، بـەڵام چـەمکی زاراوە دروسـتکراوەکە لـە زمـانی کوردیـدا ناگونجێـت وەکـو نـاوی کـات بـەکاربهێنرێت، بـەڵکو دەبێـت بـۆ نـاوی کاتەکـە زاراوەیـەکی تـر بـەکاربهێنرێت، هەروەك لە زمانی ئینگلیزیدا بۆ ئامێرەکە (watch/ clock) بەکار دەهێنرێـت و بـۆ ماوەی کاتەکە (hour) بەکار دەهێنرێت، وەك لەم نموونانەدا دیارە:

(سێ ئامێری سەعاتم کڕی) I bought three watches/clocks

(ماوەی سێ سەعات چاوەڕێم کرد) I waited for three hours

بۆیە وا باشترە بۆ کاتەکە زاراوەیەکی تـر دروسـت بکرێـت، کـە پڕبـە پێسـتی واتاکە بێت. لە هەڵبژاردنی وشەکەشدا خۆمـان بپـارێزین لـە وشـەی فرەواتـا[٤٠] و زاراوەیەکی سەربەخۆی ڕوونی بـۆ دابنـێین، (کاتـژمێر) بـۆ ئامێرەکـە بـەکاردێت و توانای گەیاندنی واتای ماوەیەکی دیاریکراوی کاتی نییە.

**چوارەم: پیسایی**

زۆر جار ئـەم وشـەیە بـە واتـای خـۆڵ و خاشـاك و زبـڵ بـەکار دەهێنرێـت و دەگوترێت (پیسـایی فـڕێ مـەدەن، پیسـایی لـە سـەیرانگاکان جـێ مـەهێڵن ...)،

کەچی ئەم وشەیە لە کوردەواریدا بە واتای پاشەڕۆی مرۆڤ بەکار دەهێنرێت. بۆ پاشماوە و خۆڵ و خاشاك (پیسی) بەکار دەهێنرێت، نەك (پیسایی). لەڕووی ڕۆنانەوە هەردوو وشەکە داڕێژراون و هەردووکیان لە (ئاوەڵناو+پاشگری وشەداڕێژ) پێکهاتوون، (پیسایی) لە (پیس+ایی) دروست بووە و (پیسی) لە (پیس+ی) پێکهاتووە. کێشەکەش لە پێکهاتندا نییە، بەڵکو لە بەکارهێنان و لە واتادایە. ڕەنگە بگوترێت، کە (پیسایی) دەتوانێت واتای خۆڵ و خاشاك و شتی پیس بدات، بەهۆی ئەوەی ڕەگی وشەکە (پیس)ە و بەهۆی پاشگرەکەوە بووە بە (ناو)، بەڵام پێشتر ئەو وشەیە لە زمانەکەدا هەبووە و واتاکەی چەسپیوە، کە مرۆڤی کورد لە بری بەکارهێنانی وشەی (گوو)، کە سواوە و بە جوان دانانرێت و ڕووی مەجلیسی نییە و دەچێتە چوارچێوەی واتای ڕەنگدانەوە، ئەم جۆرە واتایەش ((بەزۆری لەو وشانەدا دەردەکەوێت، کە حەزیان لێ ناکرێت، یان مەترسییان لێ دەکرێت، ئەم جۆرە وشانەش لە زانستی زماندا بە ( Taboo words) ناو دەبرێت))[٤١] لەبەر ئەوە کورد وشەی (پیسایی) داڕشتووە. هەروەها وشەی (پیسی)یش هەر ڕەگی (پیس) و بە واتای شتی (پیس) دێت، بەڵام بە جۆرێکی تر داڕێژراوە و واتایەکی تری پێدراوە و وشەیەکی نوێی لێ بەرهەم هاتووە. بۆیە وشەی (پیسی)، کە لە کوردەواریدا بە واتای پاشماوە و خۆڵ و خاشاك بەکارهاتووە، لەبارە بۆ ئەوەی وەکو زاراوەیەك لە بەرامبەر (اوساخ)ی عەرەبی لەلایەن شارەوانییەوە بەکاربهێنرێت و وشەی (پیسایی)، جگە لەوەی واتایەکی تری هەیە و ناتوانێت ئەو مەبەستە بگەیەنێت، ناشکرێت، بکرێت بە زاراوە بۆ هەمان مەبەست، چونکە ((نابێ بۆ تاقە مەبەستێك و یەك واتا پتر لە یەك زاراوە بەکار بهێنرێت))[٤٢]. هەروەها یەکێك لە بنەماکانی زاراوەسازکردن بریتییە لە ((خۆپاراستن لە فرەواتایی یەك زاراوە لە بوارێکدا))[٤٣].

**پێنجەم: ڕاهێنەر (مطبق)**

زاراوەی (ڕاهێنەر)، لە بنەڕەتدا (ئاوەڵناوی بکەر)ە، کە لە (ڕاهێن+ەر) پێکهاتووە، کە (ڕاهێن)، (ڕەگ)ی چاوگی (ڕاهێنان) و (ەر) مۆرفیمی ئاوەڵناوی بکەرە. ئاوەڵناوی بکەر بە ناوەکەیدا دیارە، کە سیفەتی (ئەنجامدەر)ی هەیە، بۆیە (ڕاهێنەر) کەسی تر ڕادەهێنێت، وەك ئەوەی ڕاهێنەری وەرزشی یاریزانان

ڕادەهێنێت، کەچی ئەم وشەیە کراوە بە زاراوە لە بەرامبەر (**مطبق**)ی عەرەبیدا بۆ ئەو مامۆستایانە بەکاردەهێنرێت، کە ڕاهێنان دەکەن لە وانە گوتنەوەدا. هەرچەندە لە زمانی عەرەبیدا (**مطبق**) وەکو (**مدرب**) ئاوەڵناوی بکەر (اسم فاعل)ە، بەڵام (**مطبق**) کارێك بەسەر خۆیدا جێبەجێ دەکات و (**مدرب**) خەڵکی تر ڕادەهێنێت.

ئەگەر (ڕاهێنراو)یش بەکار بهێنرێت، ئەوا وشەکە دەبێتە (ئاوەڵناوی کراو)، کە کرداری بەسەردا جێبەجێ دەکرێت و بە ناوەکەیدا دیارە کە (کراو)ە، نەك (بکەر). (ڕاهێنراو) لە (ڕاهێن+ر+ا+و) دروست بووە، کە (ڕەهێن) ڕەگی (ڕاهێنان)ە و (ر) مۆرفیمی بکەر نادیارە و (ا) مۆرفیمی کاتی ڕابردووە و (و) مۆرفیمی ئاوەڵناوی کراوە[٤٤]، بەو پێیە وشەکە بەهۆی مۆرفیمی ئاوەڵناوی کراوەوە دەبێتە سیفەت (وەسف، ئاوەڵناو) بۆ کەسێك. سیفەتەکەش ئەوەیە، کە لەلایەن کەسێکی نادیارەوە لە ڕابردوودا ڕاهێنراوە. واتە لێرەشدا سیفەتی بەرکاریی هەیە و کارەکەی بەسەردا هێنراوە، بەڵام لە ڕاستیدا (**مطبق**) خۆی خۆی ڕادەهێنێت، بۆیە پێشنیاز دەکەین، زاراوەیەکی وەك (ڕاهێنانکار)ی بۆ بەکار بهێنرێت، کە وشەی (کار) چووەتە سەر چاوگی (ڕاهێنان)، وەك (ڕاگەیاندنکار، خوێندکار[٤٥]..)، کە خۆیان کاری خۆیان ئەنجام دەدەن. (ڕاهێنانکار)یش نە خەڵك ڕادەهێنێت، نە ڕادەهێنرێت، بەڵکو خۆی ڕادەهێنێت.

**شەشەم: بازاڕگا (اسواق)**

وشەی (بازاڕگا) لە بەرامبەر (**اسواق**)ی عەرەبی بەکار دەهێنرێت، کە (**اسواق**) کۆکراوەی (سوق)ە. لە زمانی کوردیدا (بازاڕ) لە بەرامبەر (سوق) بەکار دەهێنرێت و (بازاڕگا) بۆ مەبەستی یەکەیەکی بازاڕ (دووکانێکی گەورە) دروست کراوە . وشەی (بازاڕ) خۆی واتای شوێنی شت فرۆشتن، یان کۆمەڵێك فرۆشگا دەگەیەنێت و پاشگری (گا/گە)یش دەچێتە ناو، چاوگ ... و ناوی شوێن دروست دەکات[٤٦]. بەم پێیە (بازاڕگا) دوو چەمکی شوێنی تێدایە، چەمکێك لە (بازاڕ)دایە، کە شوێنی فرۆشتنە، ئەوی تر لە (گا)دایە، بۆیە واتای فەرهەنگیی (بازاڕگا) دەبێتە (شوێنی بازاڕ)، نەك وەکو (اسواق) (کۆکراوەی بازاڕ) بێت، وەك چۆن (لەوەڕگا) شوێنی لەوەڕ دەگەیەنێت. ئەمەش لەڕووی واتا و ژیربێژییەوە

نەگونجاوە، چونکە (دووکان) شوێنی (بازاڕ) نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە (بازاڕ) شوێنی چەندین (دووکان)ە. هەروەها (بازاڕ) گشت (کل)ە و دووکان بەش (جزء)ە، بەڵام بە پێچەوانەوە لە واتای (بازاڕگا)دا وا هەست دەکرێت، کە (بازاڕ) بەشێك بێت لە (بازاڕگا). بۆیە وشەی (بازاڕگا) بۆ واتای (دووکان) یان فرۆشگایەکی تایبەت نەگونجاوە و ئەو واتایەش ناگەیەنێت، کە (اسواق)ی عەرەبی دەیگەیەنێت.

دروستە وەکو (ئاوەڵناوی کراو).

**حەوتەم: ناوچە دابڕاوەکان، ناوچە دابڕێنراوەکان**

لە دوای ئازادیی عێراقەوە گرێی (ناوچە دابڕاوەکان) بۆ ئەو ناوچانە بەکار دەهێنرێت، کە بەشێکن لە کوردستانی عێراق و لە دەرەوەی سنووری هەرێمن. بەم دواییە هەندێك لە کەناڵەکانی ڕاگەیاندن (ناوچە دابڕێنراوەکان) بەکاردەهێنن، بەڵام لای هەندێکیان (دابڕاوەکان) هەر ماوە. هەردوو وشەی (دابڕاو) و (دابڕێنراو) ئاوەڵناوی کراون، بەڵام وشەی یەکەم لە چاوگی (دابڕان)ەوە هاتووە و وشەی دووەم لە چاوگی (دابڕاندن)ەوە هاتووە. (دابڕان) چاوگێکی تێنەپەڕە و پێویستی بە یەك کەرەستە هەیە، کە بۆی دەبێتە بکەر، وەك (من دابڕام ..من: بکەرە)، بەڵام چاوگی (دابڕاندن) تێپەڕە و پێویستی بە دوو کەرەستە هەیە (بکەر و بەرکار)، وەك (من بەرخەکانم لە مەڕەکان دابڕی.. من: بکەرە، بەرخەکان: بەرکارە).

ئەگەر لە (ناوچەکان) و (دابڕان) ڕستە دروست بکەین، ئەوا ڕستەکە دەبێتە (ناوچەکان دابڕان..ناوچەکان: بکەرە)، بەڵام کاتێك (دابڕان) دەکرێتە (ئاوەڵناوی کراو) دەبێتە (دابڕاو) و واتای سیفەتێك دەگەیەنێت، کە بکەرەکە لە ڕابردوودا بەسەرخۆیدا هێناوە و ((مۆرفیمی (و) جێگەی ئەو بکەرە دەگرێتەوە))[٤٧]، پاشان ئەو سیفەتە دەخرێتە پاڵ (ناوچەکان) و دەبێتە دیارخەری و گرێی (ناوچە دابڕاوەکان) دروست دەبێت، کە واتاکەی دەبێتە (ئەو ناوچانەی، کە خۆیان دابڕیوە).

ئەگەر لە (دابڕاندن) ڕستە دروست بکەین، پێویستمان بە بکەر و بەرکار دەبێت. (ناوچەکان) دەکرێتە (بەرکار)، چونکە کارەکەیان بەسەردا جێبەجێ

کراوە، بۆیە پێویستمان بە کەرەستەیەکی تر دەبێت بۆ ئەوەی ئەنجامدانی کارەکەی بخەینە پاڵ. ئەگەر (داگیرکەران) بکەینە بکەر، ئەوا ڕستەکە دەبێتە (داگیرکەران ناوچەکانیان دابڕاند .. داگیرکەران: بکەرە، ناوچەکان: بەرکارە).

لە کاری تێپەڕدا بە دوو جۆر ئاوەڵناوی کراو دروست دەکرێن [٤٨]:

١- یان بکەری لەگەڵدا باس دەکرێت، پاشان مۆرفیمی ئاوەڵناوی کراو دەخرێتە سەر ڕەگی ڕابردووەکە، وەك (بابردوو، گورگان خواردوو ...).

٢- یان کارەکە دەکرێتە بکەری نادیار، پاشان مۆرفیمی ئاوەڵناوی کراوی دەخرێتە سەر، وەك (براو، خوراو، کراو...).

بۆیە ئەگەر لە چاوگی (دابڕاندن) ئاوەڵناوی کراو دروست بکەین و بیکەین بە سیفەتی ئەو ناوچانە، ئەوا بەپێی یاسا وشەکە یان دەبێتە (داگیرکەران دابڕاند+وو) وەك (بابرد+وو، گورگان خوارد+وو ...)، یان دەبێتە (دابڕێن+ر+ا+و = ڕەگ + مۆرفیمی بکەر نادیار + مۆرفیمی ڕابردوو+ مۆرفیمی ئاوەڵناوی کراو). ئەم ئاوەڵناوەش دەبێتە سیفەتی شتێك/شوێنێك/کەسێك..، کە لە ڕابردوودا لەلایەن کەسێکی نادیارەوە جیا کراوەتەوە.

بەهۆی ئەوەی، ئەو ناوچانە خۆیان بکەری دابڕانەکەیان نین، یان نەتەوەی کورد وای نابینێت، بۆیە نابێت ناوی (ناوچە دابڕاوەکان)یان لێ بنرێت، چونکە ((بیروباوەڕ و بیرکردنەوە لە (ناونان) ڕەنگ دەداتەوە، ..کاتێ مرۆڤ ناو لە شتێ یان کەسێك یان ڕووداوێك دەنێت، چۆنی دەبینێت، ئاوا ناوی لێ دەنێت))[٤٩].

بۆیە ناوەکە لە چاوگە تێپەڕەکە دروست دەکرێت، کە بکەرەکەی خەڵکی ترە و بەرکارەکەی (ناوچەکان)ە. بەهۆی ئەوەی بکەری دابڕانەکەیان تاکە کەسێك/ هێزێك/لایەنێك نییە و بۆ ئەوەی ناویان نەهێنرێت و کورتبڕی بکرێت، بکەرەکە نادیار دەکرێت و سیفەتی (دابڕێنراو) دەدرێتە پاڵ (ناوچەکان) و گرێیەکە دەبێتە (ناوچە دابڕێنراوەکان) و ئەمەیان دروستترە.

## ئەنجامی لێکۆڵینەوە:

١– هەندێك وشە و زاراوەی نویێ لە ڕاگەیاندنەکاندا زۆر بەکاردێن و بڵاو بوونەتەوە، کە لە سازکردنیاندا پەیڕەوی دەستووری زمانی کوردی نەکراوە.
٢– هەنـدێك وشـە و زاراوەی ڕەسـەن لـە زمـانی کوردیـدا بـوونی هەیـە، بـەڵام ڕاگەیاندنەکان وشە و زاراوەی نوێیان بۆ هەمان چەمك دروست کردووە.
٣– هەندێك زاراوەی دروستکراوی نویێ هەن، کە فرەواتان و بۆ زیاتر لە چەمکێك بەکار دەهێنرێن، ئەمەش لە زاراوەسازیدا پەسند نییە، چونکە لێڵی دروست کردووە.
٤– لە سازکردنی هەندێك زاراوەدا پەیڕەوی دەسـتووری زمـانی کـوردی کـراوە، بـەڵام لەڕووی واتا و بەکارهێنانەوە مەبەستەکەی نەپێکاوە.

## پوختەی لێکۆڵینەوەکە

دەبێـت زمـان لەگـەڵ پێشـکەوتن و گـۆڕانی کۆمەڵـدا بـڕوات و فـراوان بێـت، لەهـەر سـەردەمێکدا ئەوەنـدە وشـە و زاراوە بخاتـە بەردەسـت بەکارهێنـەرانی، تـا بتـوانن بەهۆیـەوە کـاری خۆیـان ڕایـی بکـەن و گرفتـی ئـەوەیان نـەبێت لـەبارەی چـەمك و کەرەستەکانی دەوروبەرەوە بدوێن. بۆ ئەمەش پێویستە بەردەوام وشـە و زاراوەی نـویێ لـەدایك بێـت. زمـانی کـوردیش وەك هـەر زمـانێکی زینـدووی تـر لـە کۆنـەوە ئـەو زیندوویەتییەی تێدابووە و خۆی لەگەڵ سەردەمدا گونجاندووە. لـەم سەردەمەشـدا، کـە ژیان زۆر ئاڵۆز بووە و کەرەستە و بیر لەڕادەبـەدەر زۆربوونـە، پێویسـتە ئـەو پرۆسـەیە بەردەوام و چالاکتریش بێت، بەڵام وشـە و زاراوە نوێیـەکان پێویسـتە لـە ژێـر ڕۆشـنایی هەنگاوەکانی پێشتردابن و بەپێی دەستووری زمانەکە و ڕێگا دیاریکراوەکانی ئـەو بـوارە دروستبکرێن.

لـەم لێکۆڵنەوەیـەدا لـە هەنـدێك لـەو وشـە و زاراوە نوێیانـەی زمـانی کوردیمـان کۆڵیوەتـەوە، کـە بـەم دواییـە دروسـت کـراون و لـە ڕاگەیانـدن و بـاری فەرمیـدا بەکاردەهێنرێن و لەڕووی پێکهاتنەوە بـەر یاسـاکانی زمانەکـە ناکـەون، یـان لـە جێگـای خۆیانـدا بـەکارناهێنرێن. یـان واتـای مەبەسـت نـادەن بەدەسـتەوە و هەنـدێکیان واتـای نەرێنی(سلبی) و نەگونجاویان هەیە. لێکۆڵینەوەکە لە دوو بـەش پێکهـاتووە، لـە بەشـی یەکەمـدا بـەکورتی لـەبارەی زاراوە و ئـەو مـەرج و پێویسـتییانەی، کـە پێویسـتە لـە زاراوەسـاز و وشـە و زاراوەی نوێـدا هـەبن، دواویـن. بەشـی دووەم دوو تەوەرەیـە، لـە تـەوەرەی یەکەمـدا ئـەو وشـە و زاراوانـەمان شـی کردووەتـەوە، کـە لـەڕووی ڕێزمـانی و پێکهاتنەوە کێشەیان هەیە، تەوەرەی دووەم تایبەتە بەو وشە و زاراوە نوێیانەی، کە لە ڕووی واتا و بەکارهێنانەوە نەگونجاون.

## لیستی سەرچاوەکان

١- ئەو وشانەی لە چاوگەوە وەردەگیرێن، ڕەفیق محەمەد شوانی (د)، دەزگای ئاراس، چاپخانەی خانی، دهۆك- ٢٠٠٨ . (ئەلیکترۆنی).
٢- ئیکۆنۆمی لە ئاستەکانی زمانی کوردیدا ، دەروون عەبدولرەحمان سالح ، لە بڵاوکراوەکانی ئەکادیمیای کوردی ، چاپخانەی حاجی هاشم - هەولێر - ٢٠١٢.
٣- بەرکولێکی زاراوەسازیی کوردی، جەمال عەبدول، چاپی دووەم، چاپخانەی خانی، دهۆك - ٢٠٠٨.
٤- پرۆژەی زاراوەی زانستیی کوردی، کەمال جەلال غەریب، دەزگای ئاراس، هەولێر-٢٠١٢.
٥- ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (مۆرفۆلۆجی)، بەشی یەکەم (ناو)، ئەورەحمانی حاجی مارف، چاپخانەی کۆڕی زانیاریی عێراق، بەغدا - ١٩٧٩.
٦- زاراوەسازیی پێوانە، مەسعود محەمەد، دەزگای ئاراس، هەولێر- ٢٠١١.
٧- زاراوەی کوردی، کامل حسن البصیر(د)، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی، ساڵی ١٩٧٩.
٨- زانستی زمان، عەلی عەبدولواحد ئەلوافی(د)، و. ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم(د)، چاپی یەکەم، هەولێر- ٢٠٠٧.
٩- چەند لایەنێکی مۆرفۆلۆجیی کوردی، محەمەد مەعرووف فەتاح(پ.د)، سەباح ڕەشید قادر(م)، چاپخانەی ڕوون، ساڵی ٢٠٠٦.
١٠- فەرهەنگی دەریا، ڕزگار کەریم. چاپی دووەم، چاپخانەی مەهارەت، تهران-٢٠١٠.
١١- فەرهەنگی هەمبانە بۆرینە، عەبدولرەحمان شەرەفکەندی (هەژار)، چاپی شەشەم، چاپخانەی (انتشارات)، تهران- ١٣٨٨.
١٢- هەندێ بابەتی زمان و ڕێنووسی کوردی، مەسعود محەمەد، چاپی یەکەم، دەزگای ئاراس، چاپخانەی ئاراس، هەولێر-٢٠١١.
١٣- واتاسازی، تاڵیب حوسێن عەلی، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر- ٢٠١١.
١٤- وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا، ئەورەحمانی حاجی مارف(د)، چاپی دووەم، لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاریی کورد، ساڵی ١٩٨٧.

## پەراوێزەکان

[1] زانستی زمان، عەلی عەبدولواحد ئەلوافی(د)، و.ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم(د) ، لا ٢٦٥

[2] زاراوەی کوردی، کامل حسن البصیر(د)، لا ١٧

[3] بڕوانە: زاراوەی کوردی، کامل حسن البصیر(د)، لا ٤١–٤٦.

[4] بڕوانە: زاراوەی کوردی، کامل حسن البصیر ، لا ٤١–٩٩، پرۆژەی زاراوەی زانستیی کوردی، کەمال جەلال غەریب، لا ٣٧–٧٥

[5] بەرکولێکی زاراوەسازیی کوردی، جەمال عەبدول، لا ٣٣

[6] زاراوەسازی پێوانە، مەسعود محەمەد، لا ١٦.

[7] پرۆژەی زاراوەی زانستیی کوردی، کەمال جەلال غەریب، لا ٧٧

[8] بڕوانە: پرۆژەی زاراوەی زانستیی کوردی، کەمال جەلال غەریب، لا ٧٦–٧٨، بەرکولێکی زاراوەسازیی کوردی، جەمال عەبدول، لا ٤٦–٤٩.

[9] بەرکولێکی زاراوەسازیی کوردی، جەمال عەبدول، لا ٣٣

[10] پرۆژەی زاراوەی زانستیی کوردی، کەمال جەلال غەریب، لا ١٤

[11] بڕوانە: وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا، ئاوڕەحمانی حاجی مارف.

[12] زاراوەی کوردی، کامل حسن البصیر ، لا ٤٢

[13] ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم (مۆرفۆلۆجی)، بەشی یەکەم (ناو)، ئەوڕەحمانی حاجی مارف، لا ١٠٩

[14] وشەڕۆنان لە زمانی کوردیدا، ئەوڕەحمانی حاجی مارف، لا٥١

[15] زاراوەی کوردی، کامل حسن البصیر ، لا ٤١

[16] زاراوەسازیی پێوانە، مەسعود محەمەد، لا١٦.

[17] هەندێك زمانەوان زاراوە عەرەبییەکەیان وەرگێڕاوە و (ناوی بکەر) بەکاردەهێنن.

[18] بڕوانە: فەرهەنگی دەریا، ڕزگار کەریم.

[19] زاراوەی کوردی، کامل حسن البصیر ، لا ٢٦

[20] ئیکۆنۆمی لە ئاستەکانی زمانی کوردیدا ، دەروون عبدالرحمن صالح ، لا ١٥

[21] فەرهەنگی هەمبانەبۆرینە، عەبدولرەحمان شەرەفکەندی (هەژار).

[22] بڕوانە: هەندێ بابەتی زمان و ڕێنووسی کوردی، مەسعود محەمەد، لا ٣٢٧–٣٣٥

[23] زاراوەی کوردی، کامل حسن البصیر ، لا ٤٢

[24] بەرکولێکی زاراوەسازیی کوردی، جەمال عەبدول، لا ٤٨

[25] پرۆژەی زاراوەی زانستی، کەمال جەلال غەریب، لا٢٠

[26] زاراوەسازیی پێوانە، مەسعود محەمەد، لا ١٧

[27] پرۆژەی زاراوەی زانستیی کوردی، کەمال جەلال غەریب، لا ١٢٠–١٢١

[28] ڕێزمانی کوردی، بەشی یەکەم (ناو)، ئەوڕەحمانی حاجی مارف، لا ١٢٨

[29] واتە، (ەوە) بەشێکە لە ڕەگەکە. بڕوانە: مۆرفیمە ڕیزمانییەکانی کار، عەبدوڵڵا حوسێن ڕەسول، لا ١٠٢

[30] چەند لایەنێکی مۆرفۆلۆجیی کوردی، محەمەد مەعرووف فەتاح (پ.د)، سەباح ڕەشید قادر (م)، لا ٧٦

[31] فەرهەنگی هەمبانەبۆرینە، هەژار

[32] لە هەمان کاتدا (ئاوەڵناوی بکەر)ە و وەکو ناویش بەکاردێت (قەساب)، وەکو (ترس)، کە ڕەگی (ترسان)ە و وەکو ناویش بەکاردێت ..

[33] ڕەگی (سەرتاشین)ە و وەکو ناویش بەکاردەهێنرێت بۆ کەسی سەرتاش (حلاق)

[34] بڕوانە: ئەو وشانەی لە چاوگەوە وەردەگیرێن، ڕەفیق محەمەد شوانی (د)، لا١٠٣(ئەلیکترۆنی).

[35] ڕێزمانی کوردی، بەشی یەکەم (ناو)، ئەوڕەحمانی حاجی مارف، لا ١٣٥

[36] بڕوانە: ئەو وشانەی لە چاوگەوە وەردەگیرێن، ڕەفیق محەمەد شوانی (د)، لا٧٤–١١١

[37] هەمان سەرچاوە، لا ٧٨، ١٠٣

[38] بەرکولێکی زاراوەسازیی کوردی، جەمال عەبدول، لا ٤٦.

[39] یان هەر ژمارەیەکی تر

[40] بەرکولێکی زاراوەسازیی کوردی، جەمال عەبدول، لا ٤٦.

[41] واتاسازی، تاڵیب حوسێن عەلی، چاپی یەکەم، لا ٢٦

[42] زاراوەی کوردی، کامل حسن البصیر ، لا ٢٤

[43] بەرکولێکی زاراوەسازیی کوردی، جەمال عەبدول، لا ٤٦

[44] بڕوانە: مۆرفیمە ڕێزمانییەکانی کار، عەبدوڵڵا حوسێن ڕەسول، لا ١٤٧

[45] وشەی (کار) چووەتە سەر (قەد)ی (خوێندن).

[46] ڕێزمانی کوردی، بەشی یەکەم (ناو)، ئەوڕەحمانی حاجی مارف، لا ١١٦

[47] مۆرفیمە ڕێزمانییەکانی کار، عەبدوڵڵا حوسێن ڕەسول، لا ١٤٦

[48] هەمان سەرچاوە، لا ١٤٧–١٤٨

[49] ڕەهەندی دەروونی لە بواری ڕاگەیاندندا، عەبدولواحید موشیر دزەیی(د)، لا ٧٧

**ملخص البحث**

لابد ان تتساير اللغة وتطور نتيجة التطورات المحيطة بها في المجتمع، وأن تقدم البنى والمصطلحات تقديما وافيا لمستخدميها في كل زمن، حتى يتمكنوا من سد حاجاتهم في التعبير عن الاشياء التي تحيط بهم، وهذا الغرض يتطلب توليد دائم ومستمر للكلمات والمصطلحات، واللغة الكردية كباقي اللغات الحية احتفظت بهذه الميزة الحيوية وواكبت تطورات العصر، وفي هذا العصر الذي تعقدت الحيات فيه وكثرت فيه الافكار وتنوعت بصورة لامحدودة ولا حصر لها، لابد أن تستمر هذا المشروع وتنهض به بصورة أدق، مع أن هذه العملية التوليدية للابنية والمصطلحات لابد أن تتوافق مع القوانين اللغوية الموجودة سابقا وفي ضوء تلك القواعد والخطوات المحدد من قبل اللغويين .

وفي هذا البحث حاولنا أن نبحث في بعض الابنية والمصطلحات التي تولدت متاخرة وشاعت في الاعلام والصحافة واستعملت بشكل رسمي، والتي لم توافق مع قوانين اللغة، أو لم يستخدم في مكانها الصحيح، او لاتعطي الدلالة المطلوبة وانما بعضها تدل على معان عكسية. وقد يتكون البحث من المبحثين، المبحث الاول خاص بالحديث عن المصطلح، والشروط المطلوبة لتوافرها في المصطلح عند توليده، والمبحث الثاني يتكون من مطلبين، تناولنا في الاول تلك المصطلحات التي أصابتها نوع من التحريف من الناحية القواعدية الشكلية، وفي الثاني فسرنا تلك التحريفات والتجاوزات اللغوية من الناحية الدلالية والاستعمال .

## Abstract

Language develops along with development and growth of the society. In every era language should provide the speakers with words and terminologies so that the speakers can do their everyday job and express their ideas about the concepts and their surroundings. To achieve this, new vocabularies are created. Kurdish language like any other living language in the world has had this feature and has adapted itself with the time. Nowadays, along with the intricacies of life and abundance of ideas, this process is continuing. The words and terminologies should be formed in the light of the previous steps and the rules of the language as well as the identified methods.

This research investigates some newly and recently formed words and terminologies used in the field of journalism and formal cases that according to formation and structure do not follow the rules of Kurdish language or are not used in appropriate situation or do not give the intended meaning and some of them have negative and unaccepted meanings.

The study is in two chapters. The first chapter is about the conditions and characteristics that new words and word-formers should have. The second chapter comprises two sections. The first section deals with those words that have problems concerning grammar and structure. The second section is about the new words and terminologies that are unaccepted concerning meaning or usage.

# بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتیی گەرمیان لە هەفتەنامەی (پێشکەوتن)دا (١٩٢٠-١٩٢٢)

م.ی. ئەحمەد محەمەد ناسر*
زانکۆی گەرمیان – فاکەڵتی پەروەردە

**دەسپێك**

لە شەڕی دەربەندی بازیانی بەناوبانگ بەدواوە، کە لە ڕێکەوتی ١٨ی حوزەیرانی ١٩١٩دا و لە نێوان سوپای بەریتانیا و هێز و سوارەکانی کورد بە ڕێبەرایەتی شێخ مەحموود (١٨٨١- ١٩٥٦) ڕووی دا و ئەنجامەکەی بە دەسگیرکردنی بە زامداری و دواتر دادگایی کردنی لە بەغدا و دوورخستنەوەی لەگەڵ چەند کەسایەتییەکی تر بۆ دوورگەی (**ئەندامان- هەنجام**)ی وڵاتی هیندستانی ژێر دەسەڵاتی بەریتانیا کۆتایی هات، هێزەکانی بەریتانیا بە شێوازێکی ڕاستەوخۆ کاروباری باشووری کوردستانیان، بە تایبەتی شاری سلێمانی کە بنکەی فەرمانڕەوایەتی شێخ مەحموود بوو، کەوتە ژێر دەسەڵات، لێرە بەدواوە ئیلی بانیستەر سۆن، واتە مێجەرسۆن ( ١٨١٨-١٩٢٣) [1] ، کە پێشتر بە ناوی خواستراوی (**میرزا غولام حوسێنی شیرازی**)یەوە هاتبووە کوردستان و ناوچە کوردنشینەکان، لەلایەن بەریتانیاکان خۆیانەوە دەسەڵاتی ڕاستەوخۆی بۆ فەراهەم کرا، تا کاروباری ناوچەکە بەڕێوەبەرێ، لە هەمان کاتدا و لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی شێخ مەحمووددا ئەم کەسایەتییە بۆ خۆی بە یەکێك لە نەیارو دوژمنە سەرسەختەکانی شێخ مەحموود دەناسرا ، بەڵام وەکتر بۆ هێورکردنەوەی بارودۆخەکە و تا ڕادەیەك ئارامیی شاری سلێمانی و دەوروبەری، ئینگلیزەکان ، بەتایبەتی کەسێکی وەك (**مێجەر سۆن**) کەوتنە ئەوەی هەندێ هەنگاوی پێویست بنێن و لە ڕووی چاکسازییەوە بایەخێکی زیاتر بە شاری سلێمانی و ناوچەکە بدەن. بە تایبەتی دوای ئەو نەهامەتی و برسێتی و گرانی و باجەی کە لە ساڵانی جەنگی یەکەمی جیهانی (١٩١٤-١٩١٨) و دوای جەنگیش

ئەرکی سەرشانی کۆمەڵانی خەڵکی زیاتر قورس و گرانتر کردبوو. جگە لەوەش بایەخیان، بە زمانی کوردی، بە خوێندن دا، نەهێشتنی دیاردەی ڕێگرتن و قەرزدان بە جووتیار و چاککردنەوەی مزگەوتەکان و بایەخدان بە هۆیەکانی هاتوچۆ و ڕێگاوبان و بنەبڕکردنی دزی و ڕاووڕووت و کارکردن بە یاسای سزاکان و بڵاوکردنەوەی هەندێ داب و هەڵسوکەوتی نوێ جگە لە :((**دامەزراندنی ئەنجومەنی شار**)) [٢]. لە شاری سلێمانیی ئەو کاتەداو کۆتاییهێنان بە هەندێ دیاردەی دزێوی ئەوتۆ کە لەگەڵ هەلومەرجی کوردستان و ناوچە کوردنشینەکاندا نەدەگونجا.

یەکێك لەو هەنگاو و بەتەنگەوە چوونانەی دی کە فەرمانڕەوایانی بەریتانیا نایان بۆ ڕاییکردنی کارەکانیان هێنانی چەند چاپخانەیەکی کۆن بوو بۆ ناوچەکە، لەوانە عێراق و باشووری کوردستان ، ئەوەبوو یەکێك لەو چاپخانانە، لەسەر پێشنیازی (**مێجەر سۆن**)، هێنرایە شاری کەرکوك و یەکێکی کەشیان ئەوەیان بوو کە هەر سۆن خۆی لەوە بەدواوە هێنایە شاری سلێمانی، هاوکات لەو دەمانەدا توانی چەند خوێندەوارێکی دیاری ئەوکاتەی وەك: شێخ مەجیدی شێخ عارف، ئەدیب عەزیز و محەمەد زوهدی قایل بکات کە ڕاییکردنی کاروباری چاپخانەکە بگرنە ئەستۆ، لەم بوارەشدا یەکێك لە کارەکانی سۆن ئەوەبوو کە بتوانێ لە ماوەی دەسەلاتیدا و لە نێوان سالانی (١٩٢٠– ١٩٢٢) هەفتەنامەی (**پێشکەوتن**)ی بە زمانی کوردی پێ چاپ و بلاو بکاتەوە و پاشان بە سلێمانی و ناوچەکانی دەوروبەریدا بیگەیەنێتە خوێنەر و کۆمەلانی خەلك، هەروەها هەفتەنامەکە، شانبەشانی ئەوەی کە زمانحالی فەرمانڕەوایەتی بەریتانیا بوو لە باشووری کورستان و شاری سلێمانیدا، لەگەڵ ئەوەشدا بووبووە مایەی ئەوەی کە گەلێك نووسەر و ڕووناکبیر و شاعیری ئەو کاتەی کورد و بەتایبەتی باشووری کوردستان و شاری سلێمانی، وەك: ((**جەمال عیرفان، شێخ نووری شێخ سالح، جەمیل سائیب، زەکی سائیب، تۆفیق وەهبی، ڕەفیق حیلمی، سەعید سدقی، ڕەشید زەکی، تۆفیق فایەق، عەبدوللا سەبری، مستەفا قەرەداغی، ئەحمەد موختار بەگی جاف، ئەحمەد حەمدی ساحێبقران، زێوەر، بێخود، عەلی کەمال باپیر و زۆری دیش**)) [٣] بابەت و نووسینی خۆیانی بە بەردەوامی تیا بلاو بکەنەوە. کە ئەمەش بۆخۆی وەرچەرخانێکی گەورەی لە سیاسەتی بەریتانیا لە ناوچەکە بۆ ڕووناکبیرانی ئەوکاتەی کورد لەو سەروبەندەدا، هێنایە کایەوە کە بتوانن تا

ڕادەیەکی زۆر لە دەوری ئەو چاپخانە و هەفتەنامەیە کۆی دەکردنەوە و بەرهەم و نووسینەکانی خۆیانیان تیا بلأو دەکردەوە. هەر ئەم گردبوونەوە ڕووناکبیری و ئەدەبییەش لەدەوری ئەم هەفتەنامەیە بە تەواوی دەلالەتی ئەوەمان دەداتە دەستەوە کە بێ چەندوچوون بلێین: بواری ئەدەبی لە (**پێشکەوتن**)دا بە هەموو بەشەکانییەوە پشکی شێری بەرکەوتووە.[٤]

ئەوەی شایانی باسکردن بێ ڕۆژنامە یان هەفتەنامەی (**پێشکەوتن**)، بەپێی ئەو کۆکردنەوە و بەدواداچوون و لێکۆڵینەوەیەی کە لە لایەن خوالێخۆشبوو پرۆفیسۆر مارف خەزنەدار (١٩٣٠–٢٠١٠) پێشەکی بۆ نووسراوە، یەکەم ژمارەی لە: ((**١١ی شەعبانی ساڵی١٣٣٨ی کۆچی بەرامبەر بە ٢٩ی ئەپریلی ١٩٢٠ ڕۆژی پێنج شەممە بلأو کراوەتەوە و دوا ژمارەی کە ژمارە (١١٨)ی ساڵی سێیەمی بووە لە ٢ی زی الحجەی ساڵی ١٣٤٠ی کۆچی بەرامبەر بە ٢٧ی جولأی ١٩٢٢ هەر ڕۆژی پێنج شەممە بلأو کراوەتەوە**))[٥] و لە ژێر ناونیشانەکەشیدا نووسراوە هەفتەی جارێك دەردەچێت، بە جۆرێ تا ژمارە(٩٦)ی ٢٣ی شوباتی ١٩٢٢چوار لاپەڕە بووە و لە: ((**ژمارە ٩٧ی یەوە ٢ی مارتی ١٩٢٢ بۆتە شەش لاپەڕە بەجۆرێ پێشکەوتن تا گەڕانەوەی شێخ مەحموود لە ناوەندی ساڵی ١٩٢٢دا بەڕێکوپێکی دەرچووە**))[٦] جگە لەوەش وەك لەسەر هەموو ژمارەکانیدا دەردەکەوێت بە تەواوی ڕۆژانی پێنج شەموان بلأو کراوەتەوە و لە دوالاپەڕەی هەموو ژمارەکانیشیدا نووسراوە لە:(**چاپخانەی حکومەت لە سلێمانی چاپ کراوە**)، بەجۆرێ بە وەستانی هەفتەنامەی (**پێشکەوتن**) دواتر هەفتەنامەی (**بانگی کوردستان**)، کە زمانحاڵی (**جەمعیەتی کوردستان**)[٧] بووە و مستەفا پاشای یاموڵکی (١٨٦٦–١٩٣٦) [٨] بەڕێوەبەر و بەرپرسی یەکەمی بووە، جێگای گرتۆتەوە، مەبەستی سەرەکی توێژەر لەو کورتەنووسینە لەسەر هەفتەنامەی (**پێشکەوتن**) لەوەدایە ، ئەگەر بەخێرایی و کورتیش بێت، جەخت لەسەر ئەو بارودۆخ و هەواڵ و زانیارییانە بکاتەوە کە لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمی ڕابوردوودا، گەرمیان و ناوچەی گەرمیان بە خۆیەوەی بینیوە و تا ئەمڕۆش بە شێوازێکی یەکجار کەم نەبێ لێی نەکۆڵراوەتەوە. ئەم ناوچەیە هەر لەو کاتەوەی کە باری ئاوەدانی و نیشتەجێبوون تیایدا دەستی پێکردووە، بەزۆری ناوچەیەك بووە کە دانیشتووان و خەڵکەکەی بە ناوچەیەکی سەرکێش و بە ئاسانی ئەوەیان قبوڵ نەبووە کە ملکەچی دەسەلأت و فەرمانڕەوایان بن. ئەمەشیان بەزۆری لەو

كات و سەروبەندەوە سەرچاوەی گرتووە كە سەرەتاكانی جەنگی یەكەمی جیهانی دەستی پێكردووە و دەسەڵات و فەرمانڕەوایانی بەریتانیا هێرشی سەربازییان گەیشتۆتە ناوچەكە. چونكە هەر لەو دەمانە بەدواوە سوارەی كورد و تاكی كورد لە تەوەر (محور)ی گەرمیاندا بە تەواوی لەوانەبوون كە ڕووبەڕووی فەرمانڕەوایانی بەریتانیا بوونەتەوە، وەك دەبینی هەر لەو ماوەیەشەوە كە سوپای بەریتانیا گەیشتە عێراقی ئەوكاتەی ژێر فەرمانڕەوایەتی دەوڵەتی عوسمانی و باشووری كوردستانیش كە هێشتا بە هەمان شێوە لە ژێر دەسەڵات و فەرمانڕەوایەتی عوسمانیدا بوو.

بەڕادەیەك هەر لەم ماوەیەشدا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی داگیركاریی بەریتانیا چەكدار و سوارەی كورد لە زۆر ناوچەكانی باشووری كوردستانەوە، لەوانەبوون كە شانبەشانی ئەو هێزانەی كە شێخ مەحموود و چەند كەسایەتییەكی تری كورد لە ناوچە كوردنشینەكاندا كۆیان كردبوونەوە بۆ لێدان و بەرەنگاربوونەوەی سوپای بەریتانیا. لەنێویاندا ژمارەیەكی زۆر لە سوارەی كوردی خەڵكی گەرمیان و كەركووكیان لەگەڵدابوو. تەنانەت كەسایەتییەكی وەك: نامیقی عەلی ئاغای داودەی گەرمیان لەوانە بووە كە لە شەڕی شوعێبەی ١٢ی نیسانی ١٩١٥دا كوژراوە و لە هەمان كاتیشدا پێشتر یەكێك بووە لە نەیار و بەرگریكارێكی سەرسەختی بەریتانییەكان لە تەوەری گەرمیان و ناوچەكەدا.[٩] هەفتەنامەی (**پێشكەوتن**)یش وەك ئەوەی زمانحاڵی فەرمانڕەوایەتی بەریتانییەكان بووە لە شاری سلێمانی و دەوروبەریدا، وەكو پێشتر ئاماژەم بۆ كرد كەسایەتییەكی وەك (**مێجەر سۆن**) كە ساڵانی پێشتر بە شێوازێكی شۆفاری واتە (**جاسووسی**) هاتبووە كوردستانەوە، شارەزاییەكی بەرچاویشی لەسەر كورد و بارودۆخی كوردستان هەبوو، لە هەمان كاتدا كوردییەكی پوخت و ڕەوانی دەزانی، هاوكات بە خۆی ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی حوكمڕانییەتی دەكرد لە كوردستان و شاری سلێمانیدا، بەتایبەتی دوای دوورخستنەوەی شێخ مەحموود بە شێوازێكی ڕاستەوخۆ كاروباری گرتبووە ئەستۆ، لە هەمان كاتدا ئەم هەفتەنامەیەشی، لەم ماوەیەدا، لە شاری سلێمانیدا بڵاو كردەوە و هەندێ جاریش خۆی بابەت و نووسینی تیا بڵاو كردۆتەوە[١٠].

**بارو دۆخ و ڕووداوەکانی گەرمیان لە هەفتەنامەی ( پێشکەوتن )دا**

**یەکەم / ڕەنگدانەوەی ڕاپەڕینی ساڵی ۱۹۲۰ی گەرمیان لە (پێشکەوتن)دا**

ئەم هەفتەنامەیە لە بەشێکی زۆری ژمارەکانیدا، کە لەو سەروبەندەدا بڵاو کراونەتەوە، گەلێك ڕووداو و بابەتی ئەوتۆی بڵاو کردۆتەوە کە زۆر ڕووی شاراوەی ئەو کاتەی گەرمیان و ناوچەکەمان بۆ یەکلایی دەکاتەوە. هاوکات ئەوانەش بۆخۆیان کەرەستەیەکی خاوی گرنگن بۆ بابەتی مێژووی هاوچەرخی کورد لە بەشی باشووری کوردستاندا و زۆر ڕاستیی مێژوویی و قۆرتی وامان لەسەر لاپەڕەکانیدا بۆ یەکالا دەکاتەوە کە تا ئەمڕۆش نەمانتوانیوە بە پێی (**کرۆنۆلۆجیا**)یەکی مێژوویی ورد بۆی بچین و لێکدانەوەی پێویستیان لە بارەوە بکەین، بۆ نموونە لەو دەمانەدا کە ڕاپەڕینی ۳۰ی حوزەیرانی ۱۹۲۰ یان ( **شۆڕشی ۱۹۲۰ وەك زۆر لە مێژوونووسان بۆی چوون**) لە عێراقی ئەو دەمانەدا ڕووی دا و تا ڕادەیەکی زۆر ناوچە کوردنشینەکانی ئەو کاتەشی گرتۆتەوە، بە تایبەتی تەوەری گەرمیان، هەر لە شارەکانی کەرکوك، دووزخورماتوو، کفری و تەنانەت خانەقینی ئەو ڕۆژگارەشی لەگەڵدابێ، تا کۆتایی ئەو ڕاپەڕینە جەماوەرییە هەفتەنامەی (**پێشکەوتن**) یەکێك بووە لەو کەناڵ و سەرچاوە ڕاگەیاندنەی کە فەرمانڕەوایانی بەریتانیا، بەتایبەتی (**مێجەر سۆن**)، لە شاری سلێمانیدا بە بایەخەوە هەواڵەکانی ناوچە جۆربەجۆرەکانی بڵاو کردۆتەوە، چونکە هەفتەنامەی (**پێشکەوتن**) بۆ خۆی بە چەند مانگێك پێش ئەو ڕاپەڕینە دەس بە بڵاوکردنەوەی کراوە و زیاتر لە دوو ساڵی دوای ئەو ڕووداوەشەوە، بە بەردەوامی هەفتانە ژمارەکانی، هەموو ڕۆژانێکی پێنج شەموان، بەڕێکوپێکی دەرچووە، بەزۆری ئەو هەواڵانەشی کە پێشکەوتن بڵاوی کردوونەتەوە یان لە ڕێگای برووسکەوە لە ناوچە جۆربەجۆرەکانی عێراق و کوردستانەوە وەرگیراون یان لە ڕێگای ئاژانسی (**ڕۆیتەرز**)ەوە گوێزراونەتەوە. هەفتەنامەکە لە بەشێکی زۆری ژمارەکانیدا بۆ هەواڵە جیهانییەکان و بەشێك لە هەواڵە ناوخۆییەکان ئاماژەیان بەم لایەنە کردووە، وەك لە ژمارە (۱۸)یدا کە لە ٢٦ی ئابی ۱۹۲۰دا بڵاو کراوەتەوە، ئاماژەی بە ڕۆژگاری ڕاپەڕینی ۱۹۲۰ کردووە و نووسیویە: ((**دوێنێ واتە ۲۱**(ی ئاب) **لە دەوری بەعقوبە لە تەیارەوە بۆمبای زۆریان بە سەر عەرەبەکانی ئەو ناوەدا ڕژاندووە**)). جگە لەوە لە هەمان ژمارەدا لە بارەی کەرکوك و دەوروبەرییەوە ئەوەی ڕاگەیاندووە کە: ((**عاسی حسین عوبێد کە لە جەبەل حەمرینەوە هاتبو**

**گەڕایەوە شوێنی خۆی و لەوێ ئارامی گرت. هەموو مشایەخ تاڵەبانی مەجلسێکیان گرت و مەزبەتەیەکیان نارد بۆ لای حاکمی سیاسی کەرکوك، ڕاستی و یەکێتی خۆیان نیشاندا و حەز بەمە دەکەن ئەو پێنج ئاواییەی نزیك لەیلان کە ویستیان تاڵەبانی بەدناو بکەن تەمێ بکرێن))** [11].

بەڵام لە ژمارە (١٩)ی بەدواوە ڕووی گەلێك گۆڕانی ناوچەکە و بارودۆخی ناوچەکە لە هەواڵەکانی (**پێشکەوتن**)دا ڕەنگ دەداتەوە و بە وردی چاودێری ئەو گۆڕان و ڕووداوانەی کردووە کە چۆن بەریتانییەکان هێزەکانی خۆیان لەم دەوروبەرەدا کۆکردۆتەوە و سازیان کردووە بۆ ئەوەی هەر ڕووبەڕووبوونەوەیەکی دژ بە بنکەکانیان بوەستێتەوە یان کە هێرشیان بکرێتە سەر چۆن بەرپەرچی دەدەنەوە، وەك ئەوەی کاتێك چۆن توانیویانە ناوچەی بەعقووبە کۆنترۆڵ بکەن لەگەڵ ئەوەشدا زیاتر لەو ناوچانە نزیك بوونەتەوە کە بە زۆری کوردنشین بوون و لەگەڵ ئەوەشدا دانیشتووان و ئەوانەی دژیان وەستاون بە (دز و جەردە) و ڕێگر باسیان لێوە کردوون وەك لە ٢٦ی ئابی ١٩٢٠دا لە ڕێگای پێشکەوتنەوە جەختیان لە سەر ئەوە کردۆتەوە کە: ((**ئیشی بەعقوبە بە تەواوی بڕایەوە و کەس دیار نییە. عەسکەر هاتۆتە** (قەرەخان)[12] **کە ئەملای قزڕەباتە. دوێنێ نیوەڕۆ عەسکەری کەرکوك چوونە لای لەیلان ٣ دێیان بە تەواوی سوتان و تێك دا و چەن دز و جەردەیان گرت))** [13]، بە جۆرێ کورتەی ئەم هەواڵانە ئەوەمان دەداتە دەستەوە کە بەریتانییەکان لەوەدابوون زیاتر جێ پێی خۆیان لە ناوچە کوردنشینەکاندا بە هێز بکەن و بکەونە ئەوەی هێزی خۆیان و توانای سەربازیی خۆیان دژی ئەو هێز و خەڵکە ڕاپەڕیوانە بە کار بهێنن و ڕاوەدوویان بنێن کە بە بەردەوامی لە ناوچەکانی خۆیاندا بەرهەڵستییان کردووە، هەر بۆیە دەبینی بە پێی هەواڵێکی دواتر، کە ڕەنگدانەوەی ڕۆژی دواترە و لە هەمان ژمارەدا بڵاو کراوەتەوە، جەخت لە سەر ئەوە دەکاتەوە کە: ((**لەشکری عەسکەر لە کرندەوە گەیشتە قزڕەبات کە لەگەڵ ئەو عەسکەرەی لە بەغدادەوە هاتۆتە بەعقوبە یەك بگرن))** [14]. دیارە ئەم کۆکردنەوە و مۆڵدان و یەکخستنەوەی هێزی سەربازییەی کە بەریتانییەکان لە دەوروبەری شاری کرندی ئێرانەوە هێناویانەتە ناوچە کوردنشینەکانی باشووری کوردستان بە گەرمیانیشەوە. چونکە لەم ماوەیەدا بەشێکی گەورەی باشوور و ناوەڕاستی ئێران لە ژێر دەسەڵاتی بەریتانیادا بوو. جگە لەوەش بەریتانییەکان هێنانی ئەم هێزانەیان زیاتر بۆ پاکتاوکردن و

وەدەرنانی هێزی بەرگری ناوچەکە و پاڵپشتییان بۆ ئەو هێزانەشیان بووە کە لەو کاتەدا لە دەوروبەری کەرکووك و دووزخورماتووی ئەو کاتە حەشاریان داوە، بۆ ئەوەی فشار لە سەر ئەوانە کەم بکەنەوە، چونکە هەر لەو دەمانەدا، بە تایبەتی لە شارێکی ئاوەدانی وەك کفری ئەو کاتەدا، کەسایەتییەکی دیاری وەك ئیبراهیم خانی دەڵۆ (١٨٧٤– ١٩٢١) ماوەیەك کۆتایی بە دەسەلآت و نفووزی بەریتانییەکان هێنابوو لە شار و ناوچەکەدا. وێڕای ئەوەش وەك کەسێکی نەیار بەوان لە دەرەوەی شاری کفری مابووەوە و بەردەوام بە دوای خۆی و ئەو هێزانە گەڕاون کە لە ٢٢ی ئابی ١٩٢٠ەوە شاری کفری و دەوروبەریان لە دەسەلآتی بەریتانیا پاك کردبووەوە .

سەرەڕای ئەوەش بە هەمان هەڵوێست هێزێکی دی لە دەوروبەری دووزخورماتووەوە و بە ڕێبەرایەتی:((**ڕەفعەت بەگی داودە**))[١٥] پێش ڕزگارکردنی کفری ئەم شارەیان لە ٢٠ی ئابی ١٩٢٠ ەوە لە دەسەلآتیان پاك کردبووەوە، هەرچەندە ماوەی دەسەلآتیان لەم شارانەدا زۆری نەخایاندو، دووبارە لە لایەن بەریتانییەکانەوە داگیر کرانەوە، بەلآم ئەم ڕاپەڕینانە بۆ خۆیان لەو ڕۆژگارەدا جۆرە بەرپەرچدانەوەیەك بوون بە ڕووی دەسەلآت و داگیرکارییاندا و بە بایەخەوە حەق و حیسابی تایبەتییان لە سەر بارو دۆخەکە کردووە. لەم بارەیەشەوە دەبینی لە ڕووداوێکدا کە لە ٢٨ی ئابی ١٩٢٠دا ڕووی داوەو (**پێشکەوتن**) دواتر بلآوی کردۆتەوە کە چۆن هێزی سەربازییان لە دەوروبەری (**تاوغ**)ەوە، کە ئەمڕۆ ناوە فەرمییەکەی (داقووق)ە، بۆ ناوچەی داودە و دواتر بەرەو شاری دووزخورماتوو بوونەتەوە، وەك لە بارەیانەوە نووسیویە: ((**عەسکەر دوێنێ لە تاوغ بزووتن و لە ناو ڕێگادا چوونەتە ئاوایی ڕەفعەت بەگی داودە و لە پاش سەعاتێك شەڕ، ڕەفعەت بەگ خۆی و سوارەی ڕایان کرد، ئاوایی و دەغڵ و دان. درەخت و باغیان بە تەواوی سوتان کە هیچیان نەماوە لە پاشا چوونە دوز و هەندێ داودە لەوێ بوون ڕایان کرد**))[١٦] و بۆ سبەی و ڕۆژی دواتریش بە تەمای ئەوە بوون کە هێزەکانیان بەرەو قنگربان و ناوچەی کفری بکەنەوە. هەر چەندە لە لایەکی کەشەوە سوپای بەریتانیا کەوتوونەتە سووتانی دێهات و ناوچە ئاوەدانییەکانی دەوروبەری دووزخورماتوو وەك لە هەواڵێکی ڕۆژی دواتردا واتە لە ٢٩ی ئابی ١٩٢٠دا وای نووسیوە کە: ((**ئەمڕۆ ئاوایی تریان لە دوون**)) سووتاندبێ و دیارە کەسایەتییەکی وەك شێخ حەمیدی تاڵەبانیش بۆیە لەگەڵ ژمارەیەك لە

سوارەکانیدا خۆی گەیاندۆتە لای حاکمی سیاسیی کەرکوك بۆ ئەوەی ناوچەکەی خۆی لەو مەترسییانەی بەریتانییەکان دوور بخاتەوە و ویستوویەتی بەدەردی شوێنانی تر نەچێ . چونکە هەمان هەواڵ ئەوەی بەڕاشکاوییەوە باس کردووە کە:((**شێخ حەمیدی تاڵەبانی لەگەڵ سوارەکانی خۆی هاتۆتە لای حاکمی کەرکوك و پیاویشی ناردۆتە ناو زەنگەنە و داودە**))[17] و سەرەڕای ئەوەش لەو دەمانەدا سوپای بەریتانیا و ئەوانەی کە هاوکار و لەگەڵیاندا بوون ، بە تەواوی هەلی ئەوەیان بۆ هاتۆتە دەس کە بێ هیچ سڵەمینەوە و ترسێك دەس بەسەر ئەو ناوچە و دێهات و شارۆچکانەدا بگرنەوە کە پێشتر لە دەستیان داوە و هەواڵەکانی ئەو چەند ڕۆژەش کە یەك بە دوای یەك لە هەفتەنامەی پێشکەوتندا باسیان لێوە کراوە و هەلومەرج و بارو دۆخەکەیان بە وردی خستۆتە بەرچاو، وەك لە ٣٠ی ئابی هەمان ساڵدا حاکمی سیاسی بەریتانی لە کەرکوك توانیویە بە هێزێکی سەربازییەوە بچێتە شاری کفری ئەو کاتەوە و لەم کاتەشدا بە تەواوی ئەو دەسەڵاتەی کە ئیبراهیم خانی دەڵۆ کە لە کفری و دەوروبەریدا هەیبووە بە تەواوی کۆتایی هاتووە . جگە لەوەش وەك هەواڵەکە ئاماژەی بۆ کردووە هەموو: ((**ئەو عەشایەرو سوارەی کە خراپەیان لەو ناوە دەکرد**)) هەموو لە ناوچەکە هەڵاتوون و هەر لە هەمان ڕۆژیشدا کەسێکی وەك ڕەفعەت بەگی داودە کە پێشتر دژی بەریتانیا و سوپای بەریتانیا جەنگاوە بە: ((**خۆی و سێ کەسی تر ڕایان کردۆتە عەجەم**))[18] واتە بەرەو دیوی ئێران و وڵاتی ئێرانی قاجاری (١٧٩٦-١٩٢٥) ئەو کاتە بوونەتەوە. هەرچەندە ڕۆژێك دوای ئەو ڕووداوانە بەریتانییەکان توانیویانە هێزەکانی خۆیان، کە بە زۆری بریتی بوون لە سەربازی بە ڕەگەز هیندی، لە ناو شارێکی وەك کفری ئەو کاتەدا بڵاو بکەنەوە. لەگەڵیشیدا هەواڵەکە باسی لەوەش کردووە کە گوایە بارودۆخ لە شوێنێکی وەك : ((**قەرەتەپەدا ئارام بۆتەوە**))[19] هەرچەندە بەریتانییەکان بۆ دووبارە دەسبەسەرا گرتنەوەیان بۆ ناوچەکە وەك خۆیان باسیان لێوە کردووە دەسپارێزییان نەکردووە و بە تاڵانبردن و دێهاتێکی زۆریان سووتاندووە و تەنانەت لە شوێنێکی وەك شارەباندا پەنایان بردۆتە بەر ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆریان لە خەڵکی شارەکە لە سێدارە داوە و ژمارەیەکی کەشیان هەر لە خەڵکی ئەو شارە بە تۆمەتی تاوانکردن و ڕووبەڕووبوونەوەیان غەرامەیان لێ سەندوون[20] .

هەر لەم بارەیەوە و وەك لە هەواڵێكدا كە لەسەر شاری كفری ئەوكاتـە بـڵاو كراوەتەوە زۆر بە ڕوونی ئەم لایەنەیان باس كـردووە و لەگەڵیشـیدا باسـیان لـەوە كردووە كە توانیویانە دووبـارە لـەڕووی كـارگێڕی و بەڕێوەبردنـەوە ئـەو شـارە و ناحیەكانی دەوروبەری دەستبەكاری خۆیان بكەنەوە، لـەو بارەیەشـەوە هەواڵەكـە وای ڕاگەیاندووە كە: ((**ناحیەكانی قەرەتەپە و زەنگەنە دیسان دانرایەوە و مـودیر لـە مەركـەزی خـۆی دانیشـتووە**))، هـەروەها لەگەڵیشـیدا وای بـاس كـردووە كـە: ((**ئەوەی لە ئاوایی دەلۆ بوو لەگەڵ هەندێ لە ئاواییەكانی كفری بە تەواوی سووتا و تاڵانكران لە لایەن حكومەتەوە**))[21] لەو ماوەیەش كە فـەرمانڕەوایانی بـەریتانیا توانیویانە كۆتایی بە هێزە ڕاپـەڕیوەكان و نـەیارەكانی خۆیـان بهێـنن لـە زۆربـەی ناوچە كوردنشینەكان و بە تایبەتی تەوەری گەرمیاندا. پاشان كەوتوونەتە ئـەوەی دووبارە ئەو كەناڵانەی پەیوەندی پێوەكردن و هۆیەكانی هاتوچۆ و تـا ڕادەیـەكی باش چاكسازی لە هێزەكانی خۆیاندا بكەن. بۆ ئـەو مەبەسـتەش لـە ٣٠ی ئـەیلولی ١٩٢٠دا لـە دەوروبـەری شـاری خانـەقین و ئـەو هێڵـەی شـەمەندەفەر كـە لـە (**قۆرەتوو**) ی ئەوكاتەوە بەرەو شاری بەغدا بۆتەوە، كەوتوونەتـە چـاككردنەوەی، چونكە پێشتر لەلایەن هێزە ڕاپەڕیوەكانی ناوچەكەوە بـە تـەواوی پـەك خرابـوون، وەك لـەژێر ناونیشـانی (**خانـەقین**)دا و بـە پێـی ڕاپۆرتـە هـەواڵێك كـە لـە ٣٠ی ئەیلولداو لە ژمارە(٢٣)ی (**پێشكەوتن**)دا بلاو كراوەتـەوە لـە بڕگەیەكیـدا هـاتووە كەوا: ((**ڕێگای ئاسن دیسان لە قۆرەتووەوە تا بەغداد چـاككرایەوە و وەك جـاران ئیش دەكات**))[22]. هەرچەندە گەلێك جار بنكەی سوپایی بەریتانی و تەنانەت ئـەو هێڵەی شەمەندەفەر بۆجاری دی پەلامار دراونەتەوە و فـەرمانڕەوایانی بـەریتانیا خۆیان لە ڕاگەیـەنراوی (**بـلاغ**)ی فەرمییانـدا باسـیان لێـوە كـردووە وەك لـە نزیـك گوندی (**مووسا عوسمان**)ی ناوچـەی بنكورەوە كـە بـە نزیكـەی ٩ میـل كەوتۆتـە سەرووی شاری خانەقینەوە، لـە ٤ی تشـرینی دووەمـی ١٩٢٠ەوە هێـرش كراوەتـە سەریان.[23]

بـە هـەمان شـێوە لـە هـەواڵێكی تـردا و سـەبارەت بـە هێڵـی شـەمەندەفەری (**قنگربان**) كە دەكەوێتە خوارووی شاری كفرییەوە هەر لـە ٣٠ی ئـەیلولی ١٩٢٠دا، هەفتەنامەی پێشكەوتن وای بلاو كردۆتەوە كەوا: (**ڕێگای ئاسن لە كنگربانەوە تـا بەغـداد لـە ئـەمڕۆوە ئـیش دەكـات**)[24]، سـەرەڕای ئـەو چاكسـازییانەی كـە بەریتانییەكان بۆ دووبارە چـاككردنەوەی هۆیـەكانی هاتوچـۆ و پێكـەوە گرێـدانی

ناوچەکان بە جێیان گەیانـدووە، زۆر جـەختیان لـە سـەر ئـەوە کردۆتـەوە کـە بـە تەواوی ئەوە بە کۆمەلآنی خەلك بگەیەنن کە ئەوان بە یەکجاری دەستیان بـە سـەر ناوچەکەدا گرتووە و هـەموو ئەوانەشـی کـە ڕێبەرایـەتی ئـەو هێـزە ڕاپەڕیوانـەیان کردبێ لە ناوچەکە دوور خراونەتەوە. بۆ نموونە بۆ جارێکی دی و بە پێی هـەواڵێك کە لە ٢٩ی ئەیلولی هەمان ساڵدا بلآو کراوەتەوە پێشـکەوتن پێمـان دەڵـێ: ((**ئـەو ئاواییانەی دەلۆ کە لە قەزای کفری سـوتێنران ئەهالیشـی لا کـەوت و کوێخاکـانی دەلۆ هەموویان گیران یان باریان کردۆتە ناو عەرەبی عەزە**))[٢٥]. کەچی هێزەکانی بـەریتانیا و فـەرمانڕەوایانی بـەریتانیا لـە کوردسـتان و تـەوەری گەرمیانـدا هـەر بەوەوە نەوەستاون و بە پێی ئەژمارێکی ئاشکرا کە هەر لە (**پێشکەوتن**)دا بلآویان کردۆتەوە، پێ بژاردنێکی گەورەیان لەسەر شار و دانیشتووان و سەرۆك هۆزەکانی ناوچەکە دانـاوە، بـەم شـێوەیە سـەرەڕای خەملآنـدنی، لـە تۆمارەکـانی خۆیانـدا، باسیان لێوە کـردووە: ((**جەریمەی سی و پێنج هەزار ڕوپیە و سەدو سـی تفـەنگ لەسەر داودە دانرا، شاری دووزیش لە بەرئەمـە تێکـەڵ بـە ئیشـی خراپـە بووبـوو حەڤدە هەزار و پێنج سەد ڕوپیە جەریمـە کـرا، فـارس بـەگی بـەیات بەخشـرا بـە جەریمەی سێ هەزار ڕوپیە و بیست تفەنگ، بەیاتی تر ئێستا نابەخشرێن**)) هەر لە هەمان ژمارە و لە کۆتایی هەواڵەکەشدا ئەوەیان ڕوون کردۆتەوە کە ڕێبەری هێـزە ڕاپەڕیوەکانی شاری کفری کە کەسایەتی ناسـراو ئیـبراهیم خـانی دەلـۆ بـووە لـە بـارەی شـوێن و جێگـای نیشـتەجێبوونیەوە، دوای ئـازادکردنی شـاری کفـری لـە دەسـەلآتی بەریتانییـەکان وایـان ڕاگەیانـدووە کـەوا: ((**ئیـبراهیم خـانی دەلـۆ ڕای کردووەو خۆی گەیاندۆتە ناو عەشیرەتی عەزە و لەوێ خۆی ون کردووە**))[٢٦]. هەر لەم بارەیەوە و سەبارەت بە ڕووداوی ڕۆژگـاری ڕاپـەڕینی سـاڵی ١٩٢٠ ی عێـراق و ناوچە کوردنشینەکان کە هێشتا گرێ نەدرابوو بە عێراقەوە، گەلێك هـەواڵی گـرنگ و بابەتی سەرنجڕاکێش لە سەر لاپەڕەکانی (**پێشکەوتن**)دا بەرچاو دەکەون .

**دووەم / پەیوەندییە کۆمەلآیەتییەکانی گەرمیان و ڕەوشی دەسەلآتی ناوچەکە لە (پێشکەوتن)دا**

کاتێك بە(**پێشکەوتن**)دا دەچینەوە و لێکۆڵینەوە و بـە دواداچـوونی وردی بـۆ دەکەین، دەبینین زۆربەی ژمارەکانی هەفتەنامەکە زۆر لایەنی جۆربەجۆری ئەم پەیوەندییـە کۆمەلآیەتییانـەی فـەرامۆش نـەکردووە، بـەپێی ئـەو هـەواڵ و

ڕووداوانەی کە لـە ڕووی کۆمەڵایـەتی و پەیوەندییـەکانی هاتوچۆ و ناکۆکییـەکانی ناو کۆمەڵی ئەو دەمانەی کە ڕۆژانە پێی گەیشتوون بایـەخی پـێ داوە و لـە سـەر لاپەڕەکانیدا تۆماری کردوون. وای بۆ دەچین، کـەوەك بابـەتی نووسـراو نـەك وەك دەقی شیعری و سەربردەی کەسان، یەکەم جار بێت وشە یان زاراوەی (**گەرمیان**) لـە ڕۆژنامەنووسـیی کوردیـدا لـە سـەر لاپـەڕەکانی (**پێشـکەوتن**)دا هـاتبێ و سەرچـاوەی گرتبـێ، وەك ئـەوەی لـە ژمـارە (٦)یـدا و لـە کـاتی بلاوکردنـەوەی (**ئاگانامە**) واتە (**اعلان**)ێکدا کـە بریکـاری سـەرۆکی شـارەوانی ئـەو کاتـەی شـاری سـلێمانی کـە (**محەمـەد حوسـێن**) ناوێـك بـووە و بـە مەبەسـتی بلاوکردنـەوە ناردوویەتی بۆ هەفتەنامەی پێشکەوتن، جـەخت لـە سـەر ناپـاکی و بـێ ئیلتزامـی کارمەنـدان و چاوشـەکانی شـارەوانی کـردووە کـە چـۆن وەك کەسـانێکی ناپـاك و گەندەڵ بەرتیلیان لە خەڵك وەرگرتووە، تەنانەت لە بەشێکی ئەم (**ئاگانامە**)یـەدا ئاماژە بەوە دەکات کە (**کەریم چاوش**) ناوێك لـەو کاتـەدا: ((**هەشـت ڕوپیـەی لـە سێ پیاوی گەرمیانی سەندووە**))[٢٧]. هەروەها لە ژمارەیەکی تردا کـە بـە هـەمان شێوە پەیوەندی بە تەوەری گەرمیانەوە هەیە. لە ژێر سەردێڕی (**جـاف**)دا، بـاس لە بـارودۆخ و نیشـتەجێبوونی ئـەم هـۆزە گەورەیـەی کـورد دەکـا و لـە بەشـێکی وتارەکەدا هاتووە: ((**وەك لێکدراوەتـەوە و زانـراوە عەشـایەری جـاف لـە دێهـات دانیشن و خەریکی فەلاحەت و زەراعەتیش بن و واز لە گەرمیان و کوێستان بهێنن زۆر زۆر بۆیان باشتر و چاکترە**))[٢٨]. هەر لە کۆتایی ئەم وتـارەی (**پێشـکەوتن**)دا کە ناوی نووسەرەکەی بەسەرەوە نییە زۆر بە وردی ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە هۆزێکی گەورەی وەك جاف لێرە بـەدواوە واتـە لـە دەوروبـەری سـاڵی ١٩١٩ی زاینییەوە لەوەدا بـوون کـە بـە تـەواوی دێهـات دروست بکـەن و واز لـە ژیـان و سەربردەی کۆچەرایەتی بهێـنن. چـونکە لـەم لایەنـەوە تـا ڕادەیـەك زانیارییـەکی وردمان دەداتە دەستەوە، سەبارەت بـەو دێهاتانـەی کـە هـۆزی گـەورەی جـاف و تیرەکـانی ئاوەدانیـان کردبێتـەوە وەك لـە بڕگەیەکیـدا هـاتووە: ((**لـە سـاڵی ڕابـوردوودا** (واتـە سـاڵی ١٩١٩) **لـە نـاو قـەزای کفـری جـاف ١٤ دێیـان ئـاوەدان کردۆتەوە و ، لە شارەزووریش ٩ دێیان ئاوەدان کردۆتەوە لە مـەریوان و بانـەش لە ناحیەی پێنجوێندا ١٤دێیان ئاوا کردۆتەوە**))[٢٩].

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا هەفتەنامەی پێشکەوتن بۆ زۆر بوار و لایەنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان و چۆنێتی چارەسەرکردنیان لە نـاو کۆمەڵگـەی کوردەواریـدا بـە

بایەخەوە لاپەڕەکانی خۆی بۆ تەرخان کردووە و هەواڵی گەلێك قەیران و کێشەی کۆمەلأیەتی ناوچە جۆربەجۆرەکانی ئەو کاتەی باشووری کوردستانی بۆ تۆمارکردووین و هەروەها لە وردەکاری ئەوانەشی کە دەستیان هەبووبێ لە چارەسەرکردن و کۆتاییهێنانیدا، تەنانەت ئەگەر بە هاوکاری دەسەلأتیش بووبێ بە وردی گەلێك زانیاری وردی خستووینە بەردەس لەم بارەیەشەوە (**پێشکەوتن**) لە ژمارە (٥٤)یدا سەربردە و وردەکارییەکانی هەواڵێکی بلأو کردۆتەوە کە باس لە کێشەیەکی کۆمەلأیەتی نێوان بنەماڵەی تاڵەبانییەکان و تیرەی تەرخانی سەر بە هۆزی گەورەی جاف دەکات، لە مەسەلەی چارەسەرکردنیدا هەردوو کەسایەتی و پیاوی کۆمەڵی ناوچەی گەرمیان واتە کەریم بەگی فەتاح بەگی کوڕی حەمەپاشای جاف (١٨٨٩–١٩٤٩)[٣٠] و شێخ وەهابی کوڕی شێخ حەمیدی کوڕی شێخ عەزیزی تاڵەبانی (**١٨٨٦ بناری گڵ–١٩٧٢سەوزبلأخ**)[٣١] یەوە توانیویانە بکەونە نێوانیانەوە و کێشەی سووتانی ئەو ڕەشمالأنەی تیرەی تەرخانی لە ناوچەی گەرمیاندا کە تا ڕادەیەك وەك لە ناوەرۆکی هەواڵەکەدا هاتووە کە گوایە تاڵەبانییەکان دەستیان هەبووبێ لە سووتانیدا، یەکلایی کراوەتەوە، لە تەرەفی حکوومەتیشەوە (**غالیب ئەفەندی**) لە پۆلیسی کەرکووك و (**حاکمی هەڵەبجە**)ی بەریتانی کە لەو دەمانەدا کاپیتان (**دوگلأس**) بووە تیایدا بەشدارییان کردووە. جگە لەوەی زۆر بە وردی ڕۆژ و مانگی ڕێکەوتنامەکە، لە هەواڵەکەدا هاتووە، ئەگەر سەیری ڕووپەڕی هەفتەنامەکەش بکەین، ساڵەکەشمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە بۆخۆی دەکاتە ٢١ی نیسانی ساڵی ١٩٢١ وەك لە درێژەی هەواڵەکەدا هاتووە:

((**بۆ جێبەجێکردنی مەسەلەی سووتاندنی ڕەشماڵەکانی تایەفەی تەرخانی ڕۆژی بیستویەکی مانگی ئەبریل مەجلسێکی تایبەتی لە کفرییەوە کۆبووەوە. جەنابی شێخ وەهابی تاڵەبانی و جەنابی کەریم بەگی جاف و گەورەکانی تایەفەی تەرخانی لەگەڵ حاکمی سیاسی هەڵەبجە کاپیتان دوکلس و غالب ئەفەندی لە پۆلسیی کەرکووك هەموو حازر بوون. تەرەفەین لە نەتیجەی مەجلیس ڕازی بوون**))[٣٢].

لەلایەکی ترەوە و لە ڕووی تۆماری مێژووییەوە (**پێشکەوتن**) بە بایەخەوە هەواڵ و شێوازی هاتوچۆی ئەو کاروانییانەشی لەبیر نەکردووە کە لە سلێمانی و ناوچەی سلێمانییەوە بەرەو گەرمیان و بە تایبەتی بەرەو شاری کفری ئەو کاتە بوونەتەوە، وەك لە ژمارە (٧٣) ی ڕۆژی ١٥ی ئەیلوولی ١٩٢١دا باسی لە ئارامی و

مەسەلەی ئەمنیەتی ئەو ڕێگایە و بەرپرسیاریەتی فەرمانڕەوایەتی بەریتانی کردووە لە ناوچەکەدا، لەو بارەیەوە دەنووسیٚ: ((**کاروانیٚ کە لە بەینی سلێمانی و کفری هاتوچۆ دەکات ئەگەر وەك جاران لە مەرکەزی ناحیەی زەنگەنە نەخەن (مەبەست لە بارەکانیانە)، شەو لە جێگای تر و لە چۆلدا بخەن و بمێننەوە مەسئولیەت لەسەر خۆیانە**))[٣٣]بە هەمان شێوە سەبارەت بە مەسەلەی هاتوچۆ و ڕێگاوبان دەبینی (**پێشکەوتن**) زۆر هەواڵی ئەو دەمانەی ناوچەکە و شارە جۆربەجۆرەکانی باشووری کوردستانی بۆ ڕوون کردووینەتەوە، بە ڕادەیەك لە سەرەتای بیستەکانی سەدەی بیستەمی ڕابوردووەوە بە تەواوی جووڵەی ئۆتۆمبیل و سەفەرکردنی هاولآتییان لەم قۆناغەدا گەرم و گوڕییەکی زیاتری بە خۆوە بینیوە و گەلێك کەسایەتی و دەوڵەمەندی ئەوکاتەی کوردستان کەوتوونەتە ئەوەی کە ئۆتۆمبیلی خۆیان بۆ سەفەری هاولآتییان لە نێوان شار و شارۆچکەکاندا بخەنە گەڕ لەم بارەیەوە و بەپێی هەواڵێکی هەفتەنامەی پێشکەوتن کەسایەتییەك بە ناوی (**حاجی شەریف زادە ـ کەریم**)، ئاگانامەیەکی بلآو کردۆتەوە و تیایدا هاتووە: ((**بۆ کەرکوك، قنگربان، چەمچەماڵ، هەڵەبجە و ئەو جێگایانەی کە ڕێگای ئۆتۆمبیلی هەیە، هەر کەس دەیەوێت ئۆتۆمبیل بۆ ئەو جێگایانە بگرێت بە کریٚ بفەرموێت من ئۆتۆمبیلێکم هەیە بە کرێی دەدەم**))[٣٤].
جگە لە هەموو ئەمانەش لاپەڕەکانی (**پێشکەوتن**) لەو دوو- سیٚ ساڵەی تەمەنیدا زۆر لایەنی شارراوەی مێژووییمان بۆ ڕاست دەکاتەوە و ڕووداوەکانمان بە ڕاستی و دروستی بۆ ئاشکرا دەکات. وەك لە ماوەیەکدا کە کەسایەتییەکی وەك ئیبراهیم خانی دەڵۆ، کاتێك لە ڕاپەڕینەکەیدا لە شاری کفری و دەوروبەریدا شکست دەهێنیٚ و لە تاو پەلاماری بەریتانییەکان هەڵدیٚ و خۆی دەشارێتەوە، فەرمانڕەوایانیش، سەروسۆراخێکی ئەوتۆی نازانن، هەرچەندە لە تاقیبکردنێکی بەردەوامیدا دەبن، بۆ ئەوەی تۆڵەی خۆیانی لیٚ بکەنەوە. بۆیە لە سەرەتاکانی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢١ەوە و بەپێی تەلەگرافێك کە لە کەرکووکەوە پێیان گەیشتووە، هەواڵی ئیبراهیم خانی دەڵۆ بلآو دەکەنەوە و لەگەڵ ئەوەشدا، لە ڕاستی و دروستیی هەواڵەکە بەگومانن، وەك لە دەقی هەواڵەکەدا هاتووە:
((**تەلەگرافێك لە کەرکووکەوە هاتووە کە ئیبراهیم خانی دەلۆ لە (تەل شەرەف)ی نزیك دووزخورماتوو وەفاتی کردووە دیار نییە کە ڕاستە یا نا**))[٣٥]. هەروەها لە بارەی وەفاتکردنی کەسایەتی و پیاوی کوردەواری ئەوکاتەی هۆزی گەورەی

باجەلان واتە مستەفا پاشای کوڕی عوسمان پاشای کوڕی قادری کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی ئەحمەد پاشای باجەلان (١٨٤١–١٩٢١)[٣٦] ەوە، هەفتەنامەی پێشکەوتن لە ژمارە (٤٩)ی دا بابەتێکی بڵاو کردۆتەوە و سەرەتا ئەم کەسایەتییەی بە پیاوێکی ڕاست و تێکۆشەر لە قەڵەم داوە، هەر لەم بارەیەوە و بە ناونیشانی: ((**جەنابی مستەفا پاشای باجەلان**))ەوە وای تۆمار کردووە کە: ((**بە تەئەسوفێکی تەواو زانراوە کە جەناب مستەفا پاشا یەکێك بوو لە گەورەکانی تایەفەی باجەلان ئەمری خوای کردووە. لە عومری خۆیدا هەموو وەخت بۆ ئەمنیەت و ئاسایشی مەملەکەت زۆر تێدەکۆشا و بە عەدالەت و دڵپاکی ناوبانگی هەبوو لە پاش هاتنی ئینگلیز بۆ پێشکەوتنی ولاتی خۆی زۆر هەولی داوە و ڕۆیشتنی بۆ ئەو دونیا سەبەبی دلگرانییە بۆ هەموو**))[٣٧].

جگە لە هەموو ئەوانەش (**پێشکەوتن**) بە هەمان ڕەوت لە ژمارەیەکی تریدا و سەبارەت بە کۆچکردنی کەسایەتی و پیاوی ئایینی شاری کەرکووك، کە مەلا مەحموودی مەزناوییە، گرێکوێرەیەکی گەورەمان بۆ دەکاتەوە و سەعات و ڕۆژ و مانگ و ساڵی کۆچکردنی زانا و گەورەپیاوێکی ئاینی، وەك ئەم زاتەمان بە تەواوی بۆ یەکلایی دەکاتەوە. دیارە پێشتر، هەریەك لە مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیس و مامۆستا محەمەد عەلی قەرەداغی و تەنانەت بابامەردۆخی ڕۆحانی، بە هەڵە کۆچکردنی ئەم گەورەپیاوەیان تۆمار کردووە، سەرەڕای ساڵی لەدایکبوونی، بەوەی کە هەریەك لە عەبدولکەریمی مودەڕیس و محەمەد عەلی قەرەداغی وایان تۆمار کردووە کە مەلا مەحموودی مەزناوی لە ساڵی ١٢٧٥ی کۆچی بەرامبەر بە ساڵی ١٨٥٥ی زاینی هاتبێتە دنیاوە و لە ساڵی ١٣٥٣ی کۆچی کە هاوکاتە لەگەڵ ساڵی ١٩٣٣ی زاینیدا کۆچی دوایی کردبێ[٣٨]. هەرچەندە مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە کۆتایی نووسینەکەیدا سەبارەت بە مەلا مەحموودی مەزناوی و ئەو ساڵەی کە تۆماری کردووە بە گومانەوە دەنووسێ: ((**والله أعلم**))[٣٩].

کەچی سەبارەت بە هەمان بابەت و بەگوێرەی ئەو تۆمارەی کە لەسەر لاپەڕە (٣)ی هەفتەنامەی (**پێشکەوتن**)ی ژمارە( ٥٢)ی٢١ی نیسانی ١٩٢١دا هاتووە، ئەوا هیچ ئەو گومانەمان لا ناهێڵێتەوە کە مەلا مەحموودی مەزناوی، لە ڕۆژی یەك شەممە، ١٠ی نیسانی ١٩٢١دا و لە سەعات ٢ی پاش نیوەڕۆ کۆچی دوایی کردووە، لەو ماوەیەشدا و وەك لە بابەتەکەدا هاتووە تەمەنی نزیکەی (٩٠) ساڵ بووە. هەروەك لە دەقی وتارەکەدا و بە ناونیشانی: ((**گەورەیەك کەم بوو**)) هاتووە کەوا:

**((مەلا مەحمودی ئەفەندی مەزناوی وەك ناوبانگمان بیستوە ساڵی نزیك بە نەوەد کردبووەوە، بەڵام دووبەشی ژیانی بەدەرسدانی عیلم ڕاییواردووە و ئیجازەی بە چەند کەسێ داوە. زاتێکی ئێجگار گەورە و باش و بە تەقوا بووە. ڕۆژی ١٠ی مانگی ئابریل کە یەکشنبەیەکی پێشوو دەگرێتەوە سەعات (٢) دوو لە کەرکووك وەفاتی فەرمووە خوا مەرتەبەی بەرز بکاتەوە بەڕاستی زیاعێکی گەورەیە))**.

بە پێی ناوەرۆکی ئەم هەواڵەش بێ ، ئەوا مەلا مەحموودی مەزناوی زۆر لەوە بە تەمەنتر بووە کە هەردوو مامۆستایان مودەڕیس و قەرەداغی باسیان لێوە کردووە یان ئەبێ ئەم مەلا مەحموودی مەزناوییەی کە هەفتەنامەی (**پێشکەوتن**) لە بارەیەوە نووسیویە و بڵاوی کردۆتەوە مەلا مەحمودی مەزناوییەکی دی بێ و پێشتر ژیابێ [٤٠].

لە لایەکی تریشەوە و لە هەمان ساڵی ١٩٢١دا، لە ژمارە (٥٤) ی هەفتەنامەی پێشکەوتندا، نوێنەری باڵای بەریتانیا لە عێراق سێر پێرسی کۆکس (Sir Percy Cox)[٤١] بە بۆنەی کۆچی دوایی کەسایەتی و ڕووناکبیری ناسراوی کورد مەحموود پاشای جاف (١٨٤٥-١٩٢١)[٤٢]ەوە کە لە شارۆچکەی قزڕەبات (**سعدية**) نێژراوە، برووسکەیەکی ماتەمینی بۆ کەسوکار و خانەوادەکەی ناردووە و هەفتەنامەی (**پێشکەوتن**)یش بڵاوی کردۆتەوە و ناوونیشانی بابەتەکە: ((**مەحمود پاشای مەرحوم**))ە و تیایدا هاتووە: ((**جەناب سێر پێرسی کۆکس ساحیب لە بەر دڵسۆزی خۆی لە وەفاتی محمود پاشای جاف تەلێکی موتەئەسیفانەی ناردووە و هەمدەردی خۆی لەگەڵ خزم و خانەدانی جەنابی مەرحوم نواندووە**))[٤٣] جگە لەوەش لە شوێنێکی تر و لە ژمارەیەکی تری (**پێشکەوتن**) ، کە دەکاتە ژمارە (٥٧)ی ساڵی دووەمی و لە ڕۆژی پێنج شەممەی ٢٦ی ئایاری ١٩٢١دا، ئەو هەواڵ و ڕێوڕەسمەی بڵاو کردۆتەوە کە تیایدا یەکێك لە کاربەدەستانی نەوتی (**ئەنگلو-ئێرانی**)، ئۆتۆمبیلێك بە دیاری دەبەخشێتە خەستەخانەی ئەو کاتەی شاری (**خانەقین**) کە تایبەت بووە بە گواستنەوەی نەخۆش و ڕاییکردنی کاروباری ڕۆژانە و لایەنی چارەسەرکردن. بابەتەکەش کە هەربە ناونیشانی (**خانەقین**)ەوە بڵاوکراوەتەوە لە بەشێکیدا هاتووە: ((**ڕۆژی چوارەمی مەی** (ئایار) **لە خانەقین مستەر کیپتو کە یەکێکە لە مەئمورینی کۆمپانیای شەرکەتی نەوتی ئینگلیس و ئێرانی ئۆتۆمبیلێکی زۆر چاکی بە خەستەخانەی خانەقین داوە. ئەم ئۆتۆمبیلە بە تایبەتی بۆ بردنی نەخۆش بە خەستەخانە دروست کراوە. لەم مەوقعەدا جەناب**

**ڕەئیسی بەلەدیەی خانەقین و گەورەکانی قەزای بانگ کردبـووە سـەر میـوانی بـۆ لای خۆی. جەنابی قائمقام و شابەندەری ئێرانیش حازر بوون))**(٤٤) ئەمانە و گەلێك بابەتی مێژوویی سەرنجڕاکێش سەبارەت بە گەرمیان بەگشتی و ئەو شـوێن و شـار و ناوچە ئاوەدانانەشی کە پەیوەندییەکی یەکانگیری ڕۆژانـەیان لەگەڵیـدا هـەبووە، بە تایبەتی شاری خانەقین و کەرکووك بە حوکمی هەڵکەوتەی جوگرافییـان، بۆتـە مایەی ئەوەی زۆر جار لەگەڵ یەکدیدا ناویان بێ، واتە ئەمانەی کە لێرەدا و بەسەر یەکەوە تۆمارم کردوون و لێکدانەوەم بۆ کردوون کەرەستەیەکی خاوی زۆر گـرنگن و دەکرێ لە داهاتوودا لێکۆڵینەوەی وردتریان بە دوادا بێ.

* لە دنیای ڕۆشنبیری کوردیدا ناسراوە بە ( ئەحمەد باوەڕ).

# ژێدەرو پەراوێزەکان

[1] مێجەر سۆن (ely banister soane): سیاسەتمەدار و ئەفسەرێکی بەریتانی بوو لە ١٦ی ئابی ساڵی ١٨٨١ لە کنزنتن لە دایك بووە، بایەخێکی گەورەی بە بارودۆخی کوردستان داوە، لە ساڵی ١٩١٧دا کاروباری مەندەلی پێ سپێردراوە، دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٢٠ەوە لە لایەن بەریتانیاوە کراوەتە فەرمانڕەوای شاری سلێمانی. دواتر بە هۆی نەخۆشی (سیل)ەوە و لە ٢٤ی شوباتی ساڵی ١٩٢٣دا مردووە. بڕوانە: مێجەر ئی.بی. سۆن، چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، و: نەجاتی عەبدوڵڵا، (سلێمانی: ٢٠٠٧)، ل ١٥–٢٢.

[2] فارووق عەلی عومەر، ڕۆژنامەگەریی کوردی لە عێراقدا، بەراییەکان ١٩١٤– ١٩٣٩، و: تاریق کارێزی، عەبدوڵڵا زەنگەنە، دەقە ڕۆژنامەوانییەکانی ساغ کردۆتەوە، چ١، ( هەولێر: ٢٠٠١)، ل٨ ١.

[3] کەمال مەزهەر ئەحمەد (دکتۆر)، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، ب١، (بەغدا: ١٩٨٥)، ل١٥٤ – ١٥٥. فارووق عەلی عومەر، سەرچاوەی پێشوو، ل ٨٣.

[4] لەم بارەیەوە بڕوانە: ئومێد شێخ ڕەحیم، ڕۆڵی ڕۆژنامەی پێشکەوتن لە گەشەکردنی ئەدەبی کوردیدا، ماستەرنامەی بڵاونەکراوە، بەشی کوردی، کۆلێژی پەروەردەی ئیبن ڕوشد، زانکۆی بەغدا، ٢٠٠٣.

[5] عەلی ناجی عەتار، سیروان بەکر سامی، پێشکەوتن یەکەمین ڕۆژنامەی سلێمانی١٩٢٠– ١٩٢٢، (هەولێر: ١٩٩٨).

لەم ڕۆژانەدا کە من ئەم لێکۆڵینەوەیەی خۆم تەواو کردبوو، چاپێکی دیکەی ئەم (پێشکەوتن)ە، لەلایەن (بنکەی ژین)ەوە لە دوتوێی پێشەکییەکی تێروتەسەلەوە، کەوتە بەردەستی خوێنەران.

[6] کەمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا، (بەغدا:١٩٧٨)، ل ٢١٨.

[7] پێشکەوتن، ژمارە (١١٨)، ساڵی سێیەم، ٢٧ی جولای ١٩٢٢، ل٢.

[8] مستەفا پاشای یامولکی: مستەفا شەوقی کوڕی عەزیز یامولکی کوڕی مەلا مستەفای کوڕی مەلا عەزیزی مەلا حەیدەری سەر بە هۆزی بڵباسە، ساڵی ١٨٦٦ لە دایك بووە ، خوێندنی ئامادەیی لە شاری بەغدا تەواو کردووە، دوای تەواوکردنی خوێندنی ئەرکانی جەنگ گەلێك پلەو پایەی سەربازی، لە چوارچێوەی سوپای عوسمانیدا، دیوە، تەنانەت یەکێك بووە لەوانەی کە لە شەڕی باڵقاندا بەشداری کردووە و فەرماندەی هێز بووە، دوای دەسەڵات

گرتنەدەستی کەمالییەکان گەڕاوەتەوە باشووری کوردستان و لە شاری سلێمانیدا (جەمعیەتی کوردستان)ی دامەزراندووە و ڕۆژنامەیەکیشی بە ناوی (بانگی کوردستان)ەوە دەرکردووە، دواتریش لە دووەمین حوکمدارییەتی شێخ مەحموودا وەزیری ڕۆشنبیری بووە، ناوبراو لە ساڵی ١٩٣٦ دا لە شاری بەغدا کۆچی دوایی کردووە. بڕوانە: میر بصري، اعلام الكرد، (لندن: ١٩٩١)، ص ٧٠-٧٢، محمد علي الصويركي ، معجم اعلام الكرد في التاريخ الاسلامي والعصر الحديث في كردستان وخارجها، (السليمانية: ٢٠٠٦) ، صص ٧١٣-٧١٤.

(٩) کەمال مەزهەر ئەحمەد، کورد و شەڕی شوعێبە، ڕۆشنبیری نوێ (گۆڤار)، ژمارە (١٢٥)، بەهاری ١٩٩٠، ل٣٨. كمال مظهر احمد، دور الشعب الكردى في ثورة العشرين العراقية، (بغداد: ١٩٧٨)، ص١٣٠.

(١٠) انظر: ميجر سون، ميرزا غلام حسين شيرازي، رحلة متنكر الى بلاد مابين النهرين وكردستان، الجزء الاول والثاني، ترجمة: فؤاد جميل ، (بغداد: ١٩٧٠).

(١١) پێشکەوتن، ژمارە ( ١٨)، ٢٦ی ئابی ١٩٢٠، ل٤.

(١٢) قەرەخان: مەبەست لە شارۆچکەی (جەلەولا)ی ئەمڕۆیە.

(١٣) پێشکەوتن، ژمارە (١٩)، ٢ی ئەیلوولی ١٩٢٠، ل٣.

(١٤) پێشکەوتن، سەرچاوەی پێشوو، ل٣.

(١٥) مستەفا نەریمان، شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەڵۆ، چ١، (بەغدا: ١٩٨٥)، ل ١٣١. كاظم المظفر، ثورة العراق التحررية عام ١٩٢٠، مطبعة الاداب، (النجف: ١٩٧٢)، ص ١٩٤.

(١٦) پێشکەوتن، ژمارە (١٩)، ٢ی ئەیلوولی ١٩٢٠، ل٣.

(١٧) پێشکەوتن، سەرچاوەی پێشوو، ل٣.

(١٨) سەرچاوەی پێشوو، ل٣.

(١٩) پێشکەوتن، ژمارە (٢٠)، ٩ی ئەیلوولی ١٩٢٠، ل٣. كاظم المظفر، ثورة العراق التحررية ١٩٢٠، الجزء الثاني، (النجف: ١٩٧٢)، ص ١٧٣.

(٢٠) پێشکەوتن، ژمارە (٢١)، ١٦ی ئەیلوولی ١٩٢٠، ل٣.

(٢١) پێشکەوتن، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣. كاظم المظفر، الجزء الثاني، ص١٨٠.

(٢٢) پێشکەوتن، ژمارە (٢٣)، ٣٠ی ئەیلوولی ١٩٢٠، ل١. كاظم المظفر، المصدر السابق، صص ١٦٧-١٦٨.

(٢٣) كمال مظهر احمد، دور الشعب الكردي، ص ١٢٢.

(٢٤) پێشکەوتن، ژمارە (٢٤)، ٧ی ئۆکتۆبەری ١٩٢٠، ل٢.

(٢٥) پێشکەوتن، سەرچاوەی پێشوو، ل ٤.

[٢٦] پێشكەوتن، ژمارە (٢٣)، ٣٠ی ئەیلولی ١٩٢٠، ل٣.

[٢٧] پێشكەوتن، ژمارە ( ٦)، ٣ی جونی ١٩٢٠، ل٤.

[٢٨] پێشكەوتن، ژمارە (١٧)، ١٩ی ئابی ١٩٢٠، ل٤.

[٢٩] پێشكەوتن، سەرچاوەی پێشوو، ل٤.

[٣٠] سەبارەت بەم كەسایەتییە بڕوانە: كەریم بەگی فەتاح بەگی جاف، تەئریخی جاف ، لێكۆڵینەوەی: دكتۆر حەسەن جاف و محەمەد عەلی قەرەداغی پێشەكی بۆ نووسیوە، چاپی یەكەم، (بەغدا: ١٩٨٥) ، ل٩٤.

[٣١] بڕوانە: ئەحمەد باوەڕ، كەلار لە مێژوودا، پەیڤین (گۆڤار)، ژمارە (١٣)، ٢٠٠١، ل١٨٦، ئەحمەد حەمەد ئەمین ئۆمەر، ئەندامە كوردەكانی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق لە سەردەمی پاشایەتیدا ١٩٢٥– ١٩٥٨، چاپی یەكەم ، ٢٠٠٧، ل٦٤.

[٣٢] پێشكەوتن، ژمارە (٥٤)، ٥ی مەی ١٩٢١، ل٢.

[٣٣] پێشكەوتن، ژمارە ( ٧٣)، ١٥ی سەبتەمبەری ١٩٢١،ل٤.

[٣٤] پێشكەوتن، ژمارە (٤٩)، ٣١ی مارتی ١٩٢١، ل٤.

[٣٥] پێشكەوتن، ژمارە ( ٣٧)، ٦ی جنوەری ١٩٢١، ل ٣.

[٣٦] انظر: محمد حسين الزبيدي، مذكرات رؤوف البحراني، لمحات عن وضع العراق منذ تأسيس الحكم الوطني عام ١٩٢٠م ولغاية عام ١٩٦٣، المؤسسة العربية للدراسات والنشر ( بيروت: ٢٠٠٩)، صص ٩٠–٩١ ، ابراهيم باجلان، مصطفى باشا باجلان والدفاع عن القضية الكردية ١٨٤١–١٩٢١، صحيفة الاتحاد، العدد،( ٢٩٨١)، السبت ٢٠١٢/٥/٢٦، ص ٩.

[٣٧] پێشكەوتن، ژمارە (٤٩)، ٣١ی مارتی ١٩٢١ ، ل ٣–٤. آزاد عبيد صالح، الاثار الكاملة للدكتور احمد عثمان ابوبكر، الجزء الاول، ( السليمانية: ٢٠٠٩ )، ص٥٤ .

[٣٨] انظر: عبدالكريم محمد المدرس، علماؤنا في خدمة العلم والدين، عني بنشره: محمد علي قرداغي، الطبعة الاولى، (بغداد: ١٩٨٣) ، صص ٥٦٠–٥٦١. محمد علی قرداغي، هوية كركوك الثقافية والادارية، دار آراس للطباعة والنشر، الطبعة الاولى، (اربيل: ٢٠٠٤)، ص ٢٩.

[٣٩] عبدالكريم المدرس، المصدر السابق، ص ٥٦١.

[٤٠] پێشكەوتن، ژمارە (٥٢)، ٢١ی ئابریل ١٩٢١، ل٢.

[٤١] سێر پێرسی زەخەریا كۆكس ( Percy Cox): یەكێكە لە كەسایەتییە سەربازی و سیاسییەكانی بەریتانیا، لە ڕێكەوتی ٢٧ی تشرینیساڵی ١٨٦٤ لە هارروود هالی هێرونگەیتی ئیسێكس لە دایك و باوكێكی جوولەكە لەدایك بووە. كۆلێژی شاهانەی بەریتانی لە (**سانت هێرس**) تەواو كردووە، لە ساڵی ١٩١٧ دا، لە سەروبەندی جەنگی یەكەمدا، بە یاوەری جەنەراڵ مۆد هاتۆتە عێراقەوە، لەوە بەدوا لە تاران پلەی وەزیری

ڕێپێدراوی بەریتانی پێ سپێردراوە، لە ساڵی١٩٢٠ەوە بۆ جارێکی دی هاتۆتەوە عێراق، دواتریش وەك نوێنەری باڵای بەریتانیا لە کۆنگرەی قاهیرەی ساڵی١٩٢١دا بەشداری کردووە. بە جۆرێ کۆکس تا ساڵی ١٩٢٣ لە عێراقدا ماوەتەوە و بۆ دواجاریش لە ٢٠ی شوباتی ساڵی ١٩٣٧دا مردووە. بڕوانە: منتهى عذاب ذويب، برسي كوكس ودوره في السياسة العراقية ١٨٦٤– ١٩٢٣، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب، (جامعة بغداد: ١٩٩٥) ، **ويكوپيديا** ، تاريخ التسجيل، ١٣/٧/ ٢٠١٢.

(٤٢) مەحموود پاشای جاف: کوڕی محەمەد پاشای کوڕی کەیخەسرەو بەگی سلێمان بەگی کوڕی زاهیر بەگی، سەرۆکی هۆزی گەورەی جافە، دوای کوژرانی باوکی کاروباری هۆزی جافی گرتۆتە ئەستۆ، لە ساڵی ١٨٨٢ەوە بۆتە قائمقامی هەڵەبجە، لە لایەن فەرمانڕەوایانی عوسمانییەوە سەرەڕای ئەوەی نازناوی (پاشا)ی دراوەتێ، هاوکات کراوەتە موتەسەڕیفی لیوای (ئورفە) بەڵام بەمەیان ڕازی نەبووە و لەوێوە روو دەکاتە ئەستەمبوڵ و دوای سێ ساڵ بە نهێنی، لە ڕێگای ڕووسیا و ئێرانی قاجارییەوە، دووبارە دەگەڕێتەوە کوردستان و ناوچەی شارەزوور، دوای ئەمەش بۆ جارێکی دی سەردانی ئەستەمبوڵ دەکا، کەسایەتییەکی نەتەوەخواز و ئارەزوویێکی زۆری لە شیعر و ئەدەبیات بووە و بۆ دواساتیش لە نیسانی ١٩٢١دا و لە تەمەنی ٧٨ ساڵیدا لە هەڵەبجە کۆچی دوایی کردووە، بەڵام لە شارۆچکەی قزرەبات و لەو مزگەوتەی کە خۆی بنیادی نابوو، ئەسپەردەی خاك کراوە. بڕوانە: بابا مردۆخ رۆحانی، تاریخ مشاهیر کرد، جلد سوم، (تهران: ١٣٨٢)، ل ٥٣٥–٥٣٦. حەسەن جاف، نەخشی هۆزی جاف لە سای چەند سەرۆکێکەوە لە مێژووی کورددا، کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کورد (گۆڤار)، بەرگی (٢١–٢٢)، (بەغدا: ١٩٩٠)، ل٦١.

(٤٣) پێشکەوتن، ژمارە (٥٤)، ٥ی مەی ١٩٢١، ل ٢.

(٤٤) پێشکەوتن، ژمارە (٥٧)، ٢٦ی مەی ١٩٢١، ل ٢.

## لیستی سەرچاوەکان

**یەکەم/ نامەی زانکۆیی بڵاونەکراوە :**

**أ / بە زمانی کوردی :**

١- ئومێد شێخ ڕەحیم تاڵەبانی، ڕۆڵی ڕۆژنامەی پێشکەوتن لە گەشەکردنی ئەدەبی کوردیدا، ماستەرنامەی بڵاونەکراوە، بەشی کوردی، کۆلێژی پەروەردەی ئیبن ڕوشد، (زانکۆی بەغدا: ٢٠٠٣) .

**ب/ بە زمانی عەرەبی :**

١- منتهى عذاب ذويب، برسي كوكس ودوره في السياسة العراقية ١٨٦٤ – ١٩٢٣، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب، (جامعة بغداد:١٩٩٥).

**دووەم/ کتێبی چاپکراو :**

**أ- بە زمانی کوردی:**

١- ئەحمەد حەمەدئەمین ئۆمەر، ئەندامە کوردەکانی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق لە سەردەمی پاشایەتیدا ١٩٢٥ – ١٩٥٨، چاپی یەکەم، (هەولێر:٢٠٠٧).

٢- کەمال مەزهەر ئەحمەد، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، بەرگی یەکەم، (بەغدا: ١٩٨٥).

٣- کەمال مەزهەر ئەحمەد، تێگەیشتنی ڕاستی و شوێنی لە ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا، (بەغدا: ١٩٧٨).

٤-کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف، تەئریخی جاف، لێکۆڵینەوەی: حەسەن جاف، محەمەد عەلی قەرەداغی، چاپی یەکەم، (بەغدا:١٩٩٥).

٥- عەلی ناجی عەتار و سیروان بەکر سامی، پێشکەوتن یەکەمین ڕۆژنامەی سلێمانی ١٩٢٠- ١٩٢٢، (هەولێر: ١٩٩٨).

٦- فارووق عەلی عومەر، ڕۆژنامەگەریی کوردی لە عێراقدا، بەرایییەکان ١٩١٤ -١٩٣٩، وەرگێڕانی: تاریق کارێزی، عەبدوڵلا زەنگەنە، دەقە ڕۆژنامەوانییەکانی ساغ کردۆتەوە (هەولێر:٢٠٠١).

٧- مستەفا نەریمان، شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ ١٩٢٠، چ١، (بەغدا: ١٩٨٥).

٨- مێجەر ئی. بی سۆن، چەند سەرنجێك دەربارەی هۆزەکانی کوردستانی خواروو، و: نەجاتی عەبدوڵلا، (سلێمانی: ٢٠٠٧) .

٩- عەلی ناجی عەتار، سیروان بەکر سامی، پێشکەوتن یەکەمین ڕۆژنامەی سلێمانی ١٩٢٠- ١٩٢٢، (هەولێر: ١٩٩٨).

**ب- بە زمانی عەرەبی.**

١- مير بصري، اعلام الكرد، (لندن:١٩٩١).

٢- محمد على الصويركي، معجم اعلام الكرد في التاريخ الاسلامي والعصر الحديث في كردستان وخارجها، (السليمانية: ٢٠٠٦).

٣- كمال مظهر احمد، دور الشعب الكردي في ثورة العشرين العراقية، (بغداد: ١٩٧٨).

٤- ميجر سون، ميرزا غلام حسين شيرازى، رحلة متنكر الى بلاد مابين النهرين وكردستان، الجزء الاول والثانى، ترجمة: فؤاد جميل ( بغداد: ١٩٧٠).

٥- كاظم المظفر، ثورة العراق التحررية عام ١٩٢٠، ج١، (النجف: ١٩٧٢).

٦- كاظم المظفر، ثورة العراق التحررية عام ١٩٢٠، ، ج٢، (النجف: ١٩٧٢).

٧- محمد حسين الزبيدي، مذكرات رؤوف البحراني، لمحات عن وضع العراق منذ تاسيس الحكم الوطني عام ١٩٢٠ ولغاية عام ١٩٦٣، المؤسسة العربية للدراسات والنشر ، (بيروت :٢٠٠٩).

٨- آزاد عبيد صالح، الاثار الكاملة للدكتور احمد عثمان، ج١، (السليمانية: ٢٠٠٩).

٩- عبدالكريم محمد المدرس، علماؤنا في خدمة العلم والدين، عني بنشره: محمد علي قرداغي، ط١، (بغداد: ١٩٨٣).

١٠- محمد علي قرداغي، هوية كركوك الثقافية والادارية، دار آراس للطباعة والنشر، ط١، (اربيل: ٢٠٠١).

**ج- بە زمانی فارسی:**

١- بابا مردوخ روحانی، تاريخ مشاهر كرد، جلد سوم، (تهران: ١٣٨٢).

**سێیەم/ گۆڤار و ڕۆژنامەكان:**

**أ- بە زمانی كوردی:**

١- ئەحمەد باوەڕ، كەلار لە مێژوودا، پەیڤین ( گۆڤار )، ژمارە (١٣)، ٢٠٠١.

٢- كەمال مەزهەر ئەحمەد، كورد و شەڕی شوعێبە، ڕۆشنبیری نوێ، ( گۆڤار )، ژمارە (١٢٥)، بەهاری ١٩٩٠

٣- حەسەن جاف، نەخشی هۆزی جاف لە سای چەند سەرۆكێكەوە لە مێژووی كوردا، كۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی كورد (گۆڤار)، بەرگی (٢١-٢٢)، ( بەغدا: ١٩٩٠).

**ب- بە زمانی عەرەبی :**

١- ابراهيم باجلان، مصطفى باشا باجلان والدفاع عن القضية الكردية ١٨٤١-١٩٢١، الاتحاد (جريدة)، العدد ( ٢٩٨١)، السبت ٢٦/ ٥/ ٢٠١٢.

**ج- سایتی ئینتەرنێت:**

١- ویكوپیدیا، ڕۆژی تۆماركردن ١٣/ ٧/ ٢٠١٢.

## ملخص البحث

يسلط البحث الضوء على ما تناولته صحيفة (**پێشکەوتن**) الاسبوعية، من أحداث تاريخية رافقت صدور الصحيفة بخاصة تلك المتعلقة بـ (**منطقة گەرميان** ) تحديداً خلال المدة ما بين (١٩٢٠-١٩٢٢ ) والتي نشرت منها الصحيفة، فقد أتاحت فرصة كبيرة للاطلاع ومعرفة الكثير من الأحداث والحقائق والمواد التاريخية المتعلقة بالموضوع، والتي لم تكن لتعرف الا من خلال تلك الصحيفة، بما تطلبته من تدقيق وإمعان وموضوعية.

عملت (**پێشکەوتن**) على مر سني ظهورها على تغطية الاحداث بشكل اكثر مسؤولية وشمولية حول تداعيات المنطقة (جنوب كوردستان) وبخاصة (**منطقة گەرميان**) حيث ساهمت بفتح باب النشر امام ادباء والشعراء الكورد من ناحية ومن ناحية اخرى ساعدت على التحقق من بعض الاحداث التأريخية.

وعن تناول الصحيفة لقضايا ولأحداثٍ إلاجتماعية، مثل إهتمامها بالدور الذي كان يمارسه رؤساء العشائر البارزين، اشارت الى وفاة الشخصيات الاجتماعية المعروفة فى تلك الآونة من مثل (**محمود باشا الجاف، ومصطفى باشا باجلان، وابرهيم خان دلوى، وملا محمود مزناوى .......الخ**)، فضلاً عن الاحداث الاجتماعية المرتبطة بالقوافل التجارية القادمة من اعالي كوردستان والمارة بـ (**گەرميان**) والمتجهة الى بغداد وما والاها، كما تناولت موضوع القبائل المتنقلة والأزمات الاجتماعية المرافقة لها مابين القبائل والعشائر الكردية بما فيها اسكانهم وتركهم حياة التنقل تلك، بالأخص عشيرة الجاف التى كانت تنتهج هذا النمط من الحياة وكانت دائمة الترحال ما بين (**منطقتي گەرميان وكويستان** ) .

## Abstract

This study is intended to show what the weekly "Peshkawtin" newspaper has dealt with. Ever since the day it began to publish, the paper gave an overwhelming coverage of the historical events that took place in Garmyan from the period between (1920–1922). Through this newspaper, we get firsthand information of many real events concerning our topic, events which would have remained unknown without this newspaper, as they required a great amount of scrutiny, perusal, and objectivity.

Throughout the years of publication, Peshkawtin covered the events and the developments in Garmyan in a comprehensive and responsible manner, about what happened at "Garmyan" through that period. It also provided a means for the poets and men of letters to get their works published as well as helping to verify some important events of the period.

As far as Peshkawtin’s treatment of the social affairs, it obviously took an interest in the role of the tribal leaders, or the death of the notables and personalities like (Mhmood Pasha Jaff, Moustafa Pasha Bajallan , Ibrahim Khan Daloiy, and Moula Mhmood Maznawe ……etc. ).

Among other issues treated in the newspaper was the and the social problems encountered by them, such as settlements and discarding their nomadic life, especially the "Jaff" tribe who often moved between "Garmyan and Qwestan" .

# کەرکووك: پارسەنگی تەرازووی عیراق "جاران و ئێستا" *

د. میریلا گالێتی**
وەرگێڕان: د. شەماڵ حەوێزی

کەرکووك، ماوەیەکی دوورودرێژە شاری کۆمەڵە ئیتنییە جۆراوجۆرەکانە وەك کورد، تورکمان، کلدان، ئاشووری، عەرەب و جوولەکە، کە سێ ئاینی ئاسمانی پێك دێنن (جوولەکە، مەسیحی و ئیسلام) ئەمانە پێکەوەش دەژیان. پەیڕەوانی هەر یەکێك لەم ئاینانە ریشەڵەکی مێژوویی، یان ئاینی بەم شارەی دەبەستێتەوە، زۆر جاریش بە بێ ئەوەی درکی پێ بکات. بۆ نموونە، لە دێری " ئاد ئاکواس سالڤیاس– Ad Aquas Salvias" لە رۆما، ستایشی سەرۆکی سانت ئەناستاسیۆس لە سەدەی حەوتەمینی زاینییەوە کراوە. ئەو راهیبە فارسە لە ساڵی ٦٢٨ زاینی لە کەرکووك شەهید بووە. دوازدە هەزار کریستیان لە ساڵی ٤٤٥ – ی زاینی لەم شارە شەهید کران. ئەم ژمارە زێدەڕۆیی تێدا هەیە، بەڵام هێمایەکیشە بۆ زۆری ژمارەی کریستیان لەم ناوچەیەدا.

لەو ئەڵقە لێکۆڵینەوەیەی ساڵی (٢٠٠١) لە لەندەن لە لایەن بەرهەڵستکارانی عێراقی رژێمی بەعس ساز کرا (کورد، عەرەبی شیعە و تورکمان)، کەرکووك بە شاری تەبایی ئیتنی ناسێندرا [1]. بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ، دانیشتوانی کەرکووك خۆیان لە دانیشتوانەکەی دیکەی ولاَتی میسۆپۆتامیا و شارۆچکە کوردییەکان جیا کردبۆوە، بە تایبەتمەندییە فرەییە کولتووری، ئاینی، زمانی و ئیتنییەکانی خۆیان. ئەم فرە رەنگییە لە رووی مێژووییەوە بۆ هەزاران ساڵ دۆکیومێنت کراوە و پاراستنەکەشی گرنگیی خۆی هەیە، سەرباری سیاسەتی تەعریبی پەیڕەوکراو لە لایەن رژێمی بەعسەوە لە حەفتاکانەوە تاکو رووخانی ئەو رژێمە لە ٢٠٠٣.

ناسنامەی کەرکوك رەنگدانەوەی پێکهاتە فرە ئیتنییەکەیەتی. دوای دۆزینەوە و هەڵکۆڵینی کێڵگە نەوتییە دەوڵەمەندەکانی، نازناوی "شاری زێڕی رەش" یان "شاری ئاگری هەتاهەتایی"[٢] پێ بەخشرا.

کەرکوك بە کێڵگە نەوتی و کشتوکاڵییەکانییەوە دەوڵەمەندە. لە رووی جوگرافییەوە، دەکەوێتە سەر رێگەی بازرگانیی ستراتیجی نێوان ئەنادۆڵ، ئێران و عێراق. ئەمە هۆی سەرەکیی هەوڵی حوکمڕانەکانی پێشوو بووە بۆ نیشتەجێکردنی تورکمان لە ناوچەکەدا.

لە سەردەمێکی کۆنەوە نەوت لە ناوچەی بابە گوڕگوڕی نزیك کەرکوك دۆزرایەوە. سوپای عوسمانی لە ساڵی ١٦٣٩ وە نەوتی لەم ناوچەیەدا بە شێوازی سەرەتایی دەرهێناوە.

کوردستان بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بووە گۆڕەپانی شەڕی نێوان سەفەوییە شیعەکان، کە تەورێز پایتەختی بووە، و عوسمانییە سونییەکان لە سەدەی حەڤدەمین و هەژدەمیندا. کەرکووکیش بە هۆی جێگە ستراتیجییەکەیەوە لەم شەڕانەدا چەندین جار ئەم دەست و ئەو دەستی کردووە.

دۆزینەوەی بڕێکی زۆر نەوت لە کەرکوك بووە هۆی لکاندنیەوە (١٩٢٥/١٢/١٦)، وەك بەشێك لە ویلایەتی مووسڵ، بە مەملەکەتی عێراق، کە لە ژێر ئینتیدابی بەریتانی ساڵی ١٩٢١ دروست کرا. بە سیستەمکردن و رێکخستنی وەبەرهێنانی نەوتی کێڵگەکانی کەرکوك تاکو ئاداری ١٩٢٥ دەستی پێ نەکرد. کۆمپانیای نەوتی تورکیا (TPC)، کە لە ساڵی ١٩١٤ لە ئەستەمبۆڵ دامەزرا، ئیمتیازی بەکارهێنانی کێڵگەکانی نەوتی لە هەردوو ویلایەتی بەغدا و مووسڵ لە لایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە پێدرا.

لە ٢٧- ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٧ نەوت لە کێڵگەکانی بابە گوڕگوڕی نزیك کەرکووکەوە هاتەدەر و ناوی کۆمپانیاکەش گۆڕدرا بۆ کۆمپانیای نەوتی عێراق (IPC)، کە لە ١٩٣١ توانی زۆربەی کێڵگەکانی باکوری رۆژهەڵاتی عێراق بەکار بێنێت. دامەزراندنی پیشەسازی نەوت لە کەرکوك گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی و مۆرکی ئیتنی لە شارەکە هێنا کایەوە، کۆمپانیای نەوتی بەریتانیا ژمارەیەکی زۆر

کەسی دامەزراند، زۆربەشیانی لە دانیشتوانی پارێزگاکانی (لیوای ئەو کات) تر هێنا و دایمەزراندن و دواییش لە کەرکوک نیشتەجێ بوون.

ئەمە لە ماوەیەکی تا رادەیەك کورتدا بووە هۆی دروستبوونی گەڕەکی خۆجێیی (self- contained) لەپاڵ گەڕەکە کۆنەکان و گەڕەکە تازەکانی شارەکە، کە زۆربەیان بۆ ئاشووری و عەرەبەکان لە نزیك دامودەزگاکانی کۆمپانیای نەوت دروست کرابوون. رێژەی سەدی کرێکارە دامەزراوە کوردەکان لە هەمووان کەمتر بوو. ئینجا، وەبەرهێنانی کێڵگە نەوتییەکانی کەرکوك و دەوروبەری بووە مایەی بەردەوامبوونی نیشتەجێکردنی ژمارەیەکی زۆر کەسی پارێزگاکانی دیکە.

لە ناوەڕاستی سییەکاندا، حکوومەت هەنگاوێکی دیکەی بۆ نیشتەجێکردنی خێڵە عەرەبەکان پەیڕەو کرد بە رێگەی دروستکردنی پرۆژەی ئاودێری لە دەشتی حەویجە. کە دەکەوێتە باکوری رۆژئاوای کەرکووك. حکوومەت خێڵی عەرەبی وای هێنایە حەویجە کە هیچیان لە کشتوکاڵ نەدەزانی و پێشتر جووتیار نەبوون. گوندی نوێی بۆ دروست کردن و زەوی بە سەریاندا دابەش کرد. ئەمە یەکەم مستەوتەنە (Settlement) بوو لە پارێزگای کەرکوك کە لە لایەن حکوومەتەکانی رژێمی پاشایەتییەوە پلانی بۆ دارێژرا و جێبەجێ کرا[٣]. لەم رۆژگارەوە و بەتایبەتیش لە دوای ١٩٦٣ وە هەوڵی بەردەوام دراوە بۆ گۆڕینی پێکهاتەی ئیتنیی ئەم ناوچەیە.

## رەگ و ریشاڵە مێژووییەکان

مێژووی دێرینی کەرکوك باس دەکات کە نەبوخودنەسر شارەکەی دروست کردووە، کە بە کارخا دبێت سلۆخ (Karkha de Bêth Slôkh) لە سەرچاوە سریانییەکان ناسراوە، لە نێوان ساڵانی ٦٠٥ و ٥٦٢ — ی پێش زایین، دوای رووخانی نەینەوا ( ٦١٢ پ.ز.). ئەم رێکەوتە رەنگە رێی بچێ، بەو پێیەی کە هاوکات بوو لەگەڵ نەمانی ناوی ئەراپخا لە تێکستەکاندا، کە پاشماوەکانی دەکەوێتە باکوری رۆژئاوای کەرکوك و نزیکەی سێ کیلۆمەتر لێیەوە دوورە[٤]، کەرکوك، دی بێت سلۆخی دێرین، پایتەختی دێرینی ئەراپخا، ئەرەفە، لە

ناوەڕاستی هەزارەی دووەم و لە سەردەمی تیرەی ئاری میتانیدا (١٦–١٤ سەدە پ. ز.) گەشەی کرد؛ دواتر بووە شوێنی ساکای بەڕەچەڵەك ئەدیابین (١٣٠ پ. ز.).[٥]

کوینتوس کرتیوس نووسیویەتی، کە دوای سەرکەوتنی لە ئەربێلا (٣٣١/١٠/١ پ. ز.):

*ئەسکەندەر لە چوارەمین ڕۆژی گەشتەکەیدا گەیشتە شاری مێنس. لەم شوێنەدا ئەشکەوتێکی گەورە هەبوو، کانییەکی تێدا بوو کە بڕێکی زۆر قیری لێوە دەهاتەدەر ڕاستییەکی روون و ئاشکراش هەیە کە شوورەکانی بابل لە ڕێگەی کارێکی لە رادەبەدەر قورسەوە بە قیری ئەو کانییە سواغ درابوون* (V, I, 16)[٦]، ڕەنگە ئەم شارە کەرکووکی ئێستا بێت.[٧]

پلوتارك وەسفێکی دوورودرێژی نەوت (Naphtha) دەکات کە بەسەر ڕێگادا دەکرا و ئاگری بڵێسەداری لێوە پەیدا دەبوو و بەملا و ئەولادا بڵاو دەبۆوە (٣٥. ١–٢).[٨] ئەمە یەکەمین جار بوو گەلی گریك (یۆنان) ئاگرە نەمرەکەی بابە گوڕگوڕ ببینن. ئەسکەندەری گەورە، لەسەر پێشنیازی حەمامچییەکەی خۆی ڕێگەی بە دووەمین تاقیکردنەوە دا. لە گۆڕەپانەکەدا نەوتیان بە منداڵێکدا کرد و ئاگریان تێبەردا. گڕی ئاگر بەشێوەیەکی سامناك سووتاندی، بەڵام بە پێداکرنی چەند سەتڵێك ئاو ڕزگاری بوو.[٩] داریۆشی شای فارس یان ئەسکەندەری گەورە گوتوویەتی پێنج خێڵ لە شاری عەشتاری فارس بێنن و لە کەرخا نیشتەجێیان بکەن.[١٠] لوشرانژ لە کتێبەکەیدا دەڵێت ناوی (کارکوك) ئاماژەی بۆ نەکراوە نە لەلایەن جوگرافیاناسە دێرینەکان، نە لە لایەن یاقووتەوە؛ بەڵام لە لایەن عەلی یەزدییەوە (١٦٦١) ئاماژەی پێکراوە، وەك شوێنێکە لە نزیك تاوق.[١١]

سەرچاوەکانی زانیاریی ڕۆژهەڵاتی دەربارەی ئەم شارە کەمن. مێژووناسی گەورەی کورد، میری بتلیس، شەرەفخانی بتلیسی (١٥٤٣– ١٦٠٤)، دەڵێ کە لە سەرەتای سەدەی شازدەمیندا " لە سەردەمی ئیمارەتی باباندا (بابان هەموو سلێمانی و بەشێك لە کەرکووکی لە خۆ گرتبوو) میر بداخی کوڕی عەبدال بەگ، کەرکووکی گرتووە کە لە ژێر دەسەڵاتی بەغدا بووە."[١٢]

گـەڕۆکی بـەناوبانگی عـەرەب، ئـیبن بەتووتـە (١٣٠٤–١٣٧٧) سـەردانی کەرکووکی نەکردووە، ئەولیا چەلەبی بە رەچەڵەك تورك (١٦١١–١٦٨٢) باسی لـە هەڵقوڵانی نەوت لە کێڵگەکانی کەرکووك کردووە. لە سەرەتای سەدەی نۆزدەمیندا میرزا ئەبو تاڵب خان (فارسی) بەم شێوەیە وەسفی کەرکووك دەکات:

گەورەیە و باش پارێزراوە؛ بەڵام مەترسی داڕمانی لێ دەکرێت. ئەو خانووانەی دەکەونە ناو شوورەی قەڵا هەموویان لە بەرد و خشت (کـەرپووچ) بنیـات نـراون، بەڵام خانووەکانی دەوروبەر لە قوڕ دروست کراون. چـونکە کـەرکووك دەکەوێتـە ناوەڕاسـتی دەشـتێکی فـراوان، سـیمایەکی دیـاری هەیـە و زۆر لـە دوورەوە دەبیندرێت. (١٣)

**ئەدەبی سەفەر**

ئەدەبی گەڕیدە رۆژئاواییەکان دەربـارەی کوردسـتان زۆر و زەبەنـدە، بـەڵام زانیاری دەربارەی کەرکووك زۆر کەمە و زەحمەتە شـتی ئـەوتۆ پـێش ناوەڕاسـتی سـەدەی نۆزدەهـەم بدۆزیتـەوە. رەنگـە ئەمـەیان بگەڕێتـەوە بـۆ پێگـە جوگرافییەکەی کەرکووك خـۆی، کـە زێـی دجلـەی بـە نـاو شـارەکەدا تێناپـەڕێت. دجلە رێگەی نێوان مووسڵ و بەغدایە دەگرێتە بەر و بە هـەردوو شـارەکەدا تێپـەڕ دەبێت. هەروەها کەرکووك نە رێگەی بازرگانی نێوان بەغدا و وڵاتـی فـارس بـووە، نە گەڕیدەکانیش سەردانییان کردووە، چـونکە سـەرنجی رانەکێشـابوون. لـە بـاتی ئەو سەردانی هەولێریان دەکرد، بە هۆی شەڕی ئەربێلا، کـە تیایـدا ئەسـکەندەری گەورە سەرکەوتنی وەدەست هێنا. ئامێدییان پـتر پەسـند دەکـرد بـەهۆی شـوێنە سەیرەکەی کە بەسـەر چـیاوە هـەڵترووکاوە، بەلایانـەوە شـوێنێکی شـیاوتر بـوو، هـەروەها لەبـەر گرنگیـی بـوونی کریسـتیان و جوولەکـەکان تێیـدا. سـلێمانی و دۆڵەکانی لە کۆتایی سەدەی ١٨ دا سەرنجڕاکێش بوون.

هەموو ئەم شـارانە لـە ژێـر دەسـەڵاتی بنەماڵـە دەسـەڵاتدارە کوردەکانـدا بوون. ئەو شارانەی پـتر باسـی لێـوە کـراوە و لەبـەر هێمـای گرنگیـی شـوێنەکەی (پێگەکـەی) – ئامێـدی (لـە پـێش هـەموان لـە سـەدەی ١٧ و ١٨ دا)، بتلـیس و دیاربەکر (ئامەد) تاکو سـەدەی ١٩ دا، هـەولێر لـە سـەدەی ١٨ بـەدواوە، مـاردین

پێش سەدەی ١٨، سلێمانی بە درێژایی سەدەی ١٩. هۆی هەبوونی زانیارییەکی کەم دەربارەی کەرکووک ڕەنگە بگەڕێتەوە بۆ بارە ناسەقامگیرییەکەی ئەم شارە هەندێك جار لە ژێر دەسەلاتی فارسەکان بووە؛ هەندێك جاری تریش لە ژێر کارتێکردنی حکوومەتی بەغدا بووە.

سەردەمی زێڕینی سەفەر و دۆزینەوە لەم پارچەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، لە ناوەڕاستی سەدەی ١٩ وە دەستی پێکرد. سەرەتا بە شێوەی تەقلیدی بوو، وەك گەڕیدەکان، دپلۆماتەکان، بانگەوازخوازە کاتۆلیکەکان و بازرگانەکان لە سەدەی ١٩ دا، دوایی گرووپێکی نوێشی هاتە پاڵ؛ ئەفسەرەکانی سوپا، شوێنەوارناسەکان، ئەنگلۆ- ساکسۆن و بانگەوازخوازە پرۆتستانتە ئەمریکییەکان. زۆربەیان بەکرێگیراو و ئامرازی کاریگەری دەسەلاتدارانی ئەورووپا بوون. لە ڕێگەی حکوومەتەکانیانەوە بۆ کوردستان نێردرابوون، بە مەبەستی سۆسەکردن و کۆکردنەوەی زانیاریی جوگرافی و ستراتیجی. کە بریتی بوو لە جوگرافیای هەرێمەکان، شوێنی ڕێگا ئاوی و زەمینییەکان کە شارەکان پێکەوە دەبەستێتەوە، شێوەی فیزیائی زەوی، تێبینییە زانستییەکان دەربارەی سەرچاوە کانزاییەکان، جۆریی خاك و کشتوکاڵ، مێگەل، ژمارە و قەبارەی دارمان، ژینگە، شوێنەوار، سوپا، ئاسایش، سیستمی باج، تایەفە (جالیە) ئاینییەکان،[١٤] هەڵسەنگاندنی تایبەتمەندییە سۆسیۆ - ئەنسرۆپۆلۆجییەکان (کومەلایەتی و مرۆییەکان)، و هەروا.[١٥] گرنگیدان بە شاری کەرکووك دەگەڕێتەوە بۆ هەبوونی نەوت لەم ناوچەیە و گرنگیی نەوت لە ئابووریی جیهاندا.

گەڕیدە ئەورووپییەکان تورك بە زەوتکەری خاکی دێر زەمانی کریستانەکان دادەنێن، ئەمەش هۆیەکی خواستی گەڕاندنەوەی ئەم زەوییانەیە بۆ خاوەنە ڕەسەنەکەی. ئەمەش هۆی ئەوە دیاری دەکات کە بۆ گۆڤار و ڕاپۆرتی گەڕیدەکان ناوی ئەو شوێنەوارانەی لە خۆ گرتووە کە دەگەڕێتەوە بۆ چاخی دێرین. وێرانبوونیشی دەگەڕێننەوە بۆ پشتگوێخستنیان لە لایەن حکوومەتی عوسمانییەوە. ڕاپۆرتەکان باس لەو تەنگوچەڵەمە دەکەن کە گەڕیدەکان تووشی هاتوون. لە وەسفکردنێکی هاوسەنگ و بابەتییانە بۆ مۆنیومێنتە مێژووییەکان

وەك نموونەی ئەو قەڵایانەی کە بە گریکی و لاتینی نەخشـاندراون لـە لایەکـەوە، و شوێنە پیرۆزەکانی کریستیانەکان و شوێنی حەجیان لە لایەکی ترەوە.[١٦]

لیفتنانت کۆلۆنێل چێسنی نووسیویەتی:

*لە هەندێك حاڵەتدا، هەندێك لـە شـوێنە دێرینـەکان تـا ئێسـتاش دەناسـرێنەوە، بـەڵام ژمارەیـەکی زۆرتریـان نـا ناسـرێنەوە؛ شـارەکانی ئـەو ئیمپراتۆرییـە نایابـە (ئاشووری) بـە ئەسـتەم بـەدی دەکـرێن لەبـەر شـارە تازەکـانی مووسـڵ، سـێرت، ئامێدی (شاری مادەکان)، بتلیس، وان، هەولێر، سلێمانی، کەرکووك، کۆیە، زاخۆ، رواندوز، و جۆلەمێرگ (هەکاری).*[١٧]

لـە سـەدەی ١٩ دا، باسـەکانی گەڕیـدەکان زۆر لایـەنی وێکچـوویان هـەبووە. هەموویان بـە راشـکاوی ئاماژەیـان بـە گەشـتەکەی زانـا و دۆزەرەوەی دانیمـارکی کارستن نیبور کردووە. لەم باسانەدا کەرکوك لەگەڵ هەولێر بەراورد کراون لەبـەر ئەوەی هەردووکیان لەسـەر قـەڵا دامـەزراون. وێـڕای بـوونی نـەوت، و کەسـایەتییە (مۆرك) فرە ئیتنییەکی کە لە کورد، عەرەب، تورکمان، جوولەکە، کلـدۆ- ئاشـوور پێکهـاتووە. زۆر لـە گەڕیـدەکان ئامـاژە بـە نووسـینی نووسـەرە دێرینـە گریـك و لاتینەکان، دەربارەی کەرکووك دەکەن.

پتر ئاماژە بە مەزاری دانیال پێغەمبەر دەکرێت. کە تـا ئێسـتاش مەزارگەیـە لـە کەرکووك، بەڵام گۆڕە راستەقینەکە لە سوسەیە.[١٨]لە مزگـەوتی دانیـال پێغەمبـەر دەڵێن: دانیال پێغەمبەر و هاوەڵەکانی حەنانیـە، میخائیـل و عـوزێرە (عـزرا) لێـرە نێژراون، کە لە ماڵی نەبوخودنەسر کاریان دەکرد. بە پێی کیتـابی پـیرۆز (Bible)، پاشا پەیکەرێکی مەزنی لـە زێـڕ داتاشـیوە و داواشـی لـە هـەموو شـوێنکەوتووانی خۆی کردووە خۆشیان بوێت و پـیرۆزی کـەن. سـێ هاوەڵەکـەی دانیـال داواکـەیان رەت کردۆتەوە و فڕێدرانە ناو کوورەی ئاگر. بـەڵام بلێسـەی ئـاگر نەیسـووتاندن و نەبوخودنەسـر، بـاوەڕی بـە پـەرجوو (موعجیزەکـەیان) هێنـاوە و فـەرمانی داوە ئەوانەی تۆمەتەکەیان بۆ هەڵبەسـتبوون بخرێنـە نـاو کوورەکـەوە.[١٩] ئـەم نەریتـە دێرینە پەیوەستە بە "سووتان بە کوورەی ئاگر"، کە سەرچـاوەکەی دەگەڕێتـەوە بۆ ئاگرە هەمیشەییەکەی غازی نەوتی ئەو شوێنەی پێی دەگوترێت بابـە گوڕگـوڕ کـە دەکەوێتـە دووری دوو میـل لـە بـاکوری- رۆژئـاوای شـارەکە. دەگـوترێ ئـەم

مزگەوتە تاکو سەدەی ١٨ کەنیسە بووە.[٢٠] هەرچەندە سەرچاوەکانی سەدەی پێنج باسی ئەم کەنیسەیە ناکەن، ئەمەش گەواهی ئەوەیە کە نەریتەکە کۆن نییە.[٢١]

لە ساڵی ١٦٧٨، پزیشکی ڤینیسی ئەنجیلۆ لیگرنزی، سەردانی میزۆپۆتامیا و وڵاتی فارسی کردووە و بابەتێکی لە گۆڤارێکدا بڵاوکردۆتەوە بە ناونیشانی "دەربارەی نەتەوەی کورد"، لە گۆڤارەکەدا نووسەر بە هەڵە تکریتی لێ بۆتە کەرکووک. بۆیە گێڕانەوەکەی ورد نییە.[٢٢] کرستین نیبور یەکەمین وەسفی درێژی کەرکووکی کردووە لە کۆتایی سەدەی ١٨ دا. وەسفەکەی بەتەواوی لە خوارەوە بڵاودەکەینەوە لەبەر گرنگیی بوونی و هەروەها بەهۆی ئەوە کە وەك سەرچاوەیەك لە لایەن ژمارەیەکی زۆر نووسەر بەکار دەهێندرێت:

*کەرکووك دەکەوێتە ناو دەشتێکی جوان و بەپیت، بە دەگمەن دەکرێتە کشتوکاڵ، دەکەوێتە سەر هێڵی پانی ٢٩ ر٣٥ پلە. زۆر کەم پاشماوەی شارەکە ماوەتەوە کە دەکەوێتە بناری گردێکی بەردەڵان. گردەکە بە دیوارێکی زەمینی دەورە دراوە، پێی دەوترێ قەڵا چونکە کاتی خۆی سوپای ئینکشاری تێدا بووە. قەڵاکە زۆر پیس بوو، لە ژیانمدا شوێنێکی وام نەدیوە، هەروەها بیناکان لە بارێکی زۆر خراپدا بوون. سێ مزگەوتی بە منارەی لێ بوو یەکێکیان جیاوازبوو، چونکە گۆڕی دانیال پێغەمبەر، حەنانیە، میخائیل و عوزێری لێ بوو. جوولەکەکان گومانیان نەبوو کە ئەم پێغەمبەرانە بە فیعلی لێرە نێژراون. موسڵمانەکان رێگایان پێ نەدەدان کە بچنە ناو مزگەوتەکە و لە نزیك گۆڕەکانیان نوێژ بکەن.*

*نزیکەی چل نستووری لە کەرکووك هەبوون، کە دواتر چووبوونە سەر کەنیسەی رۆمانی. کە زانییان کەسێکی ئەورووپی گەیشتۆتە شارەکە، یەکسەر هەندێکیان سەردانیان کردم خۆشحاڵ بوون بە دیداری پیاوێکی شاری نەمر (رۆما) و پێیان داگرت تاکو چەند رۆژێك پتر بمێنمەوە. شکایەتیان لە کەللەڕەقیی کریستیانە رۆژهەڵاتییەکانی دیکە دەکرد، کە ئامادە نەبوون دەستبەرداری هەڵە کۆنەکانیان بن و ئیعتراف بە پاپا بکەن وەك سەرپەرشتیاری کەنیسەی یەسووعی مەسیح. رێنمایی ئەم کەسە باشانەم کرد کە دان بەخۆیان بگرن و تەحەمولی*

*کریستیانەکانی تر بکەن و سەبریان هەبێت، بەبێ ئەوەی پێیان بڵێم کە منیش لە سەر مەزهەبەکەیان نیم.*

*بە گشتی تێبینی ئەوەم کرد، کە هەموو کریستیانە ڕۆژهەڵاتییەکان یارمەتی یەکتری دەدەن، بەڵام هەموویان پەیڕەوی ڕۆمی کاتۆلیك ناکەن. هەموو ئەوانەی لە ڕێگەی راهیبە ئەوروپییەکان و بانگخوازەکانیان ببوونە کریستیان، دوژمنی سەرسەختی ئەوانە بوون کە نەیاندەویست دەستبەرداری کەنیسە کۆنەکەیان بن.*

*کەرکووك شوێنی نیشتەجێی پاشای ئەسپە دوو کلکەکان، ئەو لە ناو شار نەدەژیا بەڵکە لە دەوروبەر، لە کەناری ئەوبەری رووبار. ناوچەکە زۆر سنووردار بوو. پاشماوەی حکوومەتی گەورەی سخار ئسولێ کە قەڵەمڕەوەکەی لە ڕێگەی تاوقەوە دەستی پێدەکرد تا هەولێر، کە ئێستا سەر بە بەغدایە، وەك پێشتر ئاماژەم پێکردبوو. نادر شا هەوڵێکی بەهێزی نەدا بۆ داگیرکردنی شار و قەڵاتەکەی؛ لەبەر ئەوەی لە مووسڵ زۆر خۆشحاڵ نەبوو، ناچار بوو پاشەکشەیەکی ڕێك بکات، بۆیە زۆری لەدەست دا. من زۆر بۆمبم بینی لە ڕێگەی پاشەکشەی فارسەکان، کە بیست ساڵ لەمەوبەر بەجێیان هێشتبوو. لەو ڕێگەیەدا ئاشی ئاوی زۆرم بینی؛ کە دەری دەخات بۆ ئەو هەموو ئاردە لێرەوە بۆ بەغدا دەچوو، لە بەسرەوەش خورما و کەلوپەلی تر دەهێندرا. هەروەها باس کراوە کە لە نزیك کەرکووك کانی هەبووە قیری لێ هاتۆتە دەر. شوێنەکەش ناوی بابە گوڕگوڕ بووە کە لە هەمووان زیاتر ناسرابوو، چونکە زەوییەکەی بە رادەیەك گەرم بووە توانای کوڵاندنی هێلکە و گۆشتی هەبووە. تەنیا ئەوەندەت پێویستە چاڵێك هەڵکەنی و مەنجەڵەکەتی بخەیتە ناو. باس کراوە کە بە شەو بڵێسەکان دەبیندران، من ئەمەم لەو کەسانە بیست کە سەردانی شوێنەکەیان کردبوو.*[(٢٣)]

لە کۆتایی سەدەی ١٨ حکوومەتی فەرەنسا جیلوم ئەنتوین ئۆلیڤەری ناردە رۆژهەلاتی ناوەڕاست وەسفێکی دووروودرێژی دەربارەی کەرکووك ئامادە کردووە بەرەچاوکردنی راپۆرتەکەی نیبور:

*کەرکووك، وەك هەولێر کەوتۆتە سەر گردێك لە ناوەڕاستی دەشتێکی فراوان، بە شوورەیەکی بەرگری و ئۆردوویەکی بەهێزی ئینکشارییەکان دەورە دراوە. پاشای*

*بەغدا دەستی بەسەر موتەسەلیم دا گرتبوو.*[٢٤] *بەشێکی شارەکە دەکەوێتە خوار گردەکە.*

*کەرکووک بۆ ماوەیەکی درێژ بەشێك بوو لە پاشایەتی (Pashaliq) شارەزوور؛ بۆیە پاشای دوو کلکی هەبوو، بەڵام ئێستا لە کەرکووک تەنیا موتەسەلیم هەیە کە پاشا دایمەزراندووە، شارەزوور، و هەموو ئەو ناوچەی دەکەوێتە رۆژهەڵاتی دجلە، زابی گەورە و کوردستان بەشێك بوون لە پاشایەتی بەغدا.*

*شارەکە رەنگە شوێنی مێنیسی کۆنی گرتبێتەوە، ئەمە هەر مەزەندەی خۆمانە و هیچی تر. کوینتوس کرتیوس دەڵێ ئەسکەندەری گەورە بە لەشکرەکەیەوە لە رێگەی چوونی بۆ بابل، بەچوار رۆژ لە هەولێرەوە گەیشتە مێنیس. مێنیس شارێکی ناسراو بوو بەهۆی ئەو ئەشکەوتەی برێکی زۆر قیری لێ هەڵدەقوڵی و بە پێی نەریتیش دەبوایە دیوارەکان بەو قیرە سواغ درابان. لە راستیدا ئەو قیرە لە ناوچەی کەرکووك وەرگیراوە، هەر وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد.*

*ئێمە لە هەولێرەوە بە سواری ئەسپ بە پازدە سەعات گەیشتینە کەرکووك [...]. لەم ناوچەیەدا پاشماوە و شوێنی باشتر لە کەرکووکمان نەبینی. هەر بۆیەش رەنگە گردەکە هەر لە چاخی کۆنەوە پێگەی شارێکی گرنگ بووبێت. هەر لە دەرچوونمانەوە لە مووسڵەوە نەوتمان بۆ رووناکی بەکارهێنا. فتیلەیەکی پەمۆی خاو لە قیری ناو دەفرێك هەڵدەکێشرێت و ئاگری تێ بەردەدرێت (چرا رەشکە). بۆنی ئەم چرایە لە ژوورەوە تەحەمول نەدەکرا، مەگەر کونێکی گەورەی لە دیواردا بۆ بکرابایەوە تاکو دووکەڵەکەی بچێتە دەرەوە. تەرسی مانگا، کا و قیر تێکەڵ بەیەك دەکرێت و بەشێوەی خشت دروست دەکرێت تاکو بۆ رووناکی و چێشتلێنان بەکار بهێندرێت، داوە کەتانی کۆن لە نەوتی رەش هەڵدەکێشرا بۆ رووناککردنەوەی رێگاکان وەك چرا بەکار دەهات.*[٢٥]

جیوسپ کامپانیلی کە دۆمەنیکانێکی ئیتالییە، لە ساڵی ١٨١٨ دا وەسفێکی تێروتەسەلی هەموو کوردستانی کردووە. ئاماژەشی بە کەرکووك کردووە، چونکە لە ژێر حوکمی بابانەکاندا بووە (ل ٥١، ٥٣) هەروەها بە هۆی پەیوەندی بازرگانی

لەگەڵ شاری ئاکرێی کوردی کە عەشیرەتی بەهێز و شەرکەری زێباری لێی دەژیا (ل ٣٤).[٢٦]

تۆژەرەوەی ئیتالی جایتانۆ مۆرۆنی وەسفی کەرکووکی لە کتێبەکەی خۆیدا *Dizionario* – دا کردووە وەك *" شاری سەرەکی سنجاقەکە، دەکەوێتە سەر گردێك لە ناوەڕاستی دەشتێکدا. شارەکە قەڵایەکی بۆ بەرگری هەیە و لەسەر بەرزاییەکی رکە، لە خوارەوە رووباری کەرکووکی (خاسە – وەرگێڕ) لێیە مزگەوتێکی بەناوبانگیشی لێیە، لەبەر ئەوەی دەڵێن گۆڕی دانیال پێغەمبەر و هاوەڵەکانی تێدایە، بەڵام تورکەکان رێگەیان بە جوولەکەکان نەداوە سەردانی ئەم شوێنە بکەن. لێرەدا تورك، ئەرمەن، نەستووری و کورد... ژیاون. نۆ کەنیسە و ١٧٠٠ کەسی کاتۆلیکی لێیە."* [٢٧]

ئەفسەری فەرەنسی فیلیکس دی بۆژوور لە نووسینێکیدا وەسفێکی پوختەی شارەکە دەکات: *"... لە رێگەی بە پیادە رۆیشتن بۆ کەرکووك بۆ ناو جۆگەلەکاندا، هەڵقوڵینی نەوت دەبینی. لە هەموو ناوچەکەدا چرای نەوت بەدی دەکەیت کە لە پەمۆی هەڵکێشراو لە نەوت دروست کراوە. کەرکووکیش، هەولێر ئاسا کەوتۆتە سەر* ***قەڵایەك لە ناوەڕاستی دەشتێکی جوان کە هەموو جۆرە میوەیەکی تێدایە. ئەم شارە رەنگە پێنج تا شەش هەزار کەسی لێ بێت، بە شوورەیەك دەورە دراوە کە ژمارەیەك داڵانی پێچاوپێچی تێدایە.*** [٢٨]

گەڕیدەی بەریتانی جەیمس س. بەکینگهام یەکێك لە دوورودرێژترین وەسفی کەرکووکی پێشکەش کردووە:

*لە سێ بەشی لێکجیا پێك دێت، هەر یەکێکیان بە قەبارە گەورەیە.* [٢٩] *بەشێکیان لە بنچینەدا گردێکی دەستکردی پان و بەرزە، کە لەسەر لێژاییەکی رِك قوت بۆتەوە، وەك ئەوەی هەولێر، کە پێشتر وەسف کرا. لە سەر ئەم گردە جگە لە قەڵا شارێکی بە شوورە دەورە دراو هەیە کە ژمارەیەکی زۆر خانووی تێدایە، منارەکانی سێ مزگەوتەکە لە خانووەکان بڵندترن. دەڵێن تەنیا موسڵمانەکان مافی ئەوەیان هەیە لەم بەشەدا نیشتەجێ بن، کە ژمارەیان پێنج تا شەش هەزار کەسە، بەڵام رەنگە زێدەڕۆیی تێدا هەبێت.*

*بەشی دووەمی شارەکە وەك دیارە ئاماژەیە بۆ جۆری پلەی دانیشتوانەکەی و گرنگییەکەشی لەوەیە کە شوێنی بەرگرییە، ئەم بەشە لە دوو بەشەکەی تر فراوانتر و لە رووی دانیشتوانەوە چڕتره. شوێنەکەی دەکەوێتە دەرەوە، لە دەشتی خوار قەڵاکە، و بەشە بەرزەکەی پێ دەوترا، خانە سەرەکییەکان، قاوەخانەکان و بازاڕەکان، تد..تێدا بوو؛ منارەی تەنیا دوو مزگەوت دەبیندران، بەم واتایە کە هەموو دانیشتوانی ئەم بەشە موسڵمان نەبوون، بەڵکو ئەرمەن، کلدان و کریستیانی سریانی لێ بوو. ژمارەی دانیشتوانەکەشی دەگەیشتە دەوری دە هەزار کەس، گۆڕستانەکەشی بەڕادەی گوندێکی قەوارە مام ناوەندی فراوان بوو.*

*بەشی سێیەم نیو میل لە دوو بەشەکەی تر دووره، لە خانووێکی ئەم بەشەدا نووستین تاکو خۆمان لە گەرما سووتێنەرەکەی رۆژ بپارێزین. ئەم بەشەیان لە دوو بەشەکەی تری شارەکە بچووکتر وپەرشوبڵاوتره. هەزار کەسیشی پتر تێدا نییە تاکو بخرێتە سەر ژمارەی سەرجەم دانیشتوانی کەرکووك کە هەر هەمووی دەکاتە نزیکەی ١٥ هەزار کەس.*

*ئەمە یەکەمین شوێن بوو کە داروڕەختمان لێ بینی دوای ئەوەی لە مووسڵەوە بەڕێ کەوتین، دار خورماشی لە شوێنەکانی تر پتر لێ بوو. زۆرم دەربارەی کانییەکانی نەوتی ئەم ناوچەیە بیستبوو، کە لە تەنیشت کەرکووکە، هەروەها دەربارەی ئەو زەوییەی کە بڵێسەی لێ هەڵدەستێت، کە دانیشتوان وەك پەرجوو سەیری دەکەن، لە هیچ شوێنێکی دنیاش نموونەی نییە، هەروەها هێمایەکی سەیری چاکەی خودایە بۆ خاکەکەیان. باسی ئەمەیان لە نیوەی شەودا دەکرد، لەو کاتەی کە لە نێوان گردۆڵکە بەردینەکاندا بە رێگای ئاڵتوون کۆپری (پردێ) بەرەو شارەکە دەرۆیشتین، بۆیە دەرفەتی بینینیانم نەبوو.*

*لە میانەی سۆسەکردنی ئەو وڵاتانەی دەکەونە کەنار دجلە و فورات، دوای پەڕینەوەی زاب، هەروا لە باسی رۆیشتنی بەرەو دەریا، دی ئەنقیلی دەڵێ، ئەو وڵاتانەی دەکەونە لای چەپ یان رۆژهەڵاتی کەنارەکە پێیان دەڵێن گەرمیان (Garm)، کە پێی وایە دۆزینەوەی گارامایی (Garamaei) ئاسانە، پتلیمۆس ئەو*

*ناوەی لەم وڵاتە نا دەکەوێتە ناو ئیمپراتۆریەتی ئاشوور، نزیك ناوەڕاستی نێوان باکور و باشوور.*[30]

*لە میانەی لێکۆڵینەوەم لەم ناوە، هیچ شتێکی ئەوتۆی باوەڕپێکراوم دەربارەی ئەم وڵاتە دەست نەکەوت، ئەوانەی لە لێکۆڵینەوەکەدا پەیوەندیم پێوە کردن تەنیا باسی ئەوەیان کرد کە لە ناو خەڵك باوە، و هیچم دەربارەی مێژوو و جوگرافیاکەی وەگیر نەکەوت. ڕەنگە، بەهەر حاڵ، کارخ، یان کەرخەی، ئەمیانوس مارسیلینیوس، و سیمۆکاتوس، کە کارخی ئێستایە، نزیك سامەڕا، لەسەر کەناری دجلە، لە خوارووی ئەمە؛ کەرخەش نزیکترە لە نەینەوا، بە قسەی ماسیۆس و ئۆرتلیۆس، کەرخە پێشتر ئەمەی دوایی لێ جیابۆتەوە و بۆتە کەرکووکی ئێستا، وا پێدەچێت کە بە گشتی دێمیتراس سترابۆ، و کۆرکورای پتلیمۆس بێت. سێ بەشەکەی شارەکە تاکو ئێستاش ماون، هەر چۆنێك بێت، ئەوەندە گەورەن کە ڕێگە بەوە بدات لە دواتر وەکو شار یان پایتەختی لێ هاتبێت، و ناوەکەشی زووتر بە هەرێمەکە بەخشیبێت، ئەگەر هاتبێ و بووبێتە گەرمە — ی ئاشوور، کە هەروا گەورەترین شارە لەو دەشتاییەی کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی دجلە؛ لە لایەکی دیکەوە بوونی قەڵاتێك لە سەر گردێکی بەرز، مانای ئەوەیە کە هەمیشە شوێنێکی قایم بووە و گرنگیی خۆی هەبووە، وێستگەیەکی سەربازی ڕۆمانەکان بووە، کە لەو کاتدا دەسەڵاتداری ناوچەکە بووینە. لە هەموو ڕووداوەکاندا، تۆزێك گومان هەیە دەربارەی دیارکردنی شوێنی کەرکوك لە لایەن ناوەندە دێرینە جوگرافیاناسە فەرەنسییەکانەوە، بە بەراورد لەگەڵ ئەو زانیارییە لۆکاڵییانەی ئەو باسی لێوە دەکات لەگەڵ ئەوەی ئەوانەی ئێستا لە نزیك شوێنەکە دەژین.*[31] *تیبولوس لە هۆنراوەکەیدا،*[32] *باس لە ناوچەی ئێریك دەکات، ئەو شارەی کە نەمروود لە کەناری ڕۆژئاوای دجلە لەسەر خاکی شینار دروستی کرد، کە کانییە نەوتییەکان دەگرێتە خۆی، و شاعیر پێی دەڵێت "ئاوە گرگرتووەکانی خاکی ئێریك،" ڕەنگە ئاماژە بەو زانیارییانە* (Account) *بکات کە لە سەردەمی ئەودا دەربارەی کانییەکان وەك جوگرافیای بابل و ئاشوور کە هەمیشە دەربارەی ڕۆمانەکان بە گشتی زانراوە، پاش نووسینەوەی مێژووی هێرشەکانی ئەسکەندەر بۆ ڕۆژهەڵات.*[33]

*لە کاتی گەڕانەوەم بۆ ماڵ لەو شوێنەی کە تەتەرەکان چادریان تێدا هەڵدابوو، خەڵکێکی زۆرم بینی کۆببوونەوە بۆ بەشداریکردن لە ئاهەنگێکی گەورەی کەیفوسەفا، ئەویش ئاهەنگی سەمای ورچ بوو. ورچێکی گەورەی سپی کە کوردەکان لە چیا بە بەفر پۆشراوەکانیان، دوای گەشتێکی چوار رۆژە لە رۆژهەڵاتەوە هێنابوویان بۆ نمایشکردن. دەیانگوت ئەم ئاژەڵانە لە شاخەکانیان زۆر دەگمەنن، ئەوان لێبوردە بوون لە کاتی نمایشکردنیدا (هەروا)، وا پێدەچوو کە بینینی ئەم ئاژەڵە لێرە زۆر بە دەگمەن دوویات دەبێتەوە.* [٣٤]

*لەو قسانەی رێنیشاندەرەکەم گوتی، هەندێکیان راست کرانەوە و هەندێکیشیان پەسند کران لە لایەن ئەو کەسانەی کە دەربارەی بابەتەکە پرسیارم لێ کردن، زانیم کە لە هەر یەکێك لەم سێ بەشەی کەرکووکیان پێکهێناوە، دە مزگەوت، ٢٤ قاوەخانە، دە خان، و دوو حەمامی گشتی لێ بووە؛ چوار یان پێنج پەرستگاشی لێ بووە بۆ تایەفە کریستیانەکان، شارەکە لەلایەن پاشای بەغداوە سەرپەرشتی دەکرا، دەوروبەرەکەشی بەرهەمێکی باشی هەبوو و باجێکی موحتەرەمی بۆ پاشا بە نیوچەوانییەوە بوو. حاکمی شارەکە یەکێك بوو لە باوەڕپێکراوە نزیکەکانی و راستەوخۆ سەر بە ئەو بوو، و ژمارەیەك پاسەوانی پێویستی بە مەبەستی پاراستنی بۆ دابین کردبوو.* [٣٥]

لە ناوەڕاستی سەدەی ١٩ دا پزیشك و جیۆلۆجیزانی بەریتانی ولیەم ئەینسۆرس ئاکارە جوگرافییەکانی کوردستان و هاوسێکانی کێومالْ کرد بۆ کۆمەڵەی جوگرافی مەلەکی. [٣٦] وەسفە جیۆلۆجییەکەی بۆ باشووری کوردستان بەم شێوەیە بوو:

*"(ناوچەکە) ئاوی سازگار، بەردی کلسی، گەچ، گەچی کلسی ـ لم و بەردی لمی، هەروەها قیر، نەوت، کبریت و خوێی تێدایە؛ سەرباری نافوورەی گڕداری بابە گوڕگوڕ یان بابە کەرکووك کە بەرزییەکەی ٥٤٣ پێیە."* [٣٧]

شیکارە جیۆلۆجییەکە دەری خست کە: *"بەردە کلسییەکەی بابە گوڕگوڕ، بابە کەرکووك بە تورکی، هەردووکیان بە مانای "باوکی کوڵان" دێت، ئەو شوێنە ناسراوە بۆ نمایشکردنی بڵێسە ئاگر، کە پێدەچێت لە زۆر دێر زەمانەوە هەبووبێت، وەك چۆن سترابۆ تێبینی کردبوو.*

*بەردی کلس لەم خاڵەدا بە تەواوی شوێنی مەرمەڕ و گەچی گرتبۆوە. ئاگرەکان لە لووتکەی لێوارەکەوە چڕ دەبوونەوە. چینە بەردەکان وەك یەك بڵند نەبوون، بەڵام لێژاییيەکە کەم یان زۆر لەهەمان خاڵدا وەك سەنتەرێکی هاوبەشی دروست دەکرد بە بێ ئەوەی هیچ مێڵێکی لاری دیاری هەبێت* [٣٨]

لێفتەنانت کولونیل جەی. شێڵ، دووەمین فەرماندەی سەربازی بەریتانی نێردراو بۆ ئێران ئەم تێبینییانە دەنووسێت:

*سێ میل پێش گەیشتن بە کەرکوك بە لای سێ چاڵە نەوتدا تێپەڕین، بۆنێکی ناخۆشی لێوە دەهات و تا مەودایەکی دوور بلاّو ببۆوە، نەوتی رەش لە کەرکوك بۆ چرا و چێشت لێنان بەکار دێت. کەرکوك شارێکی گەورەی کراوەیە لە دەشتاییدایە، وەکو هەموو ئەو شارانەی لەم پارچەی جیهاندان، دوچاری کاولکارییەکی گەورە بووە: تاعوون، برسییەتی، و پێم وایە کۆلێراش پێکاویەتی. لە نزیکیەوە قەڵایەك لەسەر گردێك دروست کراوە، زۆر بەرز نییە بەڵام لێژە (ڕکە). دەگوترێ جگە لە کارگەیەکی قوماشی رەنگینی زبر، هیچ کارگەی تری لێ نییە، هەروەها بازرگانی گەورەی گوێز کە لە چیاکانی کوردستانەوە دەهێندرا. ڕووبارەکەی کەرکوك ناوی خاسەیە، ئێستا وشکە: بۆ یەکەمین جار لێرە دار خورمامان بینی، کە لە کاتی پێویست، بەبیری دەهێنایەوە کە ئێستا ئێمە لە کەشوهەوایەکی زۆر گەرمداین. دانیشتوانەکە بریتی بوون لە عەرەب، عوسمانی، هەندێك کریستیان و جوولەکە، بەڵام بێ کورد. ژنەکان چارشێوێکی گەورەیان دەپۆشی، کاردانەوەیەکی سەیری لای ئەو کەسە دروست دەکرد کە پێشتر ژنی رۆژهەڵاتی بەم چارشێوەوە نەدیبووبێت.* [٣٩]

تۆژەرەوەی ئەڵمانی کارڵ ریتەر لە تۆژینەوەکەی دەربارەی کەرکووك پشتی بەستووە بەو وەسفە بایەخدارانەی لە لایەن گەڕیدە تازەکانەوە کراوە (نیبور، شێڵ، کیر پۆرتەر و ئاینسۆرس):

*ئەو شارەی دەکەوێتە خوار گردێکی ڕێك زۆر کەمی لێ ماوەتەوە، بە پێی نیبور گردەکە لە قەڵایەك و قشڵەیەکی بەهێزی سەربازی پێکهاتووە. نادر شا دوای ئابڵوقەیەکی نەپساوەی بیست و چوار رۆژی و بە هەوڵێکی کەم توانی دەستی بەسەردا بگرێت، شوێنەکە پیسە سێ مزگەوتی بە منارەی لێیە، یەکێکیان*

*گـۆڕی دانیـال پێغەمبـەر و هاوەڵـەکانی حەنانیـە، میخائیـل و عـوزێری لێیـە. لـە سـەردەمی نیبـور چـل خێزانـی ئاشـووری و کلـدانی لێ ژیـاوە، کـە خۆیـان بـە شوێنکەوتووانی پاپا (Uniates) لە قەڵەم دەدا (...).*

*کـوڕی ئـەدمیراڵی جەنـەوا ماوەیـەکی درێـژ لـە کـەرکووک ژیـاوە و ژمارەیـەک خانووی ئاوەدان کردۆتەوە. باوکی، جیغـالی[40]، لـە ئەسـتەمبوڵ زینـدانی بـووە و بۆتە موسڵمان و دواتر ناونیشانی پاشای وەرگرتووە، و بە جیغـالی زادە ناوبـانگی دەرکردووە...[41]*

*کیر پۆرتـەر دانیشتوانی کەرکووک بە ١٠٠٠٠ —١٢٠٠٠ کەس مەزەندە دەکات کـە بـریتین لـە تـورک، کـورد، عـەرەب، ئەرمـەن و جـوو. و بـە یـەکێك لـە گـرنگترین شارەکانی باشووری کوردسـتانی دادەنێت. لـە سـەردەمی نیبـور ژمارەیـەکی زۆر ئاشی ئاوێ کاریان دەکرد و ئاردیـان بـۆ بەغـدا دابـین دەکـرد بـۆ ئـاڵوێرکردنی بـە خورما و کەلوپەلی تر. کیر پۆرتەر دەڵێ برێکی زۆر شەراب و ئارەق دروست دەکرا و، مەشـروبێکی مەسـتکەری زۆریـش دەخورایـەوە، سـەرباری ئـەوەی زۆربـەی دانیشتوانەکەشی موسڵمان بوون[42].*

لەم پێودانگەدا جیغـالی شـیاوی سـەرنجدانە. لـە سـەدەی هەڤـدەدا، گەڕیـدەی رۆمـانی و گـەورە رۆژهـەڵاتناس، پـیترۆ دێـلا ڤـالی، نووسـیویەتی کـە لـە میانـەی سەردانەکەی بۆ بەغدا، میوان بووە لە کۆشکە مەزنەکەی مەحموود پاشا *" دووەم جار پاشای بەغدا." نازناوەکەی جیغالی ئۆغلی بووە، واتـە کـوڕی جیغـالی، چـونکە کوڕی ئەو جیغالییە یاخیبووە بەناوبانگە بوو، کە فەرمانـدەی دەریـایی بـوو." [43]*

*بە پێی لۆنگریگ " مەحموودی کوڕی جیغالیی گـەورە (...) مـەحموود جیغـالیزادە بـۆ جـاری دووەم بـووە فـەرمانڕەوای بەغـدا، نـاوی گونـدی، مەحموودیـەش، کـە دەکەوێتە باشووری بەغدا لەمەوە هاتووە." [44]*باوکی مەحموود، پاشای کـەرکووک جیغالیزادە یووسف سینان پاشـا( ١٥٤٥—١٦٠٥ز) بـوو، کـە بـە سـاغال ئۆغلـوش دەناسرا، سەر بـە خێزانـی سـیکاڵا لـە جەنـەوا بـوو. ئـەو لـە مێسـینیای سـەر بـە سیسـیلیا (سـەقەڵیە) لـە دایـك بـووە و نـاوە کریسـتیانەکەی (سـیپیۆن سـیکاڵا) وەرگرتــووە. ســاڵی ١٥٦١ چــەتە دەریاییــە موســوڵمانەکان لــە نــاو دەریــا دەستبەسەریان کرد، و بردیان بۆ ئەستەمبۆڵ، لەوێ بووە موسڵمان و لە کۆشـکی

ئیمپراتۆری عوسمانی مەشق درا. بە هۆی هاوسەرگیری لەگەڵ نەوەی تۆبەرەی سولتان خۆی لە پێگەیەکی باڵا و دیاری سامان، پۆستی باڵا و بابولعالی (دەرگای بلند –Porte ) دیتەوە. ئەو بووە ئاغای ئینکشاریە (١٥٧٥–١٥٧٨)، والی وان (١٥٨٣)، و بەغدا (١٥٨٦)، والی ئەرزرۆم (١٥٩٠) ، ئەدمیرالی باڵای ئستۆلی عوسمانی (١٥٩١–١٥٩٥). یاوەری سولتان محەمەدی سێیەم بوو لە هێرشکردنە سەر هەنگاریا ١٥٩٦، والی سوریا بوو لە ١٥٩٧. ساڵی (١٦٠٤) فەرماندەی شکست خواردووی بەرەی رۆژهەڵاتی شەڕی عوسمانی و سەفەوییەکان بوو. ساڵی ١٦٠٥ لە دیار بەکر مرد. ئەو شوێنەی مەحموودی کوڕی فەرمانڕەوای بوو.[٤٥]

قەشە هوراشیو ساوسگەیت، هاوسەردەمی ریتەر، ئەم تێبینییانەی دەربارەی کەرکووک هەیە:

*شوێنەکە هەمان شێوەی دەرەوەی هەولێر دەدات کە رۆژی دواتر پێیدا تێپەڕین، بەشێکی دەکەوێتە سەر پانتایی سەر گردێک، بەرزییەکەی سەد تاکو سەد و پەنجا پێ دەبێت، و چوارچیوەکەشی نزیکەی میلێك و نیوە.، ئەم بەشە بە دیوار دەورە دراوە، قەراغەکانی گردەکە زۆر لێژن و چوونە سەرەوەش دەبێت لە رێگای پێچاوپێچەوە بێت. بەشەکەی دیکەی شارەکە، تا رادەیەك بەشە گەورەکەیە، دەکەوێتە دەشتاییەکەی خوارەوە لە باشوور و رۆژهەڵاتی گردەکە. ئەم بەرزاییە کە نموونەی لە ناوچەکە زۆرە، لەوانە ماردین لە رۆژئاوا، بە مەزەندەیەکی زۆر دەسکردە، و قەڵاکە بە دوو مەبەست دروست کراوە؛ سەرمایەکی زۆر و ئاساییەکی زۆر. ئەفسەرێك لە هەولێر پێی گوتم ئەو گردەی شارەکەی لەسەر دروست کراوە لە برێکی یەکجار زۆر خشت دروست کراوە، و دیوی دەرەوەی بە خۆڵ داپۆشراوە. وەك شوێنێی بەهێز گرنگە. محەمەد عەلی میرزا، لە کرمانشاوە هات بۆ داگیرکردنی کەرکووك، دە رۆژ بەرامبەر شارەکە دایکوتا، سەرەنجام بە ناکامی گەڕایەوە و نەیتوانی داگیری بکات. من نەچوومەتە ناو قەڵاکە، بەڵام ئەو بەشەی لەخوارەوەیە ١٥٠٠٠ کەسی لێیە، لە نێوانیاندا زۆر جوولەکە هەیە. نزیکەی ٥٠ خێزانی کلدانیش هەن، کە یەکەمین کەس بوون چاوم پێیان کەوت لەوەتەی بەغدامان بەجێهێشتووە. چووینە بازاڕ، تەنیا بەشی کووتاڵمان بەسەر کردەوە، دوایی رێگەی سەمتی باکورمان گرتەبەر و چووینە سەر*

*گردۆڵکەکانی گۆگرد (کبریت)، دوای سەعاتێك بەهەمان ڕێگای خۆمان گەڕاینەوە بۆ سەردانی ئەو شوێنەی ماوەیەکی درێژە بیستوومە گڕی ئاگر لە زەوییەوە لە چەند شوێنێك هەڵدەستێت. دوای چەند خولەکێك بەسەر بەرزاییەکی بچووك سەرکەوتین، و کونێکی بچووکمان بەرامبەر خۆمان بینی، بڵێسەی ئاگر لە ژمارەیەك کونی بچووك لە زەوییەوە دەردەچوو. کونەکان نزیکەی شەش ئینچ قووڵ بوون، روونە کە بەدەستی مرۆڤ کۆڵدراون. ئەو شێوەی ئەو بڵێسەی بینیمان و بۆنەکەی سووتانی گۆگرد بوو، دوای پشکنینی شوێنەکانی دیکە، بە دیار کەوت کە هەموو خاکەکە تەواو دەوڵەمەندە بە گۆگرد، هەر چاڵێکت لە نزیك یەکێك لەو چاڵانەی بڵێسەیان لێ هەڵدەستا دروست کردبا، ئەوا بڵێسەی لێ هەڵدەستا. بێگومان ئاگرەکە یەکەم جار بە ڕێکەوت بووە، بە دروستکردنی چاڵی تازەش ئاگرەکە بەردەوام بووە، زۆر چاڵی کۆن هەبوون، کە گۆگردەکەی سووتابوو و ئەو پاشماوەی مابۆوە کلسێکی بێگەرد بوو.*(٤٦)

شیاوی گوتنە ئە. کلێمینت دە ساڵ لە بەغدا ژیاوە و ژمارەیەك کەسایەتی گرنگیی کوردی ناسیوە. لە ڕێگەی ئەم پەیوەندییە باشانەیدا ساڵی ١٨٥٦ سەردانی باشووری کوردستانی کردووە. لە دوتوێی چەند لاپەڕەیەکدا ئەمەی نووسیوە:

*کەرکووك، شاری سەرەکی ویلایەتی شارەزوورە، دەکەوێتە دوا سنووری ڕۆژهەڵاتی بیابانەوە لە لێژایی یەکەمین گرد کە بەرەو کوردستان دەچێت. ئەم دەروازەیەش سنووری نێوان ئەو وڵاتەیە لەگەڵ هەرێمی عێراقی عەرەبی. حکوومەتە گەورەکە بەسرە، جەزیرە، کوردستان لە خۆ دەگرێت و لە لوڕستانەوە دەست پێدەکات تاکو ویلایەتی رواندز، گەورەترین هەرێمی ئیمپراتۆریەتە، ئەگەر لە رووی گرنگیشەوە نەبێت، بەلای کەم وەك هەرێمێکی بەرفراوان. کەرکووك لە دوو بەش پێکهاتووە، شارە بەرزەکە، یان قەڵا، کە ئێستا بە شوورە دەوری دراوە، بەڵام لەو بارە خراپەدا بۆ بەرگری بەکەڵك نایەت، شەقامەکانی پیس، تەسك و خراپن، خانووەکانی لە بەرد و گەچ دروست کراون و لە ناوەوە زۆر شێدارن، گەر بە خانووەکانی ئاسیای تورکیا بەراوردی بکەین تەنیا ژێرزەمینێکیان لە ژێرەوە هەیە. پەنجەرەی زۆر کەمیان هەیە بڕوانێتە سەر*

شەقام. جوانکارییەکان لە حەوشەی ناوەوەیە. بەشە نزمەکەی شار (بەشی دووەم) گەورەترە، هەروا بە بازاڕ و بازرگانییەکەشی گەشەسەندووە. ئەم بەشەی شارەکە ئێستا شوورەی نییە. شەقامەکانی نارێك و فراوانن، شوێنی ئاوی پیس و دوو شۆستەی هەیە. دوو یان سێ گۆڕەپانی هەیە. بیناکردنی خانووەکان کەمتریان تێ چووە لە چاو خانووەکانی قەڵا. ژێر زەمینەکانیان لە بەرد و گەچ درووست کراوە و بەقەد بەژنێك بەرزن. نهۆمی یەکەم و سەرەوە تەنیا لە گەچ درەست کراون، یان مادەی تێکەڵکراو لەگەڵ چەو.

کۆشکی فەرمانڕەوا دەکەوێتە گۆشەیەکی رۆژئاوای شارەکە، هەروەها دەوڵەمەندترین توێژ و فەرمانبەرە باڵاکانی میریش لەم شوێنە نیشتەجێن، ئۆردوویەکی سەربازیش لە نزیك کۆشکەکە هەیە. ژمارەی دانیشتوانی کەرکوك (بە سەرەوە و خوارەوە و دەوروبەری) بەڵام بەبی ئۆردووە سەربازییەکە، دەگاتە نزیکەی بیست و پێنج هەزار کەس کە چوار لەسەر سێیان (٧٥٪) کوردن. حاکمی شار عەلی پاشا بەهۆی وزە و تواناکانی، بیرورا لیبراڵەکانی، و خێرخوازییەکەی لە لای خەڵك بەرێز و خۆشەویست بوو، مراوییەکی ئاوی سپی جوانی هەبوو. سەگ ئاسا بەدوای دەکەوت ئەو پارچە خواردنانەی بە دەستی گەورەکەیەوە (وەلینیعمەتەکەیەوە) بۆ فڕێ دەدرا بە خۆشحاڵییەوە دەیخوارد. ئیسرائیلییەکان دەڵێن گۆڕی دانیال پێغەمبەر لە کەرکوکە، بەڵام کەس ناتوانێت بە تەواوی شوێنی گۆڕەکە لە شارەکە دیاری بکات.

دوو رۆژی تەواو لە کەرکوك ماینەوە، لە ١٥ – ی مانگ بۆ کوردستان رۆیشتین، رێگای گونجاو و باش نەبوو، تەنیا رێگایەك هەبوو کە خەڵکی ناوچەکە خۆیان دروستیان کردبوو. رێگەکە بە دۆڵێکدا شۆڕ دەبووەوە و دەکەوتە ناو چیاکانی کوردستان و توروس (Taurus)، سەفەر بەس تەنیا بە پیادە و سواری وڵاغ دەکرێت. گالیسکە لێرە نەناسراو بوو رەنگە بەکارهێنانیشی لەم رێگە خراپەدا مەحاڵ بێت، ئەسپ سوارەکان بە زەحمەت دەتوانن لەم رێگەیە لە یەکتری تێپەڕ ببن.[٤٧]

بـە پێـی تنکـۆ کـارتنیوس Lycklama a Nijeholt ئەنـدامی کۆمەڵـەی جوگرافیایی لە پاریس، کـە لـە ١٨٦٥ تـا ١٨٦٨ سـەردانی رۆژهـەڵاتی ناوەڕاسـتی کردبوو.

*کەرکووک شارێکی کۆنە. هەندێ نووسەر (ئۆلیڤێر، ریتەر) بـە شـاری مێنیسـی کوینتـوس کرتیۆسـی دادەنـێن، ئـەو شـارەی ئەسکەندەر لێـی وەسـتا لـە کـاتی چوونی لە هەولێرەوە بۆ بابل. نووسـەرەکانی دیکـە لەگـەڵ بۆچـوونی دی ئـەنڤیل یەکانگیرن، کە پێی وایە شارەکە کەرکورای پتلیمۆسە ...*[VI.1.fol. 146]. *ئێستا کـەرکووک دوو سـەد تـا سێسـەد خێزانـی کریسـتیان و سـەد خێزانـی جوولەکـەی تێدایە. جگە لە نزیکەی ١٢ تـا ١٣ هـەزار کەسـی دیکـە. قەڵاکـەی بـە شـوورەیەك دەورەی دراوە (...) کە سیمایەکی دێرینی هەیە، رەنگـە بگەڕێتـەوە بـۆ ئاشـوور. کەنیسەیەکی دێرین کراوە بە مزگەوت، گۆڕێك هەیـە دەڵـێن ئـی تۆمـاس — غـایری بەناوبانگە، جەنەراڵی مەلیك شاپوور.*[٤٨] *دەیان کەنیسە کە لـە دێـر زەمانـەوە، لـە سـەرەتای پەیـدابوونی ئـاینی مەسـیحەوە دروسـت کرابـوون، کراونەتـە مزگـەوت. هەروەها ئەو کەنیسەیەی پەیوەندی بە دانیال پێغەمبەرەوەیە، راپۆرتـە کۆنـەکان دەڵێن یەکێکیان گۆڕی حـەزرەتی مریـەمی تێدایە. خانووەکـان لـە بـەرد دروسـت کراون شتێکی وانییە شایانی سەردان بێت. رووباری تۆسی — چای بـە کەرکووکـدا دەڕوات. لە لایەکەی دیکەی شارەکە سەرای هەیە کە کۆشکی فەرمانڕەوایە سـادە دیارە بەڵام فراوان و دڵگیرە.*

*(...) گردەکە زارکێکی بچووکی هەیە، پێی دەگوترێ بابە گورگـور، گـڕی ئـاگر لـەوێوە دەردەچـێت. لـە نزیکیـەوە کێڵگـە دەوڵەمەنـدەکانی نـەوت هـەن کـە ئـەو قیرەی لێ وەردەگیرا کە بۆ سواغدانی دیوارەکانی بابل و شارەکانی دیکەی ئاشوور بەکار دەهات.*[٤٩]

تەهمازگارد یان تۆمازگـارد، فەرمانـدەی نسـیبین، نـاردرا بـۆ کەرخـە دی بـێس سـلۆخ لـە لایـەن یـەزدەگوردی دووەم پاشـای ساسـانییەکان بـۆ لێـدانی کریستیانەکان. لەو رووداوەدا خـۆڕاگریی ژنێکـی کریسـتیان، شـیرین، کـە هـەردوو کوڕەکەی مردن، کاری تێ کرد و بـاوەڕبوونی خـۆی بـە ئـاینی حـەزرەتی مەسـیح راگەیاند و لە ٤٤٦/٩/٢٥ لە خاچ درا. تاهمازگارد بـووە سەرپەرشـتیاری سـەرەکی

کەنیسـەی تاهمازگـارد کـە لـە دەوروبـەری ٤٧٠ لـە کـەرکووك دروسـت کـرا. ئـەم پەرستگایە لە ساڵی ١٩١٨ بەهۆی تەقینەوەیەك لە بەین چـوو، چـونكە تورکـەکان کردبوویانە عەمباری تەقەمەنی (چەك و تفـاق). لـە سـاڵی ١٩٢٣ نـۆژەن کرایـەوە، بەڵام شێوەی رەسەنی بینایەکەی پێوە دیار نەبوو.(٥٠)

لـە نیـوەی یەکـەمی سـەدەی بیسـتەمدا، ئەفسـەری بریتـانی ئـی. بـی. سـۆن وەسفێکی زۆر نایاب و چڕوپڕی شارەکەی کردووە:

*کەرکووك بە تورکمان، میوە، و نەوتی خـاو بەناوبانگـە. ژمـارەی دانیشـتوانی شـارەکە بـە لای کـەم ١٥٠٠٠ کـەس دەبێـت، شـارێکی سـێ زمـانی سـنووری کوردستانە. هەموو کەس دەتوانێت بە هەر سێ زمانی تورکی، عەرەبی، و کـوردی قسان بکات، تورکی و کوردی لە بـازاڕ بـەکار دێت، خـودی شـارەکە تورکمانییـە، باشوور و رۆژئاوای شارەکە عەرەبی بەدوی (گەڕۆك) لێیە، لە رۆژهەڵاتیشی وڵاتـی کوردی هەمەوەندە. دەسەڵاتی تورك لێرە زۆر ئاشکرایە. نزیکی لە بەغدا – حەوت رۆژ دوورە و باڵادەستیی زمانی تـورکی، دەرفـەتی رەخسـاند تـا ژمارەیـەکی زۆر گـەنج بچـنە قوتابخانـە سـەربازییەکان و دوای فێرکردنێکـی نیوەچـڵی تەمبـەڵ، تەوەزەل و سەرەڕۆ دەگەڕانەوە. توانایان نـەبوو بـەبێ پۆسـتێکی رەسمـی بـژین. سەرەنجام هەندێك پۆستیان وەرگـرت وەك پۆسـتە، تێلگـراف، پـۆلیس، گـومرگ، یان پلەداری زیاد لە پێویستی سوپا (ئەفسـەر)، دەگەڕانـەوە بـۆ شارۆچکەکانیان تاکو کات لە چایخانە زۆروزەبەندەکان بەسەر بەرن، و نان لە رێگەی زوڵـم و زۆری و تەشقەڵەکردن بە کەسانی بەدبەخت پەیدا دەکەن. کەرکووك پـڕە لـە فەرمانبـەر بە پۆشاکی رەسمی کە گەجەروگوجەری شارەکەشیان تێ کەوتووە، بەلای زۆریش سەرخۆشە درندەکان کە ژیانی خەڵکیان ناخۆش کردووە، پەنا دەبەنە بەر هـەموو شێوازێکی نزم بۆ ژیان مسۆگەرکردن، ئەوان بێ مووچـە بـوون. سـەرەڕای بـوونی ژمارەیەکی زۆر پۆلیس، زاتی ئەوەم نەدەکرد بەتـەنیا بچـمە شـوێنی قەڵـەباڵغ لـە بازاڕی کەرکووك، کە کەسی غەریب سەرنجڕاکێش نین.*

*شـێوازی بیناکـان لـەم شـوێنە بەتـەواوی عەرەبییـە؛ ئـەو کاریگەرییـەی فارسەکان لەسەر بەغدا، مووسڵ، دیاربـەکر، و شـارەکانی دیکـەی میزۆپۆتامیـا و سـوریایان هـەبووە، لێـرە نابینـدرێ. بینایـەی دروسـتکراو بـە بـەرد و بـەبێ هـیچ*

جوانیکارییەك، هەندێك مزگەوت و منـارەی لـە بـەرد دروسـتکراوی رەقوتـەقی بـێ نەخش و نیگار. و بـازاڕێکی گـەورەی بـە تـاق پۆشـراو روخسـارێکی میعمـاری بـە شوێنەکە بەخشیوە. تورکمانەکان، یان باشتر بڵێین بازرگانەکانیان پەیوەندییـەکی زۆر پۆزەتیڤانەیان لەگەڵ خەڵکی بەغدا و مووسڵ هەیە، کەسی غەریب زۆر بەرچاو نییـە و بـە راسـت و چـەپ فێڵـی لێ ناکرێـت، وەك لـەناو عەرەبـەکان لـە شـارە گەورەکان روودەدات. لە کاتی کڕینی خواردەمەنی و کالآی تر لە بازاڕ، لـە هـەموو شوێنێك هەستێکی دۆستانە و بەهێزی سەرسوڕهێنەرم بەدی دەکـرد دڵـی غـەریب بۆ خۆیان رادەکێشن، وێڕای ئـەو راسـتییە کـە هـەر کاتێـك مـن وەك فارسـێك یـان شیعەیەکی محەمەدی بینرابام، ئەوا سوننەکان سۆزێکی زۆر کەمیان دەنواند.

دەتوانم نموونەیەك بێنم لەسەر سۆزی میوانداریی گەرموگوڕ.(...)

وێڕای تورکمان و موسڵمانەکانی دیکە ژمارەیەکی زۆر کلـدان و کریسـتیانی سریان، بەغدایی، هەندێك ئەرمەنی هـەبوون، فەرمانبـەری مـیری بـوون یـان کـاری بازرگانییان دەکـرد، بـەڵام خـەڵکی دیاربـەکر یـان ئـەرمینیا بـوون. کلدانـەکان لـە سەردەمی کۆنەوە کۆچیان کردووە بۆ ئێرە بە پێی نەریتی خۆیـان لـە سـەردەمی ئەڵپ ئەرسەلآن لە سەدەی ١١. گـەر کـەرکووك وەك خەڵکەکـە دەڵـێن پاشمـاوەی پاشا سەلجووقییەکان بێـت. رەنگـە ئەمـە راسـت بێـت، کلدانـەکانی کـەرکووك بـە پێچـەوانەی ئـەوانی مووسـڵ کەسـایەتی سـریانییان (بـە تایبـەتی زمـان) لـە بـیر نەکردووە، هەرچەندە تەنیا بە تورکی قسە دەکەن، بـەڵام لـە نێـوان خۆیانـدا بـەم پیتانە دەنووسن. تەنیا ئـەو کلدانانـەی لـە نـاو کوردەکـان دەژیـن، زمـانی خۆیـان پاراستووە، بە نووسین و قسەکردنەوە. لە مووسڵ، کە شوێنێکی بـاش پـەروەردە کراوە تاکو ئێستا، زۆربە بەکاری ناهێنن، دەبێت مرۆڤ بچێتە گوندەکان تاکو گوێی لە قسەکردنیان بێت.

کەنیسـەیەك لـە کـەرکووك هـەبوو لـە لایـەن قەشـەیەکی مووسـڵاوی بـەرێوە دەچوو. کلدانەکان، وە زۆربەی ئەوانەی لـە ناوچـەی تورکیـان، کـاتۆلیکی رۆمـین، کەنیسەی کۆنی کلدانی کە بە هۆی شاڵاوە بێویژدانانەکـەی کاتۆلیکـە رۆمییـەکان لەناو چوو، کە هەوڵیان دا بە سیاسەتێکی میکافیلییانـە لـە پـەیڕەوانی کەنیسـەی

کۆنەوە بیانکەنە پەیڕەوانی پاپا، گۆڕانێکی ئەوتۆ کە لە ئەنجامی خراپ بترازێ، هیچی تری لێ نەکەوتەوە.[٥١]

لە کەرکووک ئازادییەکی زۆریان هەبوو، لە چەوسانەوەی بەدوور خستبوون، سەرباری هەوڵە ناوبەناوەکانی مەلا موسوڵمانەکان کە خەڵکیان لە دژیان هان دەدا. بوونیان زۆر پێویست بوو بۆ خۆشگوزەرانی شارەکە لەوەی قەسابخانەیەک رووبدات، کە بۆ بازرگانە موسڵمانەکان دەبووە کارەسات، چونکە بەهۆی لێهاتوویی، سەلامەتی و بەوەفابوونیان ببوونە جێگەی باوەڕ و متمانەیەکی گەورەی بازرگانە موسڵمانەکان و بڕێکی زۆر پارەیان لەلا دادەنان. وێڕای ئەم هەموو خۆشەویستی و توانای پێکەوەژیانی ئاشتییانە لەگەڵ موسڵمانەکان، رەوشت و نەریتە کریستیانەکانی خۆیان پاراست و دەستبەرداری نەبوون بە پێچەوانەی ئەرمەن و کاتۆلیکە سریان و عەرەبەکان. بەجلوبەرگە تایبەتییەکانیان جیا دەکرانەوە؛ کڵاوی سەر و کراسی قۆڵ درێژ، شاپکی خەتخەت کە تاکو پاژنە درێژە، و چاکەتی خوری "سەڵتە"، ئەوان بە زێڕ و زیویان نەیاندەڕازاندەوە وەکو کوردەکان.

بەشە زیادەکەی قۆڵی کراسەکانیان (فەقێیانەکان) لە دەوری بازنەی دەستیان لوول دەدا و لە ژێر قۆڵە درێژەکانی چاکەتەکانیان دەشاردراوە، قوماشێکی شینیان لە دەوری کڵاوی سەریان دەئاڵاند و سەریانی دادەپۆشی، فراوان و پان بوو، وەك عەمامەی موسڵمانان قیت نەبوو. چەندین ساڵ دواتر کراسێکی زەردی کاڵیان دەپۆشی، بێگومان رەنگە بگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست کاتێك خەلیفەکانی بەغدا فەرمانیان دەرکرد کە دەبێت هەموو نائیماندارەکان پۆشاکی جیاواز لە موسڵمانەکان بپۆشن، باری پتر پۆشاکی زەردی هەنگوینی. رەوەندێکی گەورەی جوولەکە لە کەرکووك هەیە، یەکەمین رەگەزن کە لێرەوە بەرەو رۆژهەڵات بە هەمووکوردستان، تا سنە لە کوردستانی ئێران و هەمەدان بڵاو بوونەوە.

رەنگە ئەمانە راستەوخۆ نەوەی سێیەمین بنەماڵە بن[٥٢]، کە نەبوخودنەسر بردنیە بابل لە سەدەی شەشەمی پ.ز.، یەکراست دوای رووخانی ئیمپراتۆریەتی ئاشووری. زمانی ئارامییان بەکار دەهێنا، لە کوردستانیش زمای عیبری، ئەمە

*راستییەکی سەرنجڕاکێشە کە کلدانەکانی سنەی کوردستان و جوولەکەکانی هەمان شوێن، سەرباری گوزەرکردنیان بە سەردەمی جیاجیادا، بە هەمان زاراوەی سامیی کۆن قسە دەکەن. ئەمەش بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەیە کە کلدانەکان لە ئەسڵدا سامیین.*

*لە کەرکووك، وەك هەموو کوردستان، کووتاڵ فرۆشتن پیشەیەکی سەرەکیی دانیشتوانە، بازرگانی قوماشە لە پەمۆ دروستکراوەکان و قوماشی نەخشێندراو هەمووی بە دەست ئەوانەوە بوو؛ لە راستیدا هاوپیشەکانیان لە بەغدا، کە پەمۆی کوردستان لە مانچستەرەوە لە لایەن ئەو جوولەکانەی لە وێ نیشتەجێ بوون دابین دەکرا . کەرکووك کۆکەرەوەی هەموو رەگەزەکانی رۆژهەڵاتی تورکیایە، جوو، عەرەب، سریان، ئەرمەن، کلدان، تورك، تورکمان، و کورد، و پێکەوە بەبێ دەمارگیری دەژیان، هەروەها هەبوونی دەسەڵاتێکی بەهێزی حکوومەتی تورکی خاوەن هێزێکی سەربازیی تەواو بۆ پاراستنی زۆربەی توخمەکان (رەگەزەکان)، تەنیا بەشە قورسەکەی دانیشتوان کوردەکانن، کە رکیان لە هەر دەسەڵاتێك یان بڕیارێك دەبۆوە گەر لەلایەن خانەکانیانەوە (سەرۆکەکانیان) نەبوایە. بەداخەوە ئەم بارودۆخە نایابە تا یەك یان دوو میل دەرەوەی شار بڕی دەکرد، لەدوای ئەوە عەرەب و کورد تەڕاتێنیان تێدا دەکرد و تەحەدای هەموویان دەکرد.*

*لە بازاڕ کەسانێکی رەشئەسمەری پرچ گروازە دەبینی بە زاراوەیەك قسان دەکەن کە تەنیا ئەوانە تێیان دەگەن کە سەردانی باشووری رۆژئاوای ئێرانیان کردووە. ئەوانە هاوڵاتی ئێرانی بوون، بوونیان ئاماژەیەك بوو بۆ دامەزرانی کونسوڵی ئێرانی لەم شارە.* [٥٣]

*لە ١٩٣٧ گەڕیدە و نووسەری ئیتاڵی ئەرناڵدۆ جیپۆڵا وەسفی کێڵگە نەوتییەکان و شاری کەرکووك دەکات " هەموو ئاینەکان لە کەرکووك هەن، شوێنی کۆبوونەوەی رەگەزەکانە: کەنیسە کلدانییەکان، پاتریارکی نستووری (ئاشووری)، پەرستگای جوولەکەکان، مزگەوتەکان، تەنانەت پەرستگای ئێزیدییەکان، لە ناوچە شاخاوییەکانی نێوان عێراق و سوریا دەژین."* [٥٤]

*ئەفسەری بەریتانی سێسیل جۆن ئیدمۆندز ئەم وەسفەی نووسیوە:*

شاری کەرکووك بەشێکی لە سەر گردێکی لاکێشەیی دروست کراوە بەرزییەکەی ١٢٠ پێیە، بەشەکەی تری لە سەر هەر دوو کەناری رووباری خاسە دروست کراوە. نیوەی رۆژئاوای قەڵاکە زۆر تێك چووە، خێزانە موسڵمانە دیارەکان خانوویان بە شێوازێکی مۆدرنتر لە بەشە تازەکەی خوارەوە بینا کردووە؛ بەڵام گەڕەکی کریستیانەکان لە رۆژئاوای قەڵا هەروا خەڵکی لێیە و لە بارێکی باشدایە، خانووەکان لەسەر لێواری گردەکە وەك دیواری بەرزی قەڵا دروست کراون. ژمارەیەك مزگەوت، تەکیە، نزرگە و مۆنۆمێنتی جۆراوجۆر لە شارەکەدا هەن دەمەوێت ئاماژە بۆ دووانیان بکەم، مەزاری دانیال و منارە هەشت گۆشە دێرینەکە کە بۆ سەردەمی سەلجووقییەکان دەگەڕێتەوە. ئەڵبەتە نەریتە کۆنەکەی پەیوەستە بە "سووتان بە کوورەی ئاگر"، لە شوێنێکی نزم و لە دووریی دوو میل لە گازی نەوتەوە ئاگرە هەمیشەییەکەی بابە گوڕگوڕ لە باکوری رۆژئاوای شار نزیك ئەو بیرە بچووکانەی بە دەست هەڵکەندراون بۆ پیشەسازی سەرەتایی نەوت کە لە سەردەمی هێرۆدۆتس و پێشتریش. دووەم، بە پێی ئەم نەخشە، ژنێکی لێوەشاوەی خانەدان لێرە بووە بە ناوی بوغدای خانم، بەڵام شوێنەکە ئێستا بەشێوەی سەرەکی لە لایەن دانیشتوانی خانووە هاوسێکانەوە وەك گۆڕەپانێکی پان و راست بۆ وشککردنەوەی تەپاڵە بۆ سووتەمەنی بەکار دێت. کەرکووك لە ساڵی ١٥٥٥ دا بەپێی یەکەمین پەیماننامەی سنوور، بەتەواوی بووە بەشێك لە دەسەڵاتدارێتیی عوسمانی، بەڵام بە شێوەی کاتی ئێرانییەکان بەلای کەم لە دوو سەدەی دواتردا (١٧ و١٨) دوو جار دەستیان بەسەردا گرت، لە ١٦٢٣ تا ١٦٣٠ لە لایەن شا عەباسی سەفەوی و لە ١٧٤٣ تا ١٧٤٦ لە لایەن نادر شاوە.

لەو سەردەمەی من تۆماری دەکەم ژمارەی دانیشتوانی نزیکەی ٢٥٠٠٠ کەسە، زۆربەیان تورکمانن، چارەکێك کوردن و ئەوانی تر رەوەندێکی بچووکی عەرەب، کریستیان و جوولەکەن. لە سەدەی هەژدەدا، کەرکووك ناوەندی سەرەکی ئەیالەتی شارەزوور بوو، کە لیوای کەرکووك، هەولێر و سلێمانی (بە رواڵەت) دەگرتە خۆی. لە ژێر دەسەڵاتی موتەسەلیم (*Mutasallim*) کە لە بەغداوە دیاری کرابوو؛ لەگەڵ چاکسازییەکانی مەدحەت پاشا والی بەغدا لە ١٨٦٩ تا ١٨٧٢، ناوی

*شارەزوور درایە سنجاقی کەرکووك (کە دەکاتە لیوای کەرکووك و هەولێری ئێستا)، شارەزوورە مێژووییەکە کەوتە دەرەوەی سنجاقی سلێمانی؛ ولایەتی مووسڵ ساڵی ١٨٧٩ پێکهات؛ کەرکووك وەك شارێکی خاوەن پێگەیەکی گرنگ مایەوە، بەهۆی زمان و پێکهاتە ئیتنییەکەی، ناوەندێکی گرنگیی تەجنیدکردنی فەرمانبەری مەدەنی و جەندرمە بوو بۆ ئەوانەی جێگەی متمانەی کارگێڕیی عوسمانین. بنەماڵە ئەرستۆکراتییە دیارەکان یان تورك بوون، یان بە رەسەن کورد بوون، هەرچەندە خۆیان بە کورد دانەدەنا، گرنگترین بنەماڵە نەفتچیزادەکان بوو، وەك لە ناوەکەیان دیارە مافێکی دێرینی خاوەنداریێتی و بەکارهێنانی نەوتی رەشیان هەبوو؛ یەعقوبیزادەکان، کە دەچنەوە سەر کوردەکانی زەنگنە؛ قیردارەکان خاوەن زەوی و بازرگانیش بوون لە هەمان کاتدا، هەروەها سەرباز و فەرمانبەری حکوومیشی لێ بوو کە سەر بە بنەماڵە کۆن و دەوڵەمەندەکان نەبوون، بەهۆی خزمەت لە دەوڵەتی عوسمانی پلەی بەرزیان وەرگرتبوو و دوای لێکهەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆریەت گەڕابوونەوە شارەکەیان. کوردێکی دیاری شارەکە سەید ئەحمەدی خانەقا بوو، لە بنەماڵەی بەرزنجی بوو؛ بەڵام بە پێچەوانەی زۆربەی نەقشبەندییەکان؛ دەرگای تەکیەی ئەو کراوە بوو و بە شێوەیەکی سروشتی کاریگەرییەکی زۆری لە سەر جووتیارەکانی هەبوو، کە گەورەترین کۆمەڵەی ئیتنی بوون لە سەرتانسەری لیوایەکە.*

*لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی ساسانی کەرکووك ناوەندێکی نستۆرییەکان بوو، جێگەی مەترانی کلدانەکان بێت گەرمێ بوو. ئەم کۆمەڵگە دێرینە ئێستا دەوری ١٥٠ خێزانی کلدانی لێ ماوەتەوە، زۆربەیان وەك بینیم، لە یەکێك لە کۆنترین گەڕەکەکانی قەڵا ژیابوون. پێشەنگیان مەترانی ستیفان جیبری بوو، کە ناوەکەی هەروا پارێزراوە بە هۆی سێ کریستیانی ناوداری بازرگان و خاوەن زەوی میناس غەریب، قوستەنتین، و تۆما هیندی، ئەوانە رێزێکی تایبەتییان هەبوو؛ یەکەمیان ئەندامی هەڵبژێردراوی ئەنجوومەنی کارگێڕی بوو، ئەو ئەنجوومەنە لە ژێر دەسەڵاتی تورکەکان رۆڵێکی گرنگیی هەبوو بەڵام لە ژێر دەسەڵاتی حکوومەتی زۆر سانتراڵیزمی عیراقدا سەربەخۆییەکەی لەدەست دا. تا هەڵگیرسانی شەڕ، کۆمیتەکە شانازی بەوە دەکرد، کە کۆنترین کەنیسەی کریستیانەکانی لە جیهان*

*پاراستووە، کەنیسەی شەهیدانی سەدەی پێنجەم، کە بۆ زیندووکردنەوەی یادی قوربانییانی زوڵمی یەزدەگوردی دووەمی ساسانی لە سەدەی پێنجەم (٤٣٨-٤٥٧) دروست کرابوو؛ تورکەکان کردبوویانە عەمباری چەك و تەقەمەنی و لەگەڵ کشانەوەیان لە ساڵی ١٩١٨ تەقاندیانەوە و لە نێو چوو.*

*کۆمەڵەی جوولەکە لە کریستیانەکان بچووکتر بوو، خەریکی بازرگانیی بچووك بوون. پێشەوایەکەیان حاخامێکی بازرگان بوو بە ناوی ئیسحاق ئیفرایم کە دواتر بووە ئەندام لە ئەنجوومەنی نوێنەران وە نوێنەرێکی مووسڵ. سەرۆکی بەشی دارایی لیوای مووسڵ، عوزێر ئەفەندی، جوولەکەیەکی بەرپرسی بەتوانا و راستگۆ بوو.*(٥٥)

**ئەسڵی تایەفەی کریستیان و جوولەکە لە ناوچەکەدا**

وەك پوختە، بوونی رەوەندی کریستیان و جوولەکە لە ناوچەکە هۆیەکە بۆ بانگەوازە بەهێزەکەی ئێستا و رابوردووی ئەوروپییەکان و خەڵکی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست وەك وەفایەك بۆ سەردانی ئەوەی لە کەرکووك ماوەتەوە لە کوردستانی ئەمڕۆدا.

گەر سەرنج بدەیتە کەرکووك لەسەر نەخشە، ئاشوور دەکەوێتە باکوور، بابل لە باشوور، میدیا لە رۆژهەڵات، بیابانی عەرەبیش لە رۆژئاوایەتی، بۆیە جێگەی سەرسوڕمان نییە کە شارێکی فرە توخمە لە رووی دانیشتوانەوە.

لە سەرەتای ماوەی کریستیانەکان (سەدەی یەك و دوو)، عەرەب لە رۆژئاوا نیشتەجێ بوون و کورد و تورکمان لە رۆژهەڵات.(٥٦) ئاینی مەسیح بە هاتنی هەردوو نێردراو (Apostle)، ئادای و ماری بڵاو بۆوە.(٥٧)هاوتای ئاینی جوولەکە، ئاینی مەسیحی لە ئیمپراتۆریەتی ساسانی (٢٢٦-٦٥١) زۆر بەهێز بوو کارتێکردنەکەشی لە سەر عێراق چڕ ببۆوە. لە سەدەی سێیەمدا ئەم ناوچەیە بە گرتنەبەری باکوری میزۆپۆتامیا و ناوچەی دەوروبەری سوسەی دابەش بوو بەسەر زنجیرەك ئەبرەشییە و ئوسقفیە کە لە شەنگار، هەولێر، کەرکووك، حەلوان، ئەوانی تر دەبیندران.(٥٨) بە پێی راپۆرتێکی ئەسێمانی بێت- گەرمانی ( لە سەرچاوە سریانەکان هەرێمی کەرکووك ) سەربەخۆ نەبووە بەڵکو لە ژێر

دەسەڵاتی ئێران بووە.[٥٩] کێبڕکێی نێوان ئێران و ڕۆمەکان کارێکی زۆری کردە سەر کریستیانەکان. کریستیانەکان لە سەر دەستی یەزدەگوردی دووەم، دوچاری چەوساندنەوە هاتن و ساڵی ٤٤٥ لە کەرکووک ١٢ هەزاریان لێ شەهید کرا ( لە سایەی فەرمانڕەوایەتی یەزدەگوردی دووەم، ئەم دەمارگیرییە ئاینییە گەیشتە رادەی بەزۆر گۆڕینی ئاینی مەسیحی لە ئەرمینیا، پیاوە ئاینییە زەردەشتییەکانیش لەم پڕۆژە بەرفراوانەدا ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو کە هەوڵی چەوساندنەوەی هەموو ئاینە نا زەردەشتییەکانی دەدا بە کەمینەی جوولەکەشەوە).[٦٠]

بە پێی مێژوونووسی بەریتانی پێرسی سایکس، لە نیوەی دووەمی سەدەی پێنجەمدا " *چەوسانەوە لە میزۆپۆتامیا بڵاوبۆوە، و خوێندمانەوە کە لە کەرکا، رۆژئاوای حەلوان، مەتران جۆن و هەزاران کریستیانی تر تووشی مەرگەسات هاتن. کەرکا کە ئێستا بە کەرکووک ناسراوە، ئارەزوویەکی مێژوویی بچووک نییە کە ببینی ساڵانە کۆبوونەوەیەکی پیرۆز ساز دەکرێت بۆ زیندووکردنەوەی یادی مەرگەساتی ئەم شەهیدانە، لە کەنیسەیەکی بچووکی سەر گردۆڵکەیەک لە دەرەوەی شار کە بەخوێنیان نەخشێندراوە*.[٦١]

قەشە ئەناستاسیۆس راهبێکی فارس بوو ساڵی ٦٢٨ لە سەردەمی کیسرای دووەم شەهید کرا، لە ژمارەیەک ساڵنامە و تۆمارگەی شەهیدانی کەنیسە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ئاماژە بە بۆنەکەی کراوە کە دەکاتە ٢٢ کانوونی دووەم. جەستەکەی لە دێری سانت سێرجیۆس نزیک بێسسالۆی (کەرکووک) سووتێندرا، کە شوێنی شەهیدبوونییەتی. کاتێک هەواڵی ئەشکەنجەدان و مردنی ئەناستاسیۆس گەیشتە کۆمەڵە قەشە شوێنکەوتووەکانی لە قودس، ئەوان ئارەزوویەکی گەورەیان هەبوو پاشماوەی جەستە سووتاوەکەی شەهید بگوێزنەوە قودس. بە نهێنی پاشماوەی جەستەکەیان پەیدا کرد، قەشەکانی سانت سێرجیۆس رازی نەبوون دەستبەرداری پاشماوەکە بىن، بۆیە بە سەرکەوتوویی گەیاندیانە فەلەستین، سەرەتا بۆ قەیسەرییە و دواتر بۆ قودس، ئەوەبوو لە ٦٣١/١١/٢ گەیشتن. لە ناوەڕاستی سەدەی حەوتەمدا (رەنگە ٦٤٥)، لە ڕۆما رێز

لە سەری ئەنستاسیۆس نرا، "دێری ئاد ئەکواس سالڤیاس"، کە روفاتەکەی سانت ئەناستاسیۆسی لێ نێژرا و پیرۆز کرا، هەر زوو بووە شوێنێکی پیرۆز بۆ حەج.[٦٢]

پاتریارکی کلدانی جۆنی هەشتەم هۆرمزیاد کریستیانەکانی دانیشتووی کەرکووکی گۆڕی بۆ کاتۆلیک لە نێوان ١٧٦٧ تاکو ١٧٨٠.[٦٣] وەك وێناکردنی کیتابی پیرۆزی جیهانی، کریستیانە رۆژهەلاتییەکان لە زۆر سەدەدا رۆلێکی گرنگیان هەبووە.

**جوولەکەکانی کەرکووك**

کۆمەلێکی بچووکی بازرگانی جوولەکە لە کەرکووك هەبوو، بەلام دوای دامەزراندنی ئیسرائیل (١٩٤٨) نەمان، دوای ئەوەی جوولەکەکانی کوردستان و عێراق (نزیکەی ١٢٠٠٠٠ کەس دەبوون) لە سالی ١٩٥٠–١٩٥١ بۆ دەولەتە تازەکە کۆچیان کرد. پێدەچێت ئەوانە نەوەی ئەو جوولەکانە بن کە نەبوخودنەسر بۆ بابل دووری خستبوونەوە، دوای گرتنی قودس (٥٨٦ پ. ز.) و بەردەوام بوون لە قسەکردن بە زمانی ئارامی[٦٤]

بە پێی سەرچاوە جووەکان، یەحیای یەمەنی (زەکەریا) ئەلزاهیری (ئەڤنێر ها– تەمەنی) سەردانی کەرکووکی کردووە و لە نیوەی دووەمی سەدەی ١٦ ژیاوە و لە شاری سەنعای یەمەنەوە هاتووە. ناونیشانی کتێبەکەی *سیفەرها– موزارە* (کتێبی رێنماییەکان). سێیەمین بەش وەسفکردنی گەشتەکەی تێدایە کە لە بەغداوە سەردانی کەرکووکی کردووە. ئەم گۆڕی دانیال و هاوەلەکانی لەوێ بینیوە. ئەو جووەکانی کەرکووکی بە "پیاوانی خەتابار، بەڕەللا و گوناهبار" لەقەلەم داوە.[٦٥]

*یەکەمین تۆمارکردنی نیشتەجێبوونی جوولەکە لە کەرکوك بۆ سەدەی ١٧ دەگەڕێتەوە. زانیاری هەیە دەربارەی پەیوەندییە بازرگانییەکانی نێوان جووەکانی کەرکوك لەگەڵ بەغدا بووە بە شێوەی سەرەکی لە سەدەی ١٨. گەڕیدەی جۆراوجۆری جوولەکە و ناجوولەکە لە هەردوو سەدەی ١٩ و ٢٠ دا دەربارەی ژمارەی جوولەکە لە کەرکوك دەڵێن بریتییە لە نزیکەی ٢٠٠ خێزان کە لە شوێنی جیاجیادا لە شارەکە ژیاون*[٦٦]

یەکـەمین گەڕیـدەی ئـەورووپی بنیـامین تـودێلا راپـۆرتێکی نووسـیوە دەربـارەی جوولەکـە کوردەکـان و بەمەبەسـتی لـە نزیکـەوە ناسـینی کـوردە چـیاییەکان ر. داڤید دبێت هیلیل گەشتێکی لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا ئـەنجام دا. سـەردانی کەرکووکی (کوورکووك) کرد دوایی لە بەغدا پەرەی بە کارەکەی دا (١٨٢٧)[67]

بێگومان گەشتەکەی داڤید دەسکەوتێکی بەرجەستە بوو. گەڕیدەیـەکی کـەم سەردانی ئەم پارچە زۆرەی کوردستانیان کردووە بە هـۆی مەترسـیی هێرشـکردنە سەر گەڕیدەکان لە لایەن عەشیرەتە کوردەکانەوە، دەسەڵاتی مـیری مۆڵەتپێـدانی سەفەرکردنی گەڕیدەکانی رەت دەکردەوە. داڤید لە کتێبەکەی باسی ئەو راستییە دەکات کە بە هۆی کەمی ماوەی مانەوەی لەم ناوچەیە نەیتوانی تێکـەڵ بـە ژیـانی خەڵك ببێت و ئاشنای ژیانیان بێت. لە ١٨٤٨، یوسف ئیسرائیل بنیامین (بنیامینی دووەم) گەشتەکەی خۆی بۆ کوردستان لە کەرکووك کۆتایی پێ هێنا.[٦٨]

لەم کەینوبەینەدا کۆمەڵەی لەنـدەنی بڵاوکردنـەوەی ئـاینی مەسـیح لـە نێـوان جوولەکـەکان، کـە رێکخراوێکـی ئینگلیـزی سـەر بـە کەنیسـەیە، دەسـتی کـرد بـە کارکردن لە ناو جوولەکەکانی کوردستان و میزۆپۆتامیا. زۆربەی ئەو بانگخوازانەی لە لایەن ئەم کۆمەڵەیەوە دەنێـردران ئـەو جوولەکانـە بـوون کـە لـە ئـاینی خۆیـان وەرگەڕابوون. هێنری ئارۆن ستێرن جوولەکەیەکی وەرگەڕا بوو بەغدای بەجێهێشت و یـەکێك لـەو شـارانەی سـەردانی کـرد کـەرکووك بـوو (١٨٤٨). هـەروەها پ. هـ. سترێنسچوس سەردانی رەوەندی جوولەکەی لە کەرکووك کردووە.[٦٩]

بە پێی سەرچاوە دێرینەکان، کریستیان و جوولەکەکان، وەك دوو رەوەنـدی (تایەفە) کەمینە هەندێك لایەنیان پێك دەچوو، بەڵام دەسەڵاتی سیاسی لە دەست کورد و تورکماندا بوون.

**پاکتاوی نەژادی لە کەرکووك ١٩٧٠- ٢٠٠٢**

حزبی بەعسی عەرەبی ئیشتراکی لە ١٧ تەموزی ١٩٦٨ دەسەڵاتی گرتە دەست. هەر زوو رژێمـی بـەعس کەوتـە دەسـتوبرد بـۆ گـۆڕینی کەسـایەتی ئیتنیـی شـاری کەرکووك، و سەرجەم پارێزگاکە، بـۆ ئـەوەی عـەرەب ببنـە زۆرینـەی دانیشـتوان.

سیاسەتی بەعس بۆ بەعەرەبکردنی کەرکوک بە شێوەی پلانێکی حساب بۆ کراو و سیستەماتیك بە فراوانی پەیڕەو دەکرا و بەرەو پێش دەچوو.

ئەمەی خوارەوە ژمارەیەك ئیجرائاتی زۆردارانەی رژێمی بەعسە بۆ تەعریبکردنی ناوچەی کەرکوك:

• گۆڕینی ناوی کەرکوك بۆ "ئەلتەئمیم" کە ناوێکی عەرەبییە بە مانای خۆماڵیکردن دێت ئاماژەیە بۆ خۆماڵیکردنی ئەو کۆمپانیا بیانییانەی نەوت کە لە عێراق کار دەکەن، لە یەکی حوزەیرانی ١٩٧٢دا.

• فەرمانبەرە حکوومییە کوردەکان، بە مامۆستایانی سەرەتایی و ئامادەیی، کرێکارەکانی دەزگاکانی میری، بەشەکانی کۆمپانیای نەوت هەر هەموویان گواسترانەوە بۆ دەرەوەی پارێزگای کەرکوك و فەرمانبەر و کرێکاری عەرەبیان لە شوێنەکانیان دانا. ئەو کوردەی بە هەر هۆیەك کەرکوکی بەجێ هێشتبێت، هەرگیز نابێت بگەڕێتەوە.

• ناوی گەڕەکەکانی کەرکوکیان بە ناوی عەرەبی گۆڕی، قوتابخانەکان، شەقامەکان، بازاڕەکان لە کەرکوك ناوی عەرەبییان لێندرا. فەرمان درا بە خاوەن دەزگا بازرگانییەکان دەبوایە بە زۆر ناوی عەرەبی لە کۆمپانیاکانیان بنێن. شەقامی فراوان لە گەڕەکە کوردییەکان شەق دەکران و ئەو خانووانەی بەبەر جادەش دەکەوتن قەرەبوویەکی کەم دەکرانەوە. خاوەن خانووەکان بۆیان نەبوو خانوو یان زەوی لە شاری کەرکوك بکڕن ئەمەش ئامرازێکی گوشار بوو تاکو شارەکە بەجێ بهێڵن.

• ناوی نوێ خرایە سەر لیستی ناوەکانی سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧، تاکو وا نیشان بدرێت کە ئەو عەرەبانەی تازە هاتوون لە ساڵی ١٩٥٧ و پێشتریشەوە لە کەرکوك بووینە.

• کوردەکان رێگرییان لێ دەکرا لە کڕین و فرۆشتنی خانوو و مڵك و زەویوزار، تەنیا بۆ عەرەبەکان نەبێت، لە هەر بارودۆخێکدا بووایە. دەسەڵاتدارانی شارەکە مۆڵەتی "خانوو کردن" یاخود "نۆژەنکردنەوە"یان بە هیچ کوردێك نەدەدا، تەنانەت ئەگەر خانووەکەش کۆن بووایە و پێویستی بە نۆژەنکردنەوە بووایە،

ئەمەش گوشارێك بوو تاکو خانووەکانیان بە عەرەب بفرۆشن یان وازی لـێ بێـنن و شارەکە بەجێ بهێڵن. دواتر ئەم ئیجرائاتانە دژی تورکمانەکانیش پەیڕەو کران.

• تۆمەتی جۆراوجۆر لە لایەن ڕژێمەوە ئاراستەی کوردەکان کرا، بۆ ترساندن و تۆقانـدنیان تـاکو شـار بـەجێ بـێڵن و خـانوو مـاڵ و موڵکیـان دەسـتی بەسـەردا بگیرێـت. بارەگـای ئۆفیسـەکانی پارێزگـا، سـەندیکای کرێکـاران، سـەرۆکایەتی یەکیەتییە پیشەییەکان، و ڕێکخراوەکانی تر لە شوێنە کۆنەکانیان گوێزرانەوە بۆ ناوچەی عەرەبنشینی شارەکە، سەر ڕێگای دووسایدی کەرکووك — بەغدا. کارگە و دامودەزگا میرییەکان لە نزیك ڕێگەی کەرکووك– حەویجە– تکریت دروست کـران، هەزاران یەکەی نیشتەجێبوون بۆ عەرەبە هاوردەکان دروست کران کە لەو شوێنانە کار دەکەن. شارەکە و دەوروبەرەکـەی کرایـە ئۆردووگایـەکی سـەربازیی گـەورە و قەڵای سەربازی لە ناوەوە و دەرەوەی کەرکووك دروست کران. قـەڵا مێژووییەکـە کرایە قەڵایەکی سەربازی.

• هــەنگاوە ســەرەکییەکەی پرۆســەی تــەعریبی کــەرکووك بریتــی بــوو لــە هاوردەکردن و نیشتەجێکردنی هەزاران خێزانی عەرەب (زۆربەیان شیعەی باشـوور بوون — وەرگێڕ) بە شـێوەی شـەپۆلی یـەك بـە دوای یـەك مسـۆگەرکردنی شـوێنی نیشتەجێبوون و هەلی کار بۆیـان. هاوتـەریبی ئـەم پرۆسـەیە، ڕژێـم ڕایگەیانـد کـە هاریکـاری دارایـی و پاداشـت و خـانوو بـە هـەر کوردێـك دەبەخشـێت کـە شـوێنی نیشتەجێبوونی خۆی لە کەرکووکەوە بگۆڕێت بۆ ناوەڕاست یـان باشـووری عێـراق یان پێدانی پارچە زەوییەکی نیشـتەجێبوون بـەخۆڕایی لـە "ناوچـەی ئۆتۆنـۆمی" ڕژێمی بەعس ئەم ناوەی لە هەندێك پارچەی کورستان (هەولێر، سلێمانی و دهۆك) نابوو.[٧٠]

• لە چوارچێوەی پرۆسەی ئەنفالدا [٧١] لـە ١٩٨٨، ژمـارەی ئـەو گوندانـەی لـە کوردستان تـا کۆتـایی ١٩٨٩ کـاول کـران گەیشـتە (٣٨٣٩)، لـە نێوانیانـدا ١٩٥٧ قوتابخانـە و٢٤٥٧ مزگـەوت و٢٧١ خەسـتەخانەی بچـووك هـەبوون. ژمـارەی ئـەو خێزانانـەی لـەم گونـد و شارۆچـکانە دەرکـران (٢١٩٨٢٨) بـوو، زۆربـەیان کـاری کشـتوکاڵییان دەکـرد. گونـدە کاولکراوەکـانی پارێزگـای کـەرکووك ٢٥٪ — ی سەرجەم گوندە کاولکراوەکانی کوردستان پێك دێنێت.

له ڕاپه‌ڕینی ئاداری ١٩٩١ و پێش ئازادکردنی که‌رکووك (٢٠/٣/١٩٩١)، عه‌لی حه‌سه‌ن مه‌جید وه‌زیری به‌رگری عێراق، سه‌رپه‌رشتی گرتنی هه‌زاران کوردی کرد، هه‌ندێك له‌وانه عه‌سکه‌ری بوون و به‌مۆڵه‌ت هاتبوونه‌وه بۆ که‌رکووك. ئه‌مانه گواسترانه‌وه بۆ زیندانه‌کانی تکریت و مووسڵ و بۆ چه‌ند ڕۆژێك نان و ئاویان لێ قه‌ده‌غه کردن. له ئاکامدا ژماره‌یه‌کیان لێ مردن و ئه‌وانه‌ی مانه‌وه و نه‌مردن تا ئێستا ئازاد نه‌کراون.

ڕژێم به‌رده‌وام بوو له‌سه‌ر ده‌رکردنی کورد و تورکمان له شاره‌که. هاوڵاتیی کورد ده‌بوایه یه‌کێك له‌م دووانه هه‌ڵبژێرێت؛ بچێته باشووری عێراق له‌م حاڵه‌ته‌دا ڕێگه‌ی پێده‌درێت که که‌لوپه‌له‌کانیش له‌گه‌ڵ خۆی ببات، یان بچێته ناوچه ڕزگارکراوه‌کانی کوردستان، ئه‌و کات ناتوانێت هیچ که‌لوپه‌لێك له‌گه‌ڵ خۆیدا ببات و هه‌موو موڵکه گواستراو و نه‌گواستراوه‌کانی له لایه‌ن میرییه‌وه ده‌ستی به‌سه‌ردا ده‌گیرێت به خانووبه‌ره‌شه‌وه. کریستیانه‌کان له‌لایه‌ن سوپای عێراقه‌وه به‌کار ده‌هاتن و به بێلایه‌ن داندران، ئاشوورییه ناسیۆلیسته‌کانیش له دوای ١٩٩١ بۆ ناوچه‌ی ئۆتۆنۆمی له کوردستانی عێراق ڕایانکرد تاکو دژی ڕژێمی سه‌دام خه‌بات بکه‌ن. له دووه‌مین نیوه‌ی ١٩٩٦، پارێزگاری نوێی که‌رکووك عه‌لی حه‌سه‌ن ئه‌لمه‌جید، زۆری له هه‌موو کورد و تورکمانه‌کانی دانیشتووی که‌رکووك کرد خۆیان به عه‌ره‌ب بنووسن. ئه‌وه‌ی وا نه‌کات بۆ باکوری عێراق (ناوچه ئازادکراوه‌کان) ده‌رده‌کرێت.

هه‌زاران خێزانی کورد که به‌ناچاری له‌به‌ر تۆپباران و بۆمبارانی گاردی کۆماری و قوات خاسه‌ی سه‌دامی شاری که‌رکووکیان به‌جێهێشتبوو، دوای گرتنه‌وه‌ی شاره‌که له پێشمه‌رگه له کۆتایی شه‌ڕی که‌نداو، قه‌ده‌غه کران له گه‌ڕانه‌وه بۆ که‌رکووك. ئه‌و خێزانانه سه‌رباری ئه‌وه‌ی ڕێگایان پێ نه‌درا بچنه‌وه سه‌ر ماڵی خۆیان، هه‌رچی کار و کاسبی و خانوو و موڵکیان هه‌بوو ده‌ستی به‌سه‌ردا گیرا.

ده‌یان هه‌زار خێزانی کوردی که‌رکووکی له ناوچه ئازادکراوه‌کانی کوردستان له ژێر چادر ده‌ژین له بارودۆخێکی زۆر ناله‌باردا که بووه هۆی مردنی زۆریان، به تایبه‌تیش منداڵ و به‌ساڵاچووه‌کان. ئێستا ئه‌وان بۆ مانه‌وه‌یان له ژیاندا، پشت به

یارمــەتی رێکخراوەکــانی فریاکــەوتن و کۆمــەکی رێکخــراوە نێودەوڵەتییــەکان دەبەستن. رژێم سووره لە سەر دەرکردنی سەدان خێزان لە شاری کەرکووک و ئـەو ناوچانەی لە ژێر کۆنترۆڵیدایە.

ســەرژمێری ســاڵی ١٩٥٧ بنــەمای دیــارکردنی پێکهاتــەی ئیتنیــی پارێزگــای کەرکووکە.[٧٢]

**زمانی دایك لە کەرکووك بە پێی سەرژمێری ١٩٥٧**

| زمانی دایك | شاری کەرکووك | پارێزگای کەرکووك | سەرجەم دانیشتوان |
|---|---|---|---|
| عەرەبی | ٢٧ر١٢٧ | ٨٢ر٤٩٣ | ١٠٩ر٦٢٠ |
| کوردی | ٤٠ر٠٤٧ | ١٤٧ر٥٤٠ | ١٨٧ر٥٩٣ |
| تورکی | ٤٥ر٣٠٦ | ٣٨و٠٦٥ | ٨٣ر٣٧١ |
| ئارامی | ١ر٥٠٩ | ٩٦ | ١ر٦٠٥ |

بەراوردێکی خێرا لە نێوان نـاواخنی ئـەم خشـتەیە، لەگـەڵ سـەرژمێرییەکانی تـری دوای پرۆگرامـی تـەعریب لـە پارێزگـای کـەرکووك بکـەین، بـە روونـی هەڵکشـان و تەشەنەکردنی پرۆگرامی تەعریب دەبیندرێت کە رژێم جێبەجێی کرد. وەك ئەنجام، رێژەی سەدی عەرەب لە پارێزگای کەرکووك لە ٢٨,٢٪ بۆ سەرجەم دانیشتوان لـە سەرژمێری ساڵی ١٩٥٧ زیادی کرد بۆ ٤٤,٤١٪ بە پێـی سـەرژمێری سـاڵی ١٩٧٧. لە هەمان ماوەدا رێژەی سەدی تورکمـان لـە ٢١,٤٪ بـۆ ١٦,٣١٪ دابـەزی. رێـژەی سەدیی کوردیش لە هەمان ماوەدا لە ٤٨,٣٪ بۆ ٣٧,٥٣٪ دابەزی.

**پێکهاتەی ئیتنی پارێزگای کەرکووك**
**بەراوردێك لە نێوان سەرژمێری ١٩٥٧ و ١٩٧٧**

| نەتەوە | سەرژمێری ١٩٥٧ | سەرژمێری ١٩٧٧ |
|---|---|---|
| کورد | ٪ ٤٨,٣ | ٪٣٧,٥٣ |
| عەرەب | ٪ ٢٨,٢ | ٪ ٤٤,٤١ |
| تورکمان | ٪٢١,٤ | ٪ ١٦,٣١ |
| کلدان و ئاشووری | ٪ ٠,٥ | ٪ ٠,٩ |

هیچ ئاماری ڕەسمی دەربارەی پێکهاتەی ئیتنیی شار و پارێزگای کەرکووك دوای سەرژمێری ١٩٧٧ لە بەردەستدا نییە.[٧٣] بە پێی سەرچاوە کوردییەکان، ڕەنگە یەك ملیۆن کورد، سەد هەزار تورکمان و سی هەزار ئاشووری تا پێش شەڕی کەنداو لە کەرکووك ژیابن.[٧٤] بە هەر حاڵ، لە ڕاستیدا ڕژێم بەردەوام بوو لە نیشتەجێکردنی عەرەب لە ناو شار و دەوروبەر و کورد و تورکمانیشی بە کۆمەڵ وەدەر دەنا.

لە ڕاپۆرتێکی تردا، دانیشتوانی پارێزگای ئەلتەئمیم گەیشتبووە ٧٨٧,٠٤٣ کەس، لە کاتێکدا ژمارەی دانیشتوانی ناوچە ئازادکراوەکانی پارێزگای کەرکووك (بە پەنابەرەکانیشەوە) خۆی لە نزیکەی ٤٢٠ هەزار کەس داوە،[٧٥] لە شەشی ئەیلولی ٢٠٠١ ڕژێمی سەدام حوسێن بڕیاری ژمارە ١٩٩ – ی دەرکرد بۆ پترکردنی شاڵاوی پاکتاوکردنی نەژادی دژی نەتەوە نا – عەرەبەکان لە کەرکووك، دەقی بڕیارەکە: ڕێگە بە هەر عیراقییەك دەدرێت کە تەمەنی ١٨ساڵ یان پتر بێت نەتەوەی خۆی بۆ نەتەوەی عەرەب بگۆڕێت. بۆ جێبەجێکردنیش پێویستە عیراقییەکە داواکارییەك پێشکەش بە ئۆفیسێکی مەدەنی بکات بۆ ناساندن و تۆمارکردنی نەتەوەکەی. فەرمانبەری ڕەگەزنامە لە پارێزگا پێویستە لە ماوەی ٦٠ ڕۆژدا (لە ڕۆژی پێشکەشکردنییەوە) وەڵامی داواکارییەکە بداتەوە، فۆرمە عیراقییە ڕەسمییەکان دەرفەت دەدات بە خوازیارەکە تاکە ئەو نەتەوە هەڵبژێرێت کە گەرەکییەتی.

دەسەڵاتدارانی بەغدا بەردەوام بوون لە پەیڕەوکردنی سیاسەتی بە زۆر تەعریبکردن بە چڕی لەو ناوچە کوردییانەی لە ژێر دەستیان بوو، کە ٤٠٪ – ی خاکی کوردستانی عێراقی پێکدەهێنا.

لە دوای سەرژمێری دانیشتوان لە ١٩٩٧، تا ڕووخانی ڕژێم لە ٢٠٠٣، دەسەڵاتدارانی عێراق ئیستمارەی ڕاستکردنەوەی ڕەگەزنامە (نەتەوە)یان بەسەر دانیشتوانی نا– عەرەب: کورد، تورکمان، کلدان و ئاشووری دابەش کرد ئەوانەی ڕەتیشیان کردەوە بە کەسانی گومان لێکراو لەقەڵەم دران. و لە هەموو پۆستێکی میری لە ناوچەی کەرکووك بێبەش دەکران و بۆ ئەو ناوچانەی لە ژێر دەسەڵاتی

کوردەکان بوون، دەردەکران و میری بە سادەیی دەستی بە سەر هەموو ماڵ و موڵکیان دادەگرت.

فەرمانگەکانی نفوس، رەگەزنامە و کارگێڕی پارێزگای کەرکووك ئاگادار کرابوونەوە، کە بە هیچ شێوەیەك و لە هیچ بارودۆخێکدا منداڵی تازە لەدایکبووی کورد، تورکمان، ئاشووری، نابێت ناوی کوردی، تورکمانی، و ئاشوورییان پێبدرێت و تۆمار بکرێت. لە حاڵەتێکدا گەر هاتوو هەر ناوێکی کوردی، ئاشووری، یان تورکمانی لە هەر فەرمانگەیەکی تۆمار لە شاری کەرکووك تۆمار کرابوایە، ئەوان راستەوخۆ دەیانگۆڕی بۆ ناوێکی عەرەبی بە بێ رەزامەندی دایك و باوکی.(٧٦)

ئەو شاڵاوە بەرفراوان و بەرنامە بۆ داڕێژراوەی بۆ بەزۆر دەرکردنی کورد، تورکمان، و ئاشووری لە کەرکووك، خانەقین، مەخمور، شەنگار، و خورماتوو، تازە، شێخان، وەك بەشێك لە بەرنامەی تەعریب پەیڕەو دەکرا، تا رووخانی رژێمی بەعس بەردەوام بوو، رژێمی عێراق خێڵە عەرەبەکانی تکریت، سامەڕا و قەزای ئەلعەلەمی هان دەدا تاکو شوێنی نیشتەجێبوونیان ببەنە تەنیشت ئەو ناوچانەی لە هەرێمی کوردستان رزگار کرابوون. رژێم بەسەخاوەت پاداشت و دیاری وەك ئاو و کارەبای بەلاشی بە گوندە تەعریبکراوەکان لە ناوچەی کەرکووکدا دەدا.

پرۆسەی تەعریبکردنی گوندە کوردەکان لە هەشتاکانەوە (١٩٨٠) دەستی پێکرد. ناوی گوندە کوردەکان بە ناوی عەرەبی گۆڕدران:

کالۆ کرایە ئەلشەهید

بیبانی بووە ئەلجیهاد

یارمجە بووە ئەلفیدا

نەبیاوا بووە ئەلسمود

گەڵۆزی بووە ئەلوەسبە

ئەمن و موخابەراتی عێراقی بەشێوەی رەسمی خاوەن کارەکان، دووکانەکان، چێشتخانەکان، کارگەکانیان ئاگادار کردەوە کە ناوە کوردی و تورکمانەکان بە ناوی عەرەبی بگۆڕن.(٧٧)

خێزانە دەرکراوەکان لە لایەن دەسەڵاتی کوردییەوە لە خێوەتگاکان نیشتەجێ کران و لە وەزعێکی نالەباردا دەژیان هەروەها راگوێزراوە ناوخۆییەکان لە

یارمەتییەکانی پرۆگرامی نەوت بەرامبەری خۆراکیش بێبەری بوون، کە بە پێی بڕیاری ژمارە ٩٨٦ ی نەتەوە یەکگرتووەکان – نەوت بەرامبەر خۆراک– بۆ عێراقییەکان تەرخان کرابوو.

بە پێی ئامارێکی رەسمی کە لە رۆژنامەی رۆژانەی "برایەتی" لە ٢٩ کانوونی دووەمی ٢٠٠٢ بڵاو کراوەتەوە" ٢٢ هەزار و٩٥٥ خێزانی کورد، واتە پتر لە ١٢٠ هەزار تاکی کورد لەو بەشەی پارێزگای کەرکووک دەرکراون کە لە ژێر دەسەڵاتی حکوومەتی عێراق بوو، و لە پارێزگای هەولێر نیشتەجێ بوون. ژمارەیەکی زۆرتری دەرکراوی کوردیش لە پارێزگای سلێمانی نیشتەجێ بوون. بەم شێوەیە رژێمی عێراق توانی پتر لە ٢٥٠ هەزار کورد لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی دەربکات."[٧٨]

پاش رووخانی رژێمی دکتاتۆری بەعس (٩ نیسانی ٢٠٠٣) کەرکووک کەوتە ژێر دەسەڵاتی بەهێزی ئەمریکا، خەڵکی کورد و تورکمان گەڕانەوە و داوای ماف و خانوو زەوییەکانیان دەکرد. بەم جۆرە کەرکووک بووە بەرمیلێك باروود (ناوچەی تەقینەوە). بۆ کوردەکان، داواکردنی کەرکووك واتایەکی مەعنەوی (نەتەوەیی) و ئابووری هەیە کە پەیوەستە بە دەوڵەتی داهاتووی کورد. سەبارەت مەسعود بارزانی سەرۆکی پارتی دیمەکراتی کوردستان، "کەرکووك دڵی کوردستانە"، بۆ جەلال تاڵەبانیش سکرتێری گشتی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان و سەرۆك کۆماری عێراق (لە ٦ نیسانی ٢٠٠٥ هەڵبژێردرا)، "کەرکووك قودسی کوردستانە"، تورکمانەکان داوای وەزعێکی تایبەتی بۆ کەرکووك دەکەن. ئەوان لە لایەن تورکیاوە پشتیوانییان لێدەکرێت. عەبدوڵلا گویلی وەزیری دەرەوەی تورکیا (دوایی بووە سەرۆك کۆمار)، گوتی: "لە کاتی روودانی هەر ململانێیەك لە کەرکووك، تورکیا دەستەوەستان ناوەستێت."سەرکردە کوردەکان ئەنکەرەیان ئاگادار کردۆتەوە کە هەر دەستێوەردانێك دەبێتە مایەی رووداني کارەسات. هەر چارەسەرێکی دادپەروەرانە بۆ کێشەی کەرکووك هیوابەخش دەبێت بۆ ئاشتەوایی نیشتمانی لە سەر ئاستی هەموو عێراق.

ژمارە (٩ –١٠) لە بەرگێکدایە، لەسەری نووسراوە: نیسان و مایسی ١٩٥٩/**بانەمەڕ و جۆزەردانی** ٢٥٧١. ژمارە (١١ – ١٢)ی ساڵی (٢)یشی لەسەر نووسراوە: حوزیران و تەمووزی ١٩٥٩/ **جوزەردان** و **پووشپەڕی** ٢٥٧١.

ژمارە (٢ و ٣) ساڵی ٣ لە کانوونی یەکەمی ١٩٥٩ و کانوونی دووەمی ١٩٦٠ی لەسەر نووسراوە، هەرچی کوردییەکەشی نووسراوە: **سەرماوز و بەرباران** ٢٥٧١ی کوردی. ژمارە (٤)ی ساڵی (٣) ئازاری ١٩٦٠ رەشەمەی ٢٥٧١ی کوردی لەسەر نووسراوە، لە ژمارە (٥)ی ساڵی ٣ی نووسراوە مایسی ١٩٦٠ **جۆزەردانی** ٢٥٧٢ی کوردی. ژمارە (٣٠)ی ساڵی (٤) یەکسەر گۆڕانکاری بەسەر ئەو بەروارانەی سەر بەرگەکان دەهێنرێ و ئەم ژمارەیە لەسەری نووسراوە: تشرینی یەکەمی ١٩٦٠، ئەم گۆڕانکارییەش بەبێ نووسینی هیچ تێبینی و سەرنجێك کراوە تا دوا ژمارەی گۆڤارەکەش کە ژمارە ٣٨ بووە هەر وا ماوەتەوە، بەڵام لە ژمارە ٣٣ی ساڵی ٥ جگە لەسەر بەرگی نووسراوە **گەلاوێژی (تەمووز)** ١٩٦١، لە ناوەوەی ئەم ژمارەیەشدا بابەتێکی سەرنجڕاکێش بە پێنووسی (**مامۆستا بەشیر مشیر**) لەژێر ناونیشانی:( **بەرواری کوردی لە چییەوە هاتووە؟**) ئەوەتا نووسیویە: (**گەلێ کەس ئەپرسن کە بەرواری کوردی لە چییەوە هاتووە، وە چۆن ئەوترێ ئەمساڵ ساڵی ٢٦٦١ی کوردییە؟ هەندێ لە مێژووزانەکان ئەمەیان لا هەڵەیە جا من بۆ ئەوەی ئەو شك و گومانە لە مێشکی خوێندەواران نەهێڵم بنچینەی ئەو شتەتان بۆ روون ئەکەمەوە.** ئینجا دەنووسێ: (**مادەکان، واتە رەگەزی (ماد) کوردن و کوردەکان لەوانن، مێژوو ئەمەی پیشان داوە، دەوڵەتی مادیش لە ٧٠٠ – ٥٥٠ ساڵ پێش میلادەوە دەوڵەتیان دروست کردووە کە پێی ئەڵێن دەوڵەتی ماد هەر چەند هەندێ مێژوونووسی فارس بە درۆ پێکهێنان و دروست بوونی ئەو دەوڵەتە مەزنە ئەخەنەوە سەر ڕەگەزی فارس**).

دواتر دەنووسێ: (**دەوڵەتی ماد لە کاتی خۆیدا سنووری تا میسر و هیندستان درێژ بووەتەوە، وە تەنگی بە وڵاتی ئاشوورییەکان هەڵچنیوە. حوکوومەتی ماد سەدوپەنجا ساڵ بەردەوام بووە، سەرەتای دامەزراندنی حوکوومەتی ماد کە سەرەتای مێژووی کوردە بەم وێنە لێك ئەدرێتەوە: ٧٠٠+١٩٦١ = ٢٦٦١.**

**کەوابوو ئەمسالَ کە تـەئریخی مـیلادی (١٩٦١)ە، تـەئریخی کـوردی، وەکـو لەسەرەوە باسمان کرد، ئەکاتە ٢٦٦١، من بۆیە ئەم شتەم روون کردەوە کە ئیتر خەڵکی کوردستان گومانیان نەبێ لەوەدا کـە دانـانی ٢٦٦١ بـە تـەئریخی کـوردی شتێکی هەڵە نییە. بەڵکە لە رووداوێکی راستەوە وەرگیراوە).**

ئینجا دەنووسێ: **(لە وتاری دووەمدا بنچینەی مانگەکانی کوردتان بـۆ ڕوون دەکەمەوە لە چییەوە هاتووە بۆچی وایان ناو ناوە).**

ئەوە بوو لە ژمارە ٣٤ی گۆڤارەکە ئەم بەڵێنەی خـۆی هێناوەتـە دی و لـەژێر ناوونیشانی: **(ناوی مانگە کوردییەکان لە چییەوە هاتووە؟)**

داواشی لە گۆڤار و ڕۆژنامـەکان کـردووە بـەپێی ئـەم ناوانـە بـەرواری کـوردی بنووسن:

**(مانگەکانی بەهار)**

* **<u>هەرمێ پشکوان</u> (مارت)** ٣١ رۆژە، لەم مانگەدا درەخت ئەپشـکوێ و جـڕ و جانەوەر دەس بە بزووتنەوە ئەکەن.

* **<u>شەستەباران</u> (نیسان)** ٣٠ رۆژە، ناوەکەی بە خۆیەوەیە باران وەك کوندەی سەربەرەوژێر ئەبارێ کێچ زۆر ئەبێ، خەڵك ئاوی باران ئەخۆنەوە بۆ شیفا.

**<u>بەختەباران</u> (مـایس)** ٣١ رۆژە، ئەگـەر بـاران بـاری ئـەوە لـە بـەختی خـاوەن دەغـڵ و دان و درەخـت  و کشـت و گیـا و سـەوزەواتە عێـل ئەکەوێتـە خـۆی بـۆ کوێستان چووە.

**(مانگەکانی هاوین)**

***<u>بارانبڕان</u> (حوزەیران)** ٣٠ رۆژە، کوردسـتان زۆرخـۆش ئـەبێ، قـوڕ و چـڵپاو نامێنـێ، دنیا سەوز ئەبێ مالآت داوای ئاوی سارد ئەکا.

* **<u>میوەگەنان</u>** (تـەمووز) ٣١ رۆژە، پیـاو لـە بەغـدا وەکـو میـوە ئەگـەنێ. لـە کوردستان ئەچنە دەرەوە بۆ نووستن.

* **گەلاوێژ (ئاب)** ٣١ ڕۆژە، لە شەشی ئەم مانگە ئاسک ئەچێتە سەر شاخە بڵندەکان تا ئەستێرەی گەلاوێژ ببینێ. بەراز خۆی لە چاڵ ئەنێ تا نەبینی... دوای ئاسک ئەسپ ئینجا گیانلەبەرەکانی تر گەلاوێژ ئەبینن.

(**مانگەکانی پایز**)

* **هەوەڵ پایز (ئەیلول)** ٣٠ ڕۆژە، لە شەشی ئەم مانگەدا لەبەر دەرکی سلێمانی (١٩٣٠) قەلاچۆی لاوی کورد کرا و ئێستاش هەموو ساڵ ئەبێ بەبێ دەنگی یادی ئەم ڕۆژە بکەنەوە.

***گەڵاڕێزان (تشرینی ١)** گەڵای درەختان زەرد ئەبن و هەڵئەوەرن.

***کەوبەدار (تشرینی ٢)** لەم **مانگەدا** کەو ئەچێتە سەردار و خەڵوز ئەکرێ، گەڵاگیشە ئەکرێ، ڕاوەکەو زۆر ئەبێ، کورد ئەڵێت: ئیمشەو شەوی پایزە میوان لای کورد عەزیزە.

(**مانگەکانی زستان**)

* **هەوەڵ زستان (کانونی یەکەم)** ٣١ ڕۆژە، زەخیرە دائەنرێ بۆ زستان. عێل لە گەرمیان شەقام گیر ئەبێ گۆرەوی بازی و فنجانێن دەست پێدەکات.

* **چلە (کانوونی ٢)** زۆر ساردە، ئەم مانگە بەر هەردوو چلە ئەکەوێ.

* **بازە باران (شوبات)** ناوەکە لەوەوە هاتووە کە ڕۆژ لە بورجی خۆی بە وێنەی بەران باز ئەدات بۆ بورجێکی تر.

لە دوای ئەم ناوانەش نووسراوە (**ماویەتی**)، بەڵام لە هەر چوار ژمارەکەی دواتری (**هیوا**) وا دیارە (**مامۆستا**) نەهاتۆتەوە سەر ئەم بابەتە، واتە کەس بۆی نەنووسیوە تا ئەو تەئلیفی بکات..!.

دوای ئەوە ئاماژە بەوە دەکات کە لە ساڵی ١٩٢٧ لە نامیلکەی (**سیپارەی حەقپەرستی**)دا ئەم ناوانەی نووسیوە[٢٦].

(**نەورۆز**)یش گۆڤارێکی دیکەیە کە لە سلێمانی بڵاوکراوەتەوە لەسەر لاپەڕەی ناوەوەی نووسراوە: ژمارە (١)ی ساڵی یەکەم **نەورۆزی** ١٩٥٩، ژمارە (٢)شی بەر (**بانەمەڕ**)ی ئەم ساڵە کەوتووە، هەرچی ژمارە (٣)یە نووسراوە **جۆزەردانی** ١٩٥٩، ئەوەی تێبینی دەکرێ لەم گۆڤارەدا تەنیا مانگە کوردییەکان لە سەر هەر

سێ ژمارەکەی نووسراون دڵنیابن لەخۆڕایی نییە لە ژمارە ٥ی گۆڤاری (**سەنتەری برایەتی**) ١٩٩٨دا ئێمە بابەتێکمان بەناوونیشانی (نەورۆز لە نەورۆزدا) بڵاوکردۆتەوە..

(**ڕۆژی نوێ**)یش کە یەکەم ژمارەی لە ساڵی ١٩٦٠دا دەرچووە، هەر لە شەستەکانەوە لای ئێمە ناوی نراوە (**ڕۆژی نوێی کوردایەتی**)[٢٧] بەسەر بەرگی هەموو ژمارەکانی لە پاڵ ساڵ و مانگەکانی زاینی مانگەکان و ساڵی کوردیشی لێ دراوە. **هەرچی** ساڵەکانن ئەوا ساڵە کۆنەکانی بۆ دانراوە، بە نموونە:

لەسەر بەرگی ژمارە (١) نووسراوە **خاکەلێوە** (**نەورۆز**) ٢٥٧٢ ك نیسانی ١٩٦٠ زاینی. ژمارە (٢) نووسراوە **بانەمەڕ** (**گولان**) ٢٥٧٢ ك مایسی ١٩٦٠ زاینی. ژمارە (٣) نووسراوە **جۆزەردان** ٢٥٧٢ ك حوزەیران ١٩٦٠ زاینی.ژمارە (٤) نووسراوە **پووشپەڕ** ٢٥٧٢ ك تەمووز ١٩٦٠ زاینی. ژمارە (٥) نووسراوە خەرمانان ٢٥٧٢ ك ئاب ١٩٦٠ زاینی. ژمارە (٦) نووسراوە **گەلاوێژ** ٢٥٧٢ ك ئەیلول ١٩٦٠ زاینی. ژمارە (٧) نووسراوە **ڕەزبەر** ٢٥٧٢ ك تشرینی یەکەم ١٩٦٠ زاینی. ژمارە (٨) نووسراوە **خەزەلوەر** ٢٥٧٢ ك تشرینی دووهەم ١٩٦٠ زاینی. ژمارە (٩) نووسراوە **سەرماوەز** ٢٥٧٢ ك کانوونی یەکەم ١٩٦٠ زاینی. ژمارە (١٠) نووسراوە **بەفرانبار** ٢٥٧٢ ك کانوونی دووەم ١٩٦١ زاینی. ژمارە (١١) نووسراوە **ڕێبەندان** ٢٥٧٢ ك شوبات ١٩٦٠ زاینی. ژمارە (١٢) ی ساڵی ١ ٢٥٧٢ کوردی ١٩٦٠. ژمارە (١)ی ساڵی(٢) نووسراوە **خاکەلێوە** (**نەورۆز**) ٢٥٧٣ ك مارت ١٩٦١ زاینی.

| ناوی مانگە کوردییەکان | | ڕۆژژمێری ڕۆژئاوایی |
|---|---|---|
| **هەرمێ** پشکووان | ٣١ | ٢١ مارت ـ ٢٠نیسان |
| گوڵان | ٣٠ | ٢١ نیسان ـ ٢٠ مایس |
| بەختەباران | ٣١ | ٢١ مایس — ٢٠ حوزەیران |
| خەرمانان | ٣٠ | ٢١ حوزیران — ٢٠ تەمووز |
| میوەگەنان | ٣١ | ٢١ تەموز — ٢٠ ئاب |
| گەلاوێژ | ٣١ | ٢١ ئاب — ٢٠ ئەیلوول |
| سەرماوەز | ٣٠ | ٢١ ئەیلوول — ٢٠ تشرینی یەکەم |
| گەڵاڕێزان | ٣١ | ٢١ تشرینی یەکەم — ٢٠ تشرینی دووەم |

| | | |
|---|---|---|
| کەوبەدار | ٣٠ | ٢١ تشرینی دووەم – ٢٠ کانوونی یەکەم |
| ڕێبەندان | ٣١ | ٢١ کانوونی یەکەم – ٢٠ کانوونی دووەم |
| چلە | ٣١ | ٢١ کانوونی دووەم – ٢٠ شوبات |
| نەورۆز مانگ | ٢٨ | ٢١ شوبات – ٢٠مارت[٢٨] |

دیارە ناوی مانگە ڕۆژئاواییەکانیش ئاوەهاش ریزبەند دەکرێن: جینیوەری ـ فیبریوەری ـ مارت ـ ئاپریل ـ مایس ـ جون ـ جولای ـ ئوگوست ـ سێپتەمبەر ـ ئۆکتوبەر ـ نۆڤەمبەر ـ دیسەمبەر.

| | | |
|---|---|---|
| نەورۆز | ٣١ رۆژ | ٢١ی مارت ـ ٢٠ی نیسان |
| گوڵان | ٣١ رۆژ | ٢١ی نیسان ـ ٢١ی مایس |
| باران بڕان | ٣١ رۆژ | ٢٢ی مایس – ٢١ی حوزەیران |
| خەرمانان | ٣١ رۆژ | ٢٢ی حوزەیران – ٢٢ی تەمووز |
| گەلاوێژ | ٣١ رۆژ | ٢٣ی تەمووز – ٢٢ی ئاب |
| بەرەوپایز | ٣١ رۆژ | ٢٣ی ئاب – ٢٢ی ئەیلوول |
| سەرماوەز | ٣٠ رۆژ | ٢٣ی ئەیلوول – ٢٢ی تشرینی یەکەم |
| گەڵارێزان | ٣٠ رۆژ | ٢٣ی تشرینی یەکەم – ٢١ی تشرینی دووەم |
| ئاگردان | ٣٠ رۆژ | ٢٢ی تشرینی دووەم – ٢١ی کانوونی یەکەم |
| سەهۆڵبەندان | ٣٠ رۆژ | ٢٢ی کانوونی یەکەم – ٢٠ی کانوونی دووەم |
| چلە | ٣٠ رۆژ | ٢١ی کانوونی دووەم – شوبات |
| رەشەمێ | ٣٠ رۆژ | ٢٠ی شوبات – ٢٠ی مارت[٢٩] |

جگە لە هەموو ئەو ناو و سەرچاوانەی لە دووتوێی ئەم باسەدا ئاماژەیان بۆ کراوە، دەزانین هەر یەك، لە (**تۆفیق وەهبی**) و (**ئەدمۆندز**) لە دووتوێی فەرهەنگەکەیان و (**عەلائەدین سجادی**) لە (**ڕشتەی مرواری**) و (**شێخ محەمەدی خاڵ**)یش لە (**فەرهەنگی خاڵ**)دا رای خۆیان هەبووە، بەڵام وا ئێمە لێرەدا بەوەندە وازمان هێنا.

## ئەنجام

لە دێر زەمانەوە ئالا لای میللەتانی ڕووی زەوی پیرۆزیی خۆی هەبووە، دیارە کوردەکانیش دەبێ ئالای خۆیان هەبووبێت. بەڵام تا دوای جەنگی یەکەمی جیهان هیچ سەرچاوەیەك لەبەردەست نییە وێنەیەکی ڕاستەقینەی ئەم ئالایەی تیا کێشرابێ. لە ساڵی ١٩٢٠ بە دواوە، لێرەو لەوێ، بوونی ئالایەك هەستی پێکراوە. دوای موتارەکە (**ئاگربەست**)ی مۆدرۆس، کە (**شەریف پاشای خەندان**) بیرخەرەوەیەکی بە ناوی کوردان پێشکەش بە کۆنگرەی ئاشتی کرد، هیچ بەڵگەیەك لەبەر دەست نابینین بیسەلمێنی لە پاڵ نەخشەکەی کوردستان، ئەو ئالای کوردستانی خستبێتە بەردەست کۆنگرەکە. دواتر لێرە و لەوێ لە نێو بزووتنەوەی کوردایەتیدا، کوردان جاروبار ئالای خۆیان هەبووە، بەڵام ئەو ئالایانەش هیچ کامێکیان، بێجگە لە چەند وێنەیەکی فۆتۆگرافی یان چەند نووسین و پارچە شیعرێك لە بارەیانەوە، وەکو خۆیان نەماون و لەبەر دەست نین، بە نموونە ئالاکەی سەردەمی شێخ مەحموود تەنیا چەند وێنەیەکی فۆتۆگرافی لەبەردەستە، ئالاکەی سەردەمی شۆڕشی ئاراراتیش تەنیا چەند وێنەیەکی هێڵکاری لەسەر بەرگی کتێب و گۆڤارەکان دووبارە کراوەتەوە، خۆشبەختانە بەم دواییە تۆژەری ئەم باسە وێنەی دانەیەکی ئۆرجینالی ئەم ئالایەی لە ماڵی سینەم خانی جەلادەت بەدرخان گرتۆتەوە، هەروەها وێنەیەکی لەسەر بەرگی ژمارە ١١ی گۆڤاری هاواری ساڵی ١٩٣٢ دۆزراوەتەوە، کە ئەمانیش جیاوازی لە ژمارەی تیشکەکانیان هەیە. هەرچی سەردەمی کۆماری کوردستانە، ئەمیان ئالاکەیان قسەی جۆراوجۆری لەبارەیەوە دەکرێ و وەکو خۆی نەخراوەتە بەردەست. دیسان خۆشبەختانە بەم دواییە فیلمێکی بەڵگەنامەیی پیشاندراوە تیایدا سوپای ئەوسای کوردستان دەبینرێ ئالای سێ ڕەنگی کوردستانیان هەڵکردووە، شێوەی ڕۆژەکە و دوو گوڵە گەنم و قەڵەمەکەی باسی لێوەی دەکرێ بە ئاشکرا دیارە. هەرچی ئەو گوتەیەشە کە زۆر دووبارە دەکرێتەوە گوایە قازی محەمەد ئالایەکی بە مەلا مستەفای بارزانی سپاردووە، تاوەکو ئێستا هیچ وێنەیەکی حەقیقی نەخراوەتە بەردەستان، ناشزانرێ ئەو ئالایەی پێی سپاردووە ئالای نیشتمانی بووە یان نەتەوەیی هەیە، چونکە دەڵێ ئەوسا دوو ئالا هەبووە، نیشتمانی و نەتەوەیی، لەوانە (**حسێن**

**یەزدان پەنا)** لەکۆڕێکی یەکێتی نووسەراندا ئەو بۆچوونەی باس کردووە. لە بارەی (**ئاڵای ئەمڕۆی کوردستان**)یش، تا ئەو کاتەی ئاوەها بە فراوانی ئاڵا هەڵکراوە قسەی زۆری لە بارەوە کراوە لە هەمووان پتر قسەی زۆر لەبارەی ئەو تیشکانەی کراوە کە لە چێوەی رۆژەکەوە دەردەچێ. لەم تۆژینەوەماندا بەپێی ئەو کرۆنۆلۆژیایەی لەسەرەوە بۆ مانگ و ساڵی کوردیمان کردووە، بە بەراورد و بەپێی سەرچاوە جیاوازەکان بۆمان دەرکەوتووە، ئەو رەخنانەی تاوەکو ئێستا، لە بارەی ژمارەی تیشکەکانەوە، لەم ئاڵایە گیراون هیچیان لە شوێنی خۆیان نەبوون، چونکە بە درێژایی مێژوو نەسەلمێنراوە کوردان رۆژژمێری تایبەت بە خۆیان هەبووبێت. ئەوەی ئێستاش لەسەر بەرگی گۆڤار و رۆژنامەکان دەبینرێت ئەوە ئەفراندنێکی تاکە کەسییە و هیچی تر، تەنانەت ناوی (**نەورۆز**)یش هەر بە هەڵە لە جیاتی مانگی (**خاکەلێوە**) بەکاربراوە، چونکە (**نەورۆز**) ناوە بۆ جەژنی سەری ساڵی کوردی نەوەك مانگ، ئەوە گیوی موکریانی بووە بۆ یەکەمین جار، لە ساڵی ۱۹۵۵، لەسەر بەرگی گۆڤاری (**هەتاو**)دا ئەم گۆڕانکارییەی کردووە پێشتریش لە ژمارە ۲۳٤ی رۆژی دووشەممەی مارتی ۱۹٥٤ (بەرگی ٦)ی گۆڤاری پەیامدا (**نەجمەددین هەمەوەند**) ناوێك لە قوتابخانەی سانەوی کەرکووك پێشنیازی بەکارهێنانی مانگە کوردییەکانی کردووە (**نەورۆز**)یشی بە (**مارت**) داناوە.

کەواتە لای تۆژەر تەنیا رەخنەیەك لە ئاڵاکەی ئەمڕۆی کوردستان دەگیرێ ئەویش جێبەجێ نەکردنی دەقی یاسای ژمارە (١٤)ی ساڵی ۱۹۹۹ی یاسای ئاڵای هەرێمی کوردستانە وەکو خۆی. ئەمیش بە تێبینیکردنی رۆژانەی ئەو ئاڵایانەی لە پشت سەری سەرۆکی هەرێمی کوردستان و سەرۆکی حکومەت و سەرۆکی پەرلەمان و جێگرەکانیان و نووسینگەی وەزیرەکان و بارەگای حیزبەکان دەبینرێن، تەنانەت رۆژانە ئاڵا بەرزەکەی ناو حەرەمی پەرلەمانی کوردستان، هەروەها دەیان ئاڵای ناو خەڵك، دەبینین ئەم وەسفەی ئاڵایان لەسەر جێبەجێ نابێت کە لە خاڵی سێیەمی ماددەی یەکەمی قانوونی ئاڵای هەرێمی کوردستان هاتووە:

***" خۆرێکی زەرد دەکەوێتە ناوەڕاستی لاکێشە سپییەکەوە چەقەکەی خاڵی یەکتربڕینی تیرە لاکێشە سپییەکە دەبێت، تیرەی خۆرەکە ئەوەندەی پانی***

***لاکێشە سپییەکە دەبێت و (٢١) تیشکی لێوە دەردەچێت بەشێوەی سێ گۆشەی دوو لا یەکسان و بنکەکانی ٢١/١ یەك لەسەر بیست و یەك لە چێوەی گۆی خۆرەکە دەبێت و، درێژیشیان بگاتە نیوەی هەردوو لاکێشە سوور و سەوزەکە . خۆرە زەردەکە هێمای بەردەوامبوونی ژیان و زانست و هیوا و ئومێدە و، (٢١) بیست و یەك تیشکەکەش هێمای جەژنی نەورۆزی نەتەوایەتییە. ڕۆژی بەرخودان و ڕاپەڕین و شۆڕشی ڕزگاریی دژ بە زوڵم و زۆر و چەوساندنەوە"*** .

تۆژەری ئەم باسە دوای ئەوەی تاوتوێی زۆربەی سەرچاوە ڕۆژنامەوانییەکانی لەبارەی ساڵ و مانگی کوردی کردووە، بۆیشی دەرکەوتووە کوردان جگە لە هەندێ ناوی جۆراوجۆر بۆ مانگە کوردییەکان نەساڵنامە و نەڕۆژژمێرێکی تایبەت بە خۆیان نەبووە. دوای ئەوەش لە ئەنجامی تۆژینەوە و بەدواداچوون بۆی دەرکەوتووە ئەو یاسایەی پەرلەمان پێچەوانەی هیچ کام لە پیرۆزییەکانی کوردان نییە، یاساکە پێوانەیەکی ئەندازەیی جوانیشی بە ئاڵاکە داوە، بۆیە تۆژەر خۆی بە پێی وەسفی یاساکە وێنەیەکی ئاڵاکەی کێشاوە و نەخشەسازی بۆی کردووە، ئومێدەوارە لەمەو دوا هەموو لایەك لەسەری بڕۆن و ئاڵاکە وەکو خۆی بەرز بکەنەوە.

دیارە هەموو ئەو کەسانەی کە لە بازاڕ ئاڵاکان دەنەخشێنن و بازرگانییان پێوە دەکەن، وەکو لە سەر زاری خۆیانمان بیستووە و بۆیان باس کردووین، جگە لەوەی ئەوان قانوونەکەیان نەدیوە، کەسێکیش، بە نموونە: وەزارەتی ڕۆشنبیری، نوێنەریان نەبووە نموونەکانیان بۆ بەراورد بکات لەگەڵ نموونەی ئەوانەی لەسەر ئینتەرنێت وەرگیراون و ئەو ئاڵایانەیان لێ وەرگرتووە کە ئەمڕۆ لە ئاسمانی کوردستان دەشەکێتەوە، ئەمانەش هەیانە وەکو وێنەی ئەو ئاڵا گەورەیەن کە لە ناو حەرەمی پەرلەمانی کوردستان دەشەکێتەوە، هەروەها بەم دواییە لە تەلەفزیۆنەکان دەمان بینی وێنەی ئاڵاکەی پشت سەری وەزیری ناوخۆ و قوبادی مام جەلال و ناو ئەو بارەگایەی یەکێتیش، کە دوا کۆبوونەوەیان لەگەڵ سەرۆکی هەرێم تێدا کردووە، دیارە ئەمانەش هەر هەموویان پێچەوانەی یاساکەی ئاڵای هەرێمن، چونکە هەیانە چێوەی ڕۆژەکانیان لە پێوانەی قانوونی بچووکترن، هەشیانە چێوەی ڕۆژەکە تەواوە بەڵام تیشکەکانی تا چارەگێکی دوو ڕەنگەکەی دیکە بڕ دەکات. دەبا پەیوەندیداران ئاگاداری ئەوەش بن، کاتێ هەندێ کەس ئەو

ئاڵا٦٠×٩٠یەی لای ئێمەیان بینی، کە بەپێی یاساکە نەخشێنراوە، پێیان باش بوو تیشکەکانی کورت بکرێنەوە بۆ ئەوەی لە دوورەوە خۆی جوانتر بنوێنێ، بەڵام وەکو دەزانن قانوون جێبەجێکردنی بە میزاج نابێ، لەم بارەوەش کاتێ پرسمان بە د. جەبار قادر، وەکو پسپۆرێکی مێژووی کورد کرد، ئەویش گوتی:

(**هەموو گەلانی دونیا ئاڵای تایبەت بە خۆیان هەبووە و هەیە، لە زۆر سەردەمی مێژووشدا هەندێ جیاوازی لەوەی ئێستا لە وڵاتەکانیان دەشەکێتەوە، بۆیە ئاڵای کوردستانیش، ئەگەر لە سەردەمەکانی پێشوودا هەندێ جیاوازی تێدا هەبووبێ، بەڵام لە ئێستادا کە بە قانوونێکی تایبەت دانراوە، ئەوە کۆتایی بە هەموو ئەو بگرەو بەردانە دێنێ**). کەواتە ، دوای وردبوونەوەمان لە ڕاست و دروستی ئەم بۆچوونانە، یان ئەوەتا هەموو لامان بە یەکەوە دەبێ ئاڵا ناقانوونییەکان دابگرین، یانیش چار نییە، ئەوە بەڵێنی سەرۆکە: (**نابێ کەس لە یاسا گەورەتر بێت**) و دەبێ (**یاسای ئاڵای هەرێمی کوردستان**) ڕێکاری تێدا بکرێت، فەرموون ئەمەش ڕۆژ و (٢١) تیشکەکەی ناو ئاڵاکەمانە کە بەپێی یاسای ئاماژە بۆ کراو هێڵکاریمان بۆی کردووە و لە کۆتایی پەراوێزەکانی تەک ئەم باسەدا دەیبینن*.

* وەکو لە دووتوێی ئەم باسەدا دەیبینن، ئێمە هەردوو وشەی (**قانوون**) و (**یاسا**)مان هاوتەریب بەکار هێناوە و هیچ گرفتێکیشمان نییە، ئەوە د. نووری تاڵەبانیی سەرۆکی ئەکادیمیای کوردییە، نەك هەر حەز دەکا بەڵکو پێداگریش لە سەر وشەی یەکەم دەکات.

* لێرەدا نابێت (**شیلان خان**)، ئەو خاتوونەی لە دوا ساتەکانی دەرچوونی ئەم ژمارەیەی گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، زۆر بە پشوودرێژی، دەستوبردی لە تایپی ئەم باسەی بۆ کردین، هەروەها ڕۆژنامەنووس (**سەعید عەبدوڵلا**) لەگەڵمان هاتە ماڵی سینەمخان و چەند وێنەیەکی ئاڵای سەردەمی شۆڕشی (**ئاگریداغ**)ی بۆ گرتین، (**ئەیوب محەمەد باوەکر**)یش لە بارەگای سەندیکای ڕۆژنامەنووسان لەسەر کۆمپیوتەر هێڵکاری ئاڵاکەی بۆ کردووین.

دوای هەموو ئەمانەش بەرگدروویەکی ناو بازاڕ، کە پیشەی دوورینی ئاڵایە و محەمەد ئیبراهیم خەیاتی ناوە، ئاڵایەکی بۆ دروویین، بەڵام کاتێ هەستمان پێی کرد هەڵەیەکی بچووکی تێدا کردووە، داوامان لێی کرد دانەیەکی دیکەمان بۆ بدوورێ دیارە خەیاتەکانی بازاڕ، ئەوانەی دوورینی ئاڵا پیشەیانە بۆ دوورینی ئاڵایەك نەدەهاتنە دەست، ئەویش بە نیگەرانییەوە دانەیەکی بۆ دوورین بەڵام بەدڵی ئێمە نەبووەو بەپێی پێوانەکانی نەبوو و تیشکی خۆرەکەی لە شوێنی خۆی سوڕابوو، واتە بەپێی ئەو هێلکارییە نەبوو کە ئێمە بۆیمان دانابوو، ئەویش بە پاساوی سەرقاڵی و نەبوونی قاڵب دانەیەکی دیکەی بۆ نەکردین. بەهەر حاڵ چاکەی هەمووان هەست پێدەکەین.

## سەرچاوەو پەراوێزەکان

[١](**عەزیز گەردی**)، کە ئەوسا مامۆستای سەرەتایی بوو، لەسەر لاپەڕەکانی ڕۆژنامەی (**هاوکاری**) لە سەر بابەتێك، وەکو بە بیرمان دێتەوە هەردوو وشەی (**پیت**) و (**تیپ**) بوو، ڕەخنەی لە د. مارف خەزنەدار گرتبوو، بە پێی قسەی ئەوانەی ئەوسا لە بەغدا بوون و لە هاتنەوەیان بۆیان دەگێڕاینەوە، ڕەوانشاد (**م. خەزنەدار**) زۆر بە ڕەخنەکانی (**ع. گەردی**) سەغڵەت و نیگەران ببوو، بۆیە پێی لە عەرز دەکوتێ و دەڵێت: من (٧) حەفت ساڵان لە (**اتحاد سۆڤیەتی** ) خوێندوومە و دوکتۆرام وەرگرتووە، چۆن دەبێ (**معەلیم**)ێك بتوانێ ئاوەها ڕەخنەم لێ بگرێت.. !

[٢] بنوارە: د. ئازاد عوبێد ساڵح، (**مێژووی ئالآی کوردستان**)، گۆڤاری ئەکادیمیای کوردی، ژمارە ٢٣ی ساڵی ٢٠١٢، لا (٢٣٣ ـ ٢٩٤).

چەند جاران داوامان لە (**تۆژەر**) کرد ئەو نامەیە بنووسێ و گەیاندنیشی لەسەر ئێمە بێ، بەڵام لەبەر هەر هۆیەك بووبێت ئەو داوایەی ئێمەی بەجێ نەگەیاند.

لە هەر شوێنێکی ئەم باسەدا وشەی (**تۆژەر**) لەناو دوو کەوانە دانرابێ و تۆخ کرابێ، مەبەست لێی د. ئازاد عوبێدە.

[٣]پێشمان وایە ئێرە جێی خۆیەتی ئەزموونێکی خۆمان بۆ خوێنەران و تۆژەران بگێڕینەوە: لە ساڵی ١٩٩٨ بە دواوە کە بە فراوانی هاتینەوە ناو بواری ڕۆشنبیری زۆر هەوڵی فراوانکردنی ئاستی زانیاریمان، بە پاساوی جیا جیا لە دەست خۆمان دابوو، لە ساڵی ٢٠٠٢دا کاتێ خەریکی ئامادەکردنی باسی (**کاریزمای کورد مەلا مستەفای بارزانی**) بووین، مەبەستمان بوو ، بەر لە بڵاوکردنەوەی باسەکە یەکێك بیخوێنێتەوە و ڕەخنەمان لێ بگرێ و بە دروستی ڕێنماییمان بکات، لە بارو زرووفی ئەوسا، کە شەڕی ناوخۆ لە کوردستان پەتپەتێنی بە هەموو جوانییەك دەکرد، دەشمانزانی باسەکەش حەساسە و لە دوای بڵاوبوونەوەی هەندێ لە کادیرانی هەردوو لای خۆکوژ و دوژمنکار رای خۆیان لەسەر دەبێ، بە تایبەتی کە لایەکیان ڕۆژانە خۆی بە درێژەپێدەری (**ڕێبازی بارزانی**) دادەنا. لەم بارو زرووفە ناسکەدا پێمان وابوو کەس لە (**د. کەمال مەزهەر**) و (**کاکە حەمەی مەلا کەریم**) باشتر نابێت ئەو مەرامەمان بۆ بێننە دی. هەرچۆنێك بوو باسەکەمان گەیاندە بەغدا، بەداخەوە کە چووینە لای یەکەمیان زۆر نەخۆش دیار بوو، بەڵام بەم حاڵەشیەوە بێ دڵی نەکردین و داوای کرد باسەکەی بۆ بخوێنینەوە، لە کاتی خوێندنەوەدا ئاگامان لێ بوو د. کەمال زۆر ماندوو ببوو، بەڵام ئەو هەر زۆری لێ دەکردین بەردەوام بین، دوای ئاگادارکردنەوەمان لە هەندێ قۆرت و گرفت کە پێشبینی دەکرد دوای بڵاوبوونەوەی بابەتەکە ڕووبەڕووی بینەوە، ئەوەبوو دواتر لە سەر ناوهێنانی دوو بەڕێز لە دووتوێی باسەکەدا، کە هەردووکیان لە ژیاندان، هەڵوەستەیەکی لەسەر گێڕانەوەی هەندێ ڕووداو بە

ناوی ئەوانەوە کرد، ئامۆژگاری کردین پەیوەندییان پێوە بکەین، دوای گەڕانەوەمان لە بەغدا، یەکسەر چووینە سلێمانی و دوای چوار هەوڵ و هاتوچۆی سلێمانی ئینجا بۆمان ڕێککەوت قسەی دڵی خۆمان لەگەڵ کاک (**فەرید ئەسەسەرد**) بکەین و لەسەر زاری خۆی کاریزمابوونی (**مەلا مستەفای بارزانی** ـ وەکو هەولێرییەکان ئاوەها ناوی دێنن)یان لە زاری خۆی ببیستین. دواتریش گەڕاینەوە لە بارەی دوو بابەتەوە نامەیەکمان بۆ کاک (**مەسعود بارزانی**) نووسی. زۆر چاك بە بیرمە، یەکێکیان لە بارەی ناونانی خۆی بوو، بەپێی سەرچاوەیەکمان، گوایە **مەلا مستەفا** کاتی خۆی لە (مەهاباد) ناوی **مەسعودی** کوڕی لە خۆشەویستیی (**سەعید تەتەر**) ناوە، کە ناوەکەی خۆی (**مەسعود**) بووە. بابەتەکەی دیکەشمان لە بارەی سەربردەیەك بوو لە نێوان هەردوو (**بارزانی**)ی باوك و کوڕ، ئەویشیان لە سەرەتای حەفتاکان بووە، لە ڕۆژێکی باراناویدا کاتێ مەلا مستەفا لە (**دیلمان**)ەوە بە ئۆتۆمۆبیلێکی جێب بەرەو (**گەڵاڵە**) چووە، لەڕێگادا تووشی کابرایەك دەبن، سەرچاوەکەی ئێمە وای دەگێڕایەوە، کابرا دەستی بڵند کردووە لەگەڵ خۆیان هەڵیبگرن، گوایە (**مەسعود بارزانی**)یش، وەکو یاوەر ، لەناو جێبێکی دیکە لە پێشەوە بووە، لەبەر (**مەلا مستەفا**، نەیویستووە جێبەکە ڕابگرێت و کابرا لەگەڵ خۆیان هەڵبگرن، سەرچاوەکەمان وای گێڕابۆوە گوایە درەنگی شەو چووە پرسیاری بەهاناهاتنی ئەو پیاوەی لێ کردووە و سەرزەنشتی کردووە و گوتوویە: (**ئێمە چین ئەگەر ئەوانە نەبن**) دوای دوو هەفتە وەڵامی خۆمان لە سەر زاری خاوەنەکەی وەکو خۆی و بە دروستی وەرگرتەوە. یەکەمیان ئەوەبوو ئەو بە ناوی (**مەسعود**)ی باپیرە گەورەی کراوەتەوە، کاتێ بە سەرجەلەیدا چووینەوە ڕێك ئاوەها دەرچوو، هەرچی سەربوردەکەشە لە بارەیەوە گوتبووی: هەمووومان لە ناو یەك جێب بووین، بارانیش دەباری و کابرا دەستی بڵند کرد، جەنابیشی ئەمری کرد لەگەڵ خۆمان هەڵیبگرین، ئێمەش ناڕەزاییمان دەربڕی و گوتمان: جێی خۆمان نابێتەوە چۆن جێی ئەو پیاوە ببێتەوە، جەنابیشی گوتی: (**ئێمە چین ئەگەر ئەوانە نەبن**). لێرەدا مەبەستمان ئەوەیە هەر تۆژەرێك دەبێ بۆ دەوڵەمەند کردنی بابەتەکەی و دەستخستنی هەر سەرچاوەیەك نابێ بسڵەمێتەوە.

(٤) بنواڕە: د. ئازاد عوبێد ساڵح، هەمان سەرچاوە، لا ٢٤٣، ٢٥٤.

(٥) بنواڕە: عەبدولحەمید ئیسماعیل، (**مێژووی ئاڵای کۆمەڵەی خۆیبوون لە تورکیادا**)، هەتاو (گۆڤار) ژمارە ١٨٠ ی ١٩٦٠/٦/٣٠.

(٦) بنواڕە: عەبدولحەمید ئیسماعیل، (**مێژووی ئاڵای کۆماری کوردستانی ئێران**)، هەتاو (گۆڤار)، ژمارە ١٨١ی ١٩٦٠/٦/٣٠.

(٧) د. کەمال مەزهەر، (**چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد**)، بەرگی دووەم، بەرهەڤکرن: عەبدوڵڵا زەنگەنە، بڵاوکراوەکانی دەزگای موکریانی، هەولێر، ٢٠٠١، لا ٤٩١.

[٨] د. کەمال مەزهەر، **ڕەنگین (گۆڤار)**، کورد لە دروشمی پاشاییدا، ژمارە (١١٠)ی ڕێکەوتی چواردەی مارتی ١٩٩٨.

[٩] بۆ زیاتر زانیاری بنواڕە: عەبدوڵلا زەنگەنە، (ژین) گۆڤاری سەردەمی سەرەتای ڕاچەنینەکانی کورد، ڕۆژنامەڤانی (**گۆڤار**)ی سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان، ژمارە(٦-٧)ی زستانی ٢٠٠١ل١٨١.

[١٠] بە داخەوە لە کتێبخانەکەماندا دەستمان بەسەر کتێبەکەی د. عەلی تەتەر ڕانەگەیشت کە (**تۆژەر**) بۆ خۆی کردوویەتییە سەرچاوە، بەڵام نامەی ماستەرەکەی لەبەردەستە دەقێکی ئاوەها بێ سەروبەرمان تێیدا نەدۆزیوەتەوە.

[١١] یەك لە فەلسەفەکانی (**بەشیر مشیر**) ئەوە بووە: (**تۆ بینووسە و من تەئلیفی دەکەم**).

[١٢] بەڵام وا لێرەدا دەبینین بۆ ئەو بابەتە گرنگەی (**ئاڵای کوردستان**) هیچ کام لەم سێ سەرچاوەی ئێمەی بەکارنەهێناوە.

[١٣] چەندین جار ئێمە خۆمان ئەو تێبینییەمان لە د. کەمال مەزهەر گوێ لێ بووە.

[١٤] بنواڕە: د. ئازاد عوبێد ساڵح، هەمان سەرچاوە، لا ٢٥٩.

[١٥] هەموو ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانە، چ لە دووتوێی کتێب و چ ئۆریژناڵەکانیان، لە لای ئێمە هەن. لە بنکەی ژین و لای هاوکارانمان ڕەفیق ساڵح و سدیق ساڵح یش هەن. بۆ ساغکردنەوەی ئەو جۆرە پرسانە تاوتوێی هەموویانمان کردووە.

[١٦] دوا ژمارەی ڕۆژنامەکە لە ٢/٧/ ١٩٦٢ .

[١٧] لە بەرنامەی (**بنکەی ژین**)دایە هەموو ژمارەکانی بە چەند بەرگێك چاپ بکاتەوە.

[١٨] وەکو دەبینن ئێمە چەند جارێك وشەی (**بەروار**)مان بەکار هێناوە، هەندێ لە ڕۆشنبیرانمان بە بەکارهێنانی ئەم وشەیە سەغڵەت دەبن، گوایە ئەو وشەیە لە ناوی شارۆچکەی (**بەرواری**) بادینانەوە هاتووە، ئەویش لە سەردەمی کۆماری کوردستان لە مەهاباد، گوایە یەکێك، پێمان وایە ئەنوەر مایی بووە، لە تەنیشت ئەو ڕۆژەی هەموو جار لەسەر نامەکان دەیاننووسی، نووسیویە: بەرواری، نامەوەرگر، کە پێمان وایە عەبدولڕەحمان زەبیحی بووە، ئەو وشەیەی پێ جوان بووە هەوڵی داوە لای خۆیان بەکاری بێنێ، ئەوەبوو دواتر هەموو کوردستانی گرتەوە، پێمان وایە بەکارهێنانی ئەو وشەیە و زۆری دیکەش لە خۆڕایی و بە پاساوی بێ بنەما هەولی نەهێلانیان دەدەین، پێشمان وایە هەر ئاسنی سارد دەکوتینەوە، وەکو د.کەمال مەزهەر دەڵێ: (**هیتلەر**) بەم هەموو جەبەرووتەی خۆی نەیتوانیوە پێڵاوی پاژنە بەرزی خانمان لەناو بەرێت.

[١٩] بڕوانە: حوسێن حوزنی موکریانی، سەر زەوی ماد، وە نەوەی ماد، دەنگی گێتیی تازە، ژمارە(١٥)ی ساڵی سێیەم، بەرگی (٢٦)ی ڕۆژی دووشەمەی ١٩٤٦/٢/١١

[٢٠] بڕوانە: ڕۆژنامەی کوردستان، ئامادەکردنی ڕەفیق ساڵح و سدیق ساڵح، پرۆژەی هاوبەشی (**بنکەی ژین**) و (**دەزگای ئاراس**)، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٧.

(٢١) د. هیمدادی حوسێن، ڕۆژنامەوانی کوردی، سەردەمی کۆماری دیموکراتی کوردستان ١٩٤٣-١٩٤٧، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨، ل ٥٢٢.

(٢٢) هەمان سەرچاوە، ل ٥٢٣.

(٢٤) هەموو ژمارەکانی ئەم ڕۆژنامەیە دووبارە چاپ کراونەتەوە، بنواڕە: ڕۆژنامەی کوردستان، پرۆژەی هاوبەشی (**ئەکادیمیای کوردی**) و (**بنکەی ژین**)، چاپخانەی حاجی هاشم، هەولێر، ٢٠١٢.

(٢٥) هەموو ژمارە ئۆریژناڵەکانی ئەم گۆڤارە لای خۆمان و (**بنکەی ژین**) و چەند کتێبخانەی دیکە پارێزراون، بەم دواییانەش لە پێنج بەرگدا دووبارە لە چاپ دراونەتەوە، بڕوانە: د. هیمدادی حوسێن، ڕۆژنامەوانی کوردی، گۆڤاری هیوا ١٩٥٧-١٩٦٣، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨.

(٢٦) بنۆڕە: (**مامۆستا بەشیر مشیر**)، (**ناوی مانگە کوردییەکان لە چییەوە هاتووە؟**)، هیوا (گۆڤار)، ژمارە (٣٤)ی ساڵی ٥، ئەیلوولی ١٩٦١.

(٢٧) ئەم گۆڤارانەش لە کتێبخانەکەی خۆمان پارێزراون و هەموو ژمارەکانی، بۆ ئەم باسە بە وردی بەسەر کراونەتەوە.

(٢٨) Shafiq kazzaz, The kurdish calander, (The kurdish Journal) Vol.١, March ١٩٦٤.p.١٢.

(٢٩) ئەم مانگانە بەم شێوەیە لە لایەن مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانییەوە ڕێکخراون. بە وەرگرتن لە ژمارە (١)ی بەرگی (٦)ی گۆڤاری (The kurdish Journal)، ١٩٦٧، ئەمریکا. ئەوەی شایانی باسە یەك لە ژمارەکانی ئەم گۆڤارە کە لە جەژنی نەورۆزدا بڵاوکراوەتەوە لەسەر بەرگەکەی لەبەرامبەر مانگی مارت دا نووسیویە (نەورۆز) بەرامبەرەکەشی ساڵنامەی کوردی، ئەوەی بەشیر مشیر پێشنیازی کردووە، لەسەر بەرگەکەی نووسراوە.

(٣٠) چاوپێکەوتن لەگەڵ د.جەبار قادر ٢٠١٣/١/٢١ .




چێوەی خۆرو تیشکەکانی ئاڵا،
بەپێی (یاسای ئاڵای کوردستان)، دەبێت بەم پێوانەیە بێت

**ملخص البحث**

تدور هذه الدراسة حول مسألتين أساسيتين، أولهما قراءة نقدية لبعض الآراء الواردة في موضوع (**تاريخ علم كوردستان**) وسد بعض الثغرات الواردة فيه والمنشور في العدد (٢٣) من مجلة الاكاديمية الكردية بقلم الدكتور آزاد عبيد، أما المسألة الثانية فتدور حول التقويم الكردي المعمول به حالياً والحقائق المتعلقة به. وقد أشرنا فيما يتعلق بالمسألة الثانية الى إفتقارنا الى أدلة علمية رصينة تؤيد وجود مثل هذا التقويم. اما الاشهر الكردية والتي تتعلق بفصول السنة والتغييرات المناخية خلالها فيبدو أنها قديمة جداً بين الكرد، ولكن مايتعلق بالتقويم السنوي الكردي، فيعود فكرة اقتراحه الى المؤرخ الكردي حسين حزني الموكرياني في العام ١٩٤٦، والذي أضاف ٦١٢ عاماً الى التاريخ الميلادي، وهو التاريخ الذي سقطت فيه نينوى على أيدي الميديين الذين يعتبر الكرد الحاليون أحفادا لهم، كما تشير الى ذلك العديد من الدراسات التاريخية. والاشارة هنا الى ٦١٢ قبل الميلاد وهو نفس العام الذي جرى خلاله ذلك الحدث التاريخي، بعد ذلك اجرى بشير مشير في عام ١٩٦٢ تعديلا لهذا التقويم السنوي واقترح بموجبه اعتبار عام ٧٠٠ ق. م بداية للتقويم الكردي، كونه العام الذي يشير الى قيام الدولة الميدية.

من خلال دراسة موسعة وموثقة للصحافة الكردية توصل الباحث الى وجود اسماء فصول وشهور السنة بالكردية، ولكنه لم يتوصل الى اقرار وجود تقويم كردي مستقل، كما يعمل به حالياً.

أما الجانب الآخر من المسألة الثانية التي ركز الباحث عليها في بحثه هذا، هو عدم تطابق العلم المعمول به حالياً في كوردستان مع القانون الخاص بالعلم الذي يحمل رقم (١٤) واقره برلمان كوردستان بتاريخ ١١تشرين الثاني ١٩٩٩، رغم انه يتطابق كلياً مع ما اعتبره الكرد ضمن مقدساته خلال القرون والعقود الماضية. لذا فان الباحث، ووفق المواصفات الواردة في القانون، رسم نموذجا للعلم الكوردستاني بالمقاسات الهندسية الدقيقة. ويقترح ان تجرى التعديلات وفق المقترحات الواردة في البحث بعد التأكد من صحته ودقته.

## Abstract

The present study deals with two basic issues; the first is a critical review of some viewpoints expressed by Dr.AzadUbed in his article entitled ‘ The history of Kurdistan flag’ published in Kurdish Academy Journal number 23; the second, however, treats the current Kurdish calendar and relevant facts. As far as the second issue is concerned, we have stated that such a calendar is lacking in sound authentic evidence. As for the Kurdish months, which relate to annual seasons and climatic changes, they seem to be quite rooted and old among the Kurds.

However, the annual Kurdish calendar was put forward by the Kurdish historian Hussein Huznimukiryani in 1946 to which he added 612 years. This number 612 is the date in which Nineveh fell to the hands of the Medes whom the Kurds call their ancestors, an argument supported by some academic studies.

It is worth noting that Basheer Musheer in 1962 suggested a change to this date making it 700 as a starting date for the Kurdish calendar, the year in which the Medean state was founded.

After a thorough and well-documented study of Kurdish journalism, the researcher has concluded that Kurdish seasons and monthes did exist, but could not verify an independent Kurdish calendar which is now in use in Kurdistan.

The second issue emphasized by the researcher is non-conformity of the current Kurdistan with the special enacted law for flags, which bears number 14 legislated by the Kurdistan parliament on 11/11/1999 despite the fact that it completely matches what the Kurds have always found as their inviolable symbols. Thus, the researcher has come up with a sample for a typical Kurdistan flag in accurate geometrical measurements, and proposes modifications in accordance with his study outcomes.



سوپای سەردەمی شێخ مەحموود و ئاڵاکەیان – سەرچاوە: سدیق ساڵح




نیگارێکی قەڵەمکێشی (**ئاڵای کوردستان**) لەسەر بەرگی بڵاوکراوەی ژمارە (٢)ی کۆمەڵەی (خۆیبوون) لە ساڵی ١٩٢٨دا، د. نەجاتی عەبدوڵڵا لە ساڵی ٢٠٠٧دا، ئەم نیگارەی لە پاریسەوە بۆ ناردووین.




روو بەرگی یەکەمی ژمارە (١)ی گۆڤاری هاوار لە ساڵی ١٩٣٢دا بڵاوکراوەتەوە، لە ژمارەی تیشکەکانی خۆرەکە وردبنەوە، دەبینن ١٨ تیشکە.




روو بەرگی دووەمی ژمارە (١)ی گۆڤاری هاوار لە ساڵی ١٩٣٢دا بڵاوکراوەتەوە، لە ژمارەی تیشکەکانی خۆرەکە وردبنەوە، دەبینن ئەمەشیان ١٨ تیشکە.



نیگارێکی راستەقینەی ئاڵای خۆیبوون، وەکو خۆی، بەبێ دەستکاری لە جام گیراوە، نیگارەکە ئێستا لەماڵی سینەم خانی جەلادەت بەدرخان پارێزراوە، سەیرکەن خۆرەکەی ١٦ تیشکە.



نیگارێکی دیکەی هەمان ئاڵای پێشوو لە ٢٠١٢/٨/١٢دا بە کامیرای رۆژنامەنووس سەعید عەبدوڵڵا گیراوە، سەیر بکەن لەبەر کۆنی ئاڵاکە رەنگە سەوزەکەی کاڵ بۆتەوە، لەولاوەش کتێبەکانی سەلاح سەعدوڵڵا بە دیوارەکەوە دیارن ـ هەولێر ـ شارۆچکەی عەنکاوە.




هەمان نیگاری سەر بەرگی گۆڤاری ساڵی (١٩٣٢)، دوای ئەوەی (حەمرەش رەشۆ) ژمارە ٢٥–٥٧ گۆڤارەکەی لە ساڵی ١٩٧٦دا لە ئەڵمانیا چاپ کردۆتەوە ئەم کتێبە لای (غەفوور مەخمووری) پارێزراوە.




نیگارێکی دیکەی قەڵەمکێشی (ئاڵای خۆیبوون)، کاتی خۆی لە پاڵ رەسمێکی تایبەتی ئیحسان نووری پاشا و یەشار خانمی هاوسەری هەبووە، وا پێدەچێ نیگاری ئاڵاکەش رەنگ کرابێ. ئەم وێنەیە لای د.ئازاد عوبێد هەڵگیراوە.




قەڵەمکێشی ئاڵای کوردستان لەسەر بەرگی هەر ١٢ ژمارەکەی بۆڵتەنێك، کە لە نێوانی ساڵانی ١٩٤٨–١٩٥٠ دا لە پاریس دەرچووە، بە رەنگاوڕەنگ دەبینرێ. وا دیارە ئەمەشیان هەمان نیگارەکەی سەر بەرگی بڵاوکراوەکانی (**خۆیبوون**)ە، لە دیوی ناوەوەی دوا بەرگی بۆڵتەنەکەش نەخشەی کوردستان بەم شێوەی خوارەوە هەبووە ـ هەر ١٢ ژمارەی بۆڵتەنەکەش لای (**د. نەجاتی عەبدوللا**) و (**د. جەبار قادر**) ئەرشیف کراون.






ئەمەیان وێنەی بڵاوکراوەیەکی (**حیزبی هیوا**)یە، کە لە ساڵی ١٩٣٩دا، لە هەولێر بە دەستخەتی بڵاوکراوەتەوە. سەیری ئاڵای کوردستان و ژمارەی تیشکەکانی سەر ئاڵاکە بکەن. ئۆریژناڵەکەی ئەم بڵاوکراوەیە لای پارێزەر (**تاریق جامباز**) پارێزراوە.



سەیری ئەم ئاڵایـەی سـەردەمی کۆمـاری کوردسـتان بکـەن، نیگـاری خۆرەکـەی لەسـەر نییە. لەولاشەوە وێنەی دروشمی کۆمار دانراوە.



لە وێنەی ئاڵاکەی پشت جەنابی مەلا مستەفای بارزانی و پیاوە ئایینییەکان وردبنەوە.

17. Proclamation of the Republic

Qazi Muhammad at Chwar Chira circle, the Second of Rebandan 1324 (22 January 1946
Mulla Mustafa below Qazi



19. The Cabinet and other officials, Mahabad, February 1946
*Seated:* Qazi Muhammad
*Front row, l-r:* Ali Raihani; Karim Ahmadain; Abdul Rahman Ilkhanizadeh; Wahab Blurian; Muhammad Amin Moini; Ahma dIlahi; Khalil Khosrawi; Haji Mustafa Daudi
*Back row, l-r:* Sadiq Haidari; Muhammad Yahu; Manaf Karimi; Sayyid Muhammad Tahazadeh Ayubian; Husain Furuhar; Abdul Rahman Zabihi

سەیری وێنەی ئاڵاکەی پشت جەنابی قازی محەمەد بکەن.



20. Chiana village near Naqadeh, spring 1946
*L-r (after guard with automatic weapon):* Rahim Javanmard Qazi; Salahaddin Kazimov (Kakagha; USSR); Sayyid Ahmad Sayyid Taha (Iraq); Qazi Muhammad; Said Homayun; Muhammad Rasuli 'Dilshad'; Lt Khairullah (Iraq); Qolam Reza Khan (Qarapapagh tribe)

ئەم چوار وێنەیەی سەرەوە لە کتێبەکەی ولیام ئیگلتن وەرگێڕدراوی سەید محەمەد سەمەدی وەرگیراوە.



لە زۆربەی سەرچاوەکان دەڵێن ئاڵای سەردەمی کۆمار ئەوهابووە، بەپێی شیعرێکی (هێمن)ی شاعیریش دەبێ ئاوەها بێ، ئێوەش بەراوردی خۆتان لەگەڵ ئاڵای پێشووتر بکەن کە بەبێ دروشمەکەیە. وێنەکەی ژێرەوەش ئاڵاکەی کۆمار لەدوورەوە دیارە و سپییەکەی گەورەترە.





*سـەیر کـەن عـەلی کـوڕی قـازی محەمەد، کە لە سـەردەمی بـاوکی ناسـراببوو بـە (کـوڕی ڕەش)، ئالآیـەکی کوردسـتانی ئاوەهـا داوەتـە دەسـت سـەرۆکی حکومـەت. دەزگـای ئـاراس لـە دووتوێی کتێبێکی کـریس کۆچـیرا ئەم نیگـارەی وەکـو خـۆی بـلآوی کردۆتـەوە. کـاتێ لەسـەر ئـەو وێنەیـە گلـەییمان لـە بەرپرسـی دەزگاکە لەهۆی دانانی ئەو وێنەیە کرد، گـوتی: قەیـدی چییە ئـەوە کـارێکی هونەرییـە و کـاتی خـۆی پێکەنینی لێ کەوتۆتەوە.
* هـەمان نیگـاری پێشـوو لەسـەر بەرگی گۆڤـاری (ینـابیع)ی ژمـارە (٩)ی شـوباتی ٢٠٠٥، وەکـو دەبیـنین وا دیـارە ئالآکـە هەڵگێڕدراوەتەوە.



**ئالامە:** بەلاڤۆکەکا بەروەختە، تایبەتە ب ئالاو پیرۆزییێ نەتەوەییڤە، ئەم بلاوکراوەیە کۆمەلێك گەنج لە زاخۆ دەریان کردووە. وێنەی سەر بەرگی ئەم بەلاڤۆکەش – ٢٠٠٩/٦/٢٩ بە راشکاوی پێمان دەلێ: رۆژنامەنووسانیش یان گوێ بە یاسای ئالای هەرێمی کوردستان نادەن یان ئاگایان لێی نییە..!. ئەوەی لە ژمارە(٢)ی ئەم بەلاڤۆکە زیاتر سەرنج رادەکێشێ بابەتێکە بە ناوونیشانی: **(ناسینا ئالایێ کوردستانێ)** کە بە ئیمزای **(یوسف هەسەن)**ە، هەندێ لە پێوانەکانی ئالای تێدایە لەوەی ئەو ئالایانە دەکات کەوا ئێمە رەخنەی لێ دەگرین، کاتێ لە نووسەرەکەیم پرسی: سەرچاوەی ئەم بابەتەت لە کوێ بوو؟ گوتی: ئینتەرنێت..!. ئەوەی شایانی باسیشە هەمان بابەت، بە کرمانجی خواروو، لە ژمارە(٢٣)ی ؟٢٠٠ی گۆڤاری گەرمیان لە بەغدا بلاوکراوەتەوە.








وێنەی ئەم ئاڵایەی ناو حەرەمی پەرلەمان لە گۆڤاری **(گـوڵان)** وەرگـیراوە، ئـەو (٧) وێنەکەی پێشو وتـریش لـە هـەردوو گۆڤـاری **(دەنگـی پێشـمەرگە)** و **(پێشـمەرگە)** وەرگیراون.

ئەمڕۆ ٢٠١٣/١/٢٤ بەتایبەتی لە دوورەوە سـەیری ئـەم ئاڵایـەمان کـردەوە، بینیمـان هەمان ئاڵایـە کـە ئێمـە لـەم باسـەدا ڕەخنـەمان لێـی گرتـووە و بـەپێی پێوانـەکانی نـاو یاسـاکە نییـە، هـەروەها پاشـتر بـەناو شـاری هـەولێردا سـووڕاینەوە ئـاڵای **(عـەجیب و غەریب)** مان بینی، پێ نەدەچوو هیچ کامێکیان بەپێی یاساکە نەخشەسازییان بۆ کرابێ، تـەنیا ئاڵایـەکمان، لـە شـەقامی شـۆڕش، لەسـەر باڵاخانـەی گروپـی **(دیـوان)** بـینی زۆر بەشکۆوە دەشەکایەوە و کـەمێك لـە پێوانـەکانی نـاو یاسـاکە نزیـك بـوو. لـە ڕاستیشـدا نەمانبیستووە لە هیچ وڵاتێکی ئەم گـۆی زەویـە ئاڵایـەك هـەبووبێت بـەم دەردەی ئـاڵای کوردستان برابێ..!




ئەم هێڵکارییەی سەرەوە لەلایەن ئێمە هێڵکاری بۆ کراوە و (ئەیبوب محەمەد باوەکر)یش لە سەندیکای رۆژنامەنووسانی کوردستان ڕەنگەکانی جیا کردۆتەوە، وەکو لەخوارەوە دەبینین ئەمە دەبێتە ئاڵای ڕاستەقینەی کوردستان بەپێی (یاسای ئاڵای کوردستان)، کە لەپەرلەمانی کوردستان دەرچووە. پێوانەی ئاڵاکەش (٦٠ × ٩٠)سم.



# ڕاستکردنەوەی چەند هەڵەیەکی مێژوویی سەبارەت بە پەیوەندیی مەولەوی و حەمە پاشای جاف و مەحموود پاشا و ئامینە خانی سەردار

پ. د. حەسەن جاف

سەید عەبدولڕەحیم ناسراو بە (مەولەوی) کوڕی مەلا سەعیدی تاوگۆزییە، تاوگۆز یەکێ لە تیرەکانی باوەجانیی[1] جافە[2]، وەکو زۆربەی نووسەران هاوڕان[3]، یووسف جاف باپیرە گەورەی پێنجەمی مەولەوییە، کە یەکێك بوو لە نەوەکانی مەلا ئەبو بەکری موسسەنیف (مصنف)[4]، کە لە سەردەمی سەفەوییەکاندا ژیاوە. خۆی و زۆربەی نەوەکانی لە گوندی (چۆڕ)ی لە کوردستانی ڕۆژهەڵات دانیشتوون. مەولەوی سالّی ١٢٢١ھ/١٨٠٦ز لە گوندی قشلاقی (سەرشاتە)ی تاوگۆز هاتۆتە دنیاوە[5] . پاش تەواوکردنی کتێبە وردە باوەکان لای باوکی، بەپێی یاسای ئەو سەردەمە، بۆ فەقێیەتی دەچێت بۆ حوجرە و مزگەوتەکانی کوردستان، کە ئەو سەردەمانە شوێنی خوێندن بوون و ڕێگای زانست و زانین دەگرێتە بەر. مەولەوی لەم گەشتەیدا زۆر دێهات و شاران گەڕاوە، لەوانە: سنە، مهاباد، بانە، جوانڕۆ، پاوە، زەهاو، سلێمانی، هەورامان و زۆر شوێنانی تر، بە سوختەیەتی لە مەدرەسەی (نودشە)دا بووە، لەوێوە چووەتە مەریوان ماوەیەکی لە (چۆڕ) و لە (نەنە) بووە لەوێشەوە چووە بۆ (سنە) لە مزگەوتی (وەزیر) چەند مانگێك ماوەتەوە، لەوێوەش چووە بۆ (بانە) لە کۆتایی گەشتەکەیدا لە پایتەختەکەی بابان و شارە خنجیلانەکەی ئەوسای سلێمانی، لای عەللامەی بەناوبانگ مەلا (عەبدولڕەحمان)ی نۆدشەیی لە مزگەوتی مەڵکەندی ئیجازەی مەلایەتی وەردەگرێت[6]، ئینجا لە گوندی چرۆستانەی (نەورۆڵی)[7] لە ڕۆژئاوای هەڵەبجە، نیشتەجێ دەبێ بۆ ماوەیەك لەوێدا بەدەرس وتنەوە خەریك دەبێت. لەم گوندەدا (عەنبەر خاتوون) مارە دەکات و خێزان پێك دەهێنێ. هەر

لەوێدا باخێكی گەورە دەنێژێت. (ئێستاش باخەكە ماوە) هەندێ مەڕو ماڵات پێكەوە دەنێ، شێخ محەمەدی كوڕی، كە تازە پێ دەگا و كوڕێكی ئازا و هەڵكەوتووش دەبێ، مەولەوی لە پەنایدا دەحەسێتەوە و بە كامەرانی ژیان دەباتەسەر و دەرزی خۆی دەڵێتەوە، پاشان ناكۆكی لەنێوان جافەكان و دەوڵەتی عوسمانیدا ڕوودەدا. ئینجا بۆ سەركوتی جافەكان بە ڕابەرایەتی حەمە پاشا سەرۆكی عێلی جاف هێزێكی چەكدار بە فەرماندەیی (عومەر پاشای سەردار)[8] پەلاماری هەڵەبجە و دەوروبەری دەدا، جافەكان دەشكێن و لە ناوچەی شەمێران و كەژی (زمناكۆ) خۆیان دەگرنەوە. لە ئەنجامدا گوندی (چروستانە) و چەند گوندێكی تر دەسووتێن، مەولەوی ناچار دەبێ چرووستانە بەجێ دێڵێ و لە دێی (وڵوەڕ) لە شەمێران نیشتەجێ دەبێ، ژیانی بەرەو باشی دەڕوات و خەمی نامێنێ و خۆی و كەسەكانی بە جوانی دەژین و دەحەسێنەوە، چونكە (شێخ عەلی عەبابەیلێیی) كە لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە سەركاری شەمێران دەبێ بەشێوەیەكی دڵسۆزانە زۆر خزمەتی مەولەوی و كەسوكارەكەی دەكا و ڕێزیان دەگرێت. بەم بۆنەیەوە بە باشی دەژین و دەحەسێنەوە پاشان، لەلایەن دەوڵەتی عوسمانییەوە شەمێران دەدرێ بە حەمە پاشای جاف، ئەویش شێخ عەلیی ناوبراو دەردەكا و (عوسمانی خاڵە) دەخاتە شوێنەكەی. بەم كارە مەولەوی ژیانی شپرزە و ئاڵۆز و تاریك دەبێ. زەوییوزار و كێڵگە و بەراوەكان لە مەولەوی و كەسوكارەكەی دەسێننەوە و ئازاریان دەدەن. هۆی دانانی عوسمانی خاڵە و لابردنی (شێخ عەلی) وەك لە جەنابی حەمە سەعیدی شەمێرانی[9] و چەند كەسانی ترم بیستووە ئەمەیە: (عەشیرەتی گەڵباخی و مەریوانی لە پەنای دوشمنایەتیدا لەسەر شیویی مەریوان پەلاماری جافەكان دەدەن و قەڵای (خاو میراوا)یان لێ دەسێننەوە و داگیری دەكەن. جافەكان بەمە زۆر دڵگیر دەبن و دەكەونە مەترسییەوە، پاشان حەمە پاشا دەڵێ: هەركەس دوژمن لەو قەڵایە دەركا چی داوا بكا من خاوەنی نیم و هەتاهەتایە ڕێزی لەسەر سەرم، عوسمانی خاڵە گورج بۆ جێبەجێكردنی ئەم كارە خۆی و شەمێرانییەكان مەردانە پەلاماری دوژمن دەدەن و قەڵاكە دەگێڕنەوە، لە ئەنجامی ئەم كارەدا حەمە پاشا شەمێران دەدا بە عوسمانی خاڵە و شێخ عەلی دەردەكا[10].

دوای ئەم ئاڵوگۆڕە شەمێرانییەکان جێ بە مەولەوی و خزمەکانی لێژ دەکەن و لە تەکیاندا ناگونجێ، وا دەردەکەوێ بە هاندانی حەمە پاشا عوسمانی خاڵە زەمینە خۆش دەکا بۆ ئەوەی شەمێرانییەکان بەرامبەر بە مەولەوی و خزمەکانی باش نەبن و ئازاریان بدەن، ئەمانیش ناچار دەبن دەڕۆن بۆ (تاوەگۆز) و لە دێی (سەرشاتە) جێگیر دەبن. (ئەم ناکۆکییە بە ئاشکرا و بە زەقی لە قەسیدە فارسییەکەی خودی مەولەویدا دەردەکەوێ)[11]. لەم بارەیەوە پێش ئەوەی سەبارەت بەم هەڵە مێژووییەی بەڕێز مامۆستا محەممەد ئەمین ئەردەلانی روونکردنەوەیەك بخەمە ڕوو، دەڵێم: مامۆستای ناوبراو بەڕاستی زەحمەتێکی فراوانی لە وەرگێڕانی شیعرەکانی مەولەوی لە زاراوەی هەورامییەوە بۆ زاراوەی سۆرانی کێشاوە، جگە لەم زەحمەتە شایانی وتنە زۆربەی بۆچوونەکانی ڕاستە و جێی پێزانینە.

ئەگەر لە هەندێ بۆچووندا لەگەڵیا نەبین، یا هەڵەیێکی بەسەردا تێپەڕ بووبێت، ئەوە ناگەیەنێت لە ئەرزش و بەهای بۆچوونەکانی کەم کەینەوە.... مامۆستا محەممەد ئەمین، ئاماژەی بە ڕووداوی ناکۆکی لە نێوان جافەکان بە سەرکردایەتی حەمە پاشای جاف و دەوڵەتی عوسمانی بە فەرماندەیی عومەر پاشای سەرداردا کردووە، بێ ئەوەی بڕواتە ناوەڕۆکی هۆی ئەم ناکۆکییەوە، چونکە هۆکانی ئەو ناکۆکییە نەزانین تفەنگ بە تاریکییەوە دەنێین.

ئەوەی شایانی باسە دەوڵەتی عوسمانی لە نیوەی یەکەم و دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا هەوڵی داوە بە دەستێکی پۆڵایین بەسەر کوردەکاندا ڕابگا و سەرکوتیان بکات و میرنشینە کوردەکان بە یەکجاری لەناوبەرێ، بە تایبەت لە سەردەمی سوڵتان مەحموودی دووەمدا کە لەساڵی ١٨٣٠ زاینییەوە دەستی کرد بە پەلاماردانی کوردەکان[12] و لەناوبردنی میرنشینە نیمچە سەربەخۆکانی کورد[13]. بەڵام ئەوەی ڕاستە کوردەکان هەروەها بە ئاسانی ملیان بۆ کاربەدەستانی عوسمانی شۆڕ نەدەکرد، سەرۆك هۆز و میرە بە دەسەڵاتەکان هەر کا و ناکاوێ لە بابی عالی یاخی دەبوون و حکوومەتی عوسمانی هەر بەوە رادەگەیشت لەشکر بکاتە سەر کوردستان و میرە کوردەکان سەرکوت بکات[14].

دوای بەستنی پەیماننامەی (ئەرزەڕۆمی دووەم ١٨٤٧ز). شەڕی گەرم لەنێوان دەوڵەتی عوسمانی و قاجارەکاندا نەما، وەك ماددەی هەشتەمی ئەم پەیماننامەیە ئەم ڕاستییەمان بۆ روون دەکاتەوە. لەم ماددەدا هاتووە هەردوو دەوڵەتەکە موافەقەتیان کرد بەهێزی هەردوو لا لەو عەشایرە کوردانە بدەن کە لەسەر سنوورەکانیاندا هاتوچۆ دەکەن و ئاژاوە دەنێنەوە، لەشکری هەردوولاش لەسەر سنوورەکان جێگیر ببێ[١٥].

لەم قۆناغەدا هۆزی جاف یەکجار بەهێز بوون و سەرۆکی هۆزی جاف حەمە پاشای جاف بە هەموو توانایەکیەوە هەوڵی داوە هۆزەکەی بە (سەربەخۆیی) بژین و کەوتووەتە تەلاشەوە و سەر بۆ کاربەدەستانی عوسمانی دانەنوێنی، لەبەر ئەمە عەشایری جاف گرفتاری و ناڕەحەتییێکی زۆریان بۆ دەوڵەتی عوسمانی پێك هێنا.

سەبارەت بەم زاتە خوالێخۆشبوو پیرەمێرد دەڵێ: (حەمە پاشای کوڕی کەیخوسرەو بەگی سلێمان بەگی جاف، لە رۆم و عەجەمدا بە پیاوێکی وشیار و ناودار دەنگی دابووەوە، لەگەڵ دوو دەوڵەتدا پەنجەی لێی دەدا، ئەم خۆی بە ئەقڵ و سیاسەت و کیاسەت، قادر بەگی برای بە شەجاعەت و بەسالەت، عێلی جافیان گەیاندە هەژدە هەزار بنەماڵە، تەنانەت حەمە پاشا لەگەڵ والی بەغدادا بوو بە ناخۆشییان سەرلەبەر عێلی جاف بار کرد و رووی لە ئێران کرد، ناسرەددین شا هەموو بەرەی زەوی جوانڕوو و قەسری شیرینی لە قەبەڵ کرد.)

هەر ئەم دەسەڵاتە بەربڵاوەی حەمە پاشا بوو کە بووە هۆی ململانێ و کەشمەکێش لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی و ئێراندا، سەرئەنجام بە دەسیسەیەکی قێزەون لەنێوبرا و سەری تێداچوو، لەم ڕووەوە د. عەبدولعەزیز نەوار دەڵێ: (خێڵاتی جاف ناڕەحەتی و گرفتارییەکی زۆریان بۆ دەوڵەتی عوسمانی دەخولقاند، دەوڵەتی عوسمانی بۆ ئەوەی بەلای خۆیدا ڕایان بکێشی نازناوی پاشایەتییان بە حەمەپاشا بەخشیوە، بەڵام ئەم نازناو بەخشینە حەمە پاشای لە بیری سەربەخۆیی نەهێناوەتە خوارەوە، ئەوە بوو لەساڵی ١٨٦٦ز[١٦] لە ناوچەی شێروانە قەڵایەکی گەورە دروست دەکات، ئەم قەڵایە ئێستاش ماوە و ڕەمزی سەربەخۆیی و دەسەڵاتی ناوبراوە)[١٧]. لەم هەوڵ و تەقەڵایەی حەمە پاشا

بۆ بە دەستهێنانی سەربەخۆیی و سەربەستی، ناڕەزایی عوسمانییەکان پەرە دەسێنێت و لە رووداوێکدا حەمەپاشا دژ بە دەوڵەتی عوسمانی رادەپەڕێ.

رووداوەکەیش ئەوە بوو وەکو لە پێشەوە باسمان کرد، سەردار عومەر پاشا داوا لە حەمە پاشا دەکا لە ناوچەی شارەزووردا زەویوزار بکڕێ بە مەرجێ جاف کۆچەری تێدا نیشتەجێ بکات و ڕەسمی بخاتە سەریان تا بە کشتوکاڵەوە خەریك بن[18]، حەمە پاشا ئەم فەرمانەی بە دڵ نابێ چونکە لای وا دەبێ، دامەزراندنی جاف و بە کشتوکاڵەوە خەریکبوونیان مانای بەدیلبوونیانە و بەمەش سەربەستیی خۆی و هۆزەکەی لە دەست دەدا.

ئیتر بەم بۆنەیەوە، حەمە پاشا سەرپێچی لە فەرمانی عومەر پاشا دەکات و پێی ڕادەگەیەنێ کە ئەوان وەك (بازێك) سەربەستن، هەر کوێیان بە دڵ بێ لەوێ دەنیشنەوە، چۆن بە دەستی خۆیان دەست و پەلی خۆیان بخەنە زنجیرەوە، هەر شوێنێ ئەوانی پیا بڕۆن موڵکی جافە، چ لە ئێران چ لە عوسمانی[19]، بەڵام شەڕ و پێکدادانێکی ئەوتۆ ڕوو نادا تەنها چەند دێهاتێکی جاف لەلایەن عومەر پاشاوە دەسووتێنرێت[20] ، حەمە پاشاش لەگەڵ سەرجەم تیرەکانی جافدا ڕوو دەکاتە ئێران بەڵام تایفەی شاتری و هاڕوونی لەو کۆچەدا هاوبەشی ناکەن و لە دەوڵەتی عوسمانیدا دەمێننەوە.

بەپێی زانیارییەك کە لە رۆژنامەی (زەورا) رێکەوتی ١٨٧٣/٤/٩دا بڵاو کراوەتەوە، هەردوو تیرەکە کە (ناویانمان هێنا) لەمەولا راستەوخۆ موراجەعەت بە حکوومەتی عوسمانی دەکەن و حەمە پاشا دەخەنە لاوە، چونکە سەرپێچی لە فەرمانی دەوڵەتی عوسمانی کردووە، ئەوە بوو ئەو دوو تیرەیە گفتیان دا کە لە بەرانبەری ئەو زەویوزارەدا کە پێیان دەسپێردرێ رەسمێك بە گەنجینەی دەوڵەتی عوسمانی پێشکەش بکەن[21].

گومان لەوەدا نییە لە نیزامی عەشایریدا ئەو تیرەی لەگەڵ عەشیرەتەکەیدا بەبێ هۆیەکی گونجاو کۆچ نەکات و گوێڕایەڵی سەرۆکی عەشیرەتەکەی نەبێت، بە یاخی دەژمێردرێت و شاترییەکان، بەتایبەت تایفەی کەرەم وەیسەکان، بە یاخی درانە قەڵەم.

ڕۆیشتنی حەمە پاشا بەهێزێکی گەورەی جافەوە بۆ ئێران دژی ئەو ڕێکەوتننامەیە بوو کە لە پەیماننامەی ئەرزەڕۆمی دووەمدا ساڵی ١٨٤٧ز. دیاری کرابوو، ئەبوایە بەپێی ئەم پەیماننامەیە، دەوڵەتی ئێران بەهێز دژی حەمە پاشا و جافەکان ڕاوەستایە، ڕێگای نەدابایە پێیان بەڵام لە حەقیقەتدا ئێرانییەکان لە توانایاندا نەبووە ئەم هۆزە ئازا و چەکدارە کۆچەرییە سەرکوت بکەن، چونکە لەو سەردەمەدا جۆرێك لە ساردی کەوتبووە نێوان هەردوو دەوڵەتەوە بە بەرژەوەندیان زانیوە ڕێگەی دیبلۆماسی بگرنەبەر، وەك ئەمری واقیع، لە حەمە پاشا و هۆزی جاف نزیك بوونەتەوە، ویستوویانە بۆ خزمەتی سیاسەتیان ڕایانکێشن بۆ ئەنجامدانی ئەم سیاسەتە، خزمەتێکی زۆریان بە حەمە پاشا کرد و لەلایەن ناسرەدین شای قاجارەوە نازناوی (خان)ی پێ بەخشراوە و میرنشینیی زەهاوی پێدراوە[٢٢].

ئەمەی کە باس کرا حەقیقەتی کۆچی حەمە پاشایە بۆ ئێران، وادیارە بەڕێز مامۆستا محەممەد ئەمین ئەردەڵانی هۆی کۆچی حەمە پاشا و هۆزی جافی بۆ ئێران و ململانێی لەگەڵ سەردار عومەر پاشادا بە تەواوی شی نەکردووەتەوە و لە یەکی نەداوەتەوە، بۆیە باسەکەی لە لایەك دەکەوێتە بازنەی گومانەوە، لەلایەکی ترەوە نووسیویەتی حەمە پاشا هانی عوسمانی خاڵەی شەمێرانی داوە کە ئەزێت و ئازاری مەولەوی بدات، ئەم نووسراوە یەکجار لە حەقیقەتەوە دوورە، بەڵکو پەیوەندی حەمە پاشا لەگەڵ مەولەویدا پەیوەندییەکی بتەو و توکمە و پڕ لە خۆشەویستی و ڕێز بووە[٢٣] و دژایەتی عوسمانی خاڵەی شەمێرانی کە تیرەیەکن لە عەشیرەتی یەزدانبەخشی لەگەڵ مەولەوی تاوگۆزی و کەسوکار و هۆزەکەیدا کە تیرەیەکن لە عەشیرەتی باوەجانی[٢٤] لە چوارچێوەی دژایەتی و ناحەزیی خێڵایەتی ناچێتە دەرەوە و ئەم دژایەتییەش لە قۆناغەکە بە دەر نەبووە.

وەك باسمان کرد حەمە پاشا ئەوپەڕی ڕێزی لە مەولەوی گرتووە وەك شاعیر و زانایەکی پایەبەرز و ڕێزدار. مەولەوی شاگوڵی دانیشتنە ئەدەبییەکانی حەمە پاشا بووە لە هەوارگە زستانی و هاوینەکانی ئەو زاتەدا بەتایبەت لە قەڵای شێروانەدا بووە بە شیعرە بەرزەکانی خۆی نواندووە و کۆڕە ئەدەبییەکانی لەو هاوینەهەوارانەدا گەرم کردووە و نامەی جوانی پڕ لە بەلاغەت لەنێو هەردووکیاندا

هەبووە و نامە بێ نوختەکەی مەولەوی کە بۆ حەمە پاشای نووسیوە کە بەم شیعرە دەست پێدەکات:

**عرضه شاهدن خاص بدیه پێشدا حرف نختەدار نە مەندن تێشدا**

بەڵگەی ئەم دۆستایەتی و خۆشەویستی و رێز و حورمەتەیە[٢٥] .

وەك دەگێڕنەوە مەولەوی دەگوێزێتەوە گوندی (کانی کەوە)ی ناوچەی شەمێران، کە زێدی هۆزی یەزدانبەخشییە، لەو سەردەمەدا سەرپەرشتیکردنی ئەو ناوچەیە سپێردراوە بە (شێخ عەلی عەبابەیلیّ) کە زۆر رێزی لە مەولەوی و خزمەکانی گرتووە.

دوای ماوەیەك سەرپەرشتی ئەو ناوچەیە لەلایەن حەمە پاشاوە دەسپێرێتە (عوسمانی خاڵە)ی شەمێرانی، کە زۆرتر مشووری خزمەکانی خۆی خواردووە و رێزێکی لە مەولەوی نەگرتووە، مەولەویش "کانی کەوە" بەجیّ دەهێڵێ و دەگەڕێتەوە (سەرشاتە)ی زێد و نیشتمانی دێرینی خۆی. کاتێ حەمە پاشا لەمە ئاگادار دەبێ نامەیەکی گلەیی بۆ مەولەوی دەنووسێ، لای سەیر بووە بۆچی (مەولەوی) ناوچەی موڵکی ئەوی بەجێ هێشتووە. مەولەویش لە وەڵامدا نامەیەکی بۆ دەنووسێ و بۆی باس دەکات کە لەدوای دەرچوونی (شێخ عەلی)یەوە لە شەمێران وەزعی هۆزەکەی و خزمانی وەك ئەوسا نەماوە بۆیە ناچار بووە لەبەر ئەوان بار بکات و ئەو ناوچەیە بەجێ بهێڵێت و ئەم چەند بەیتەشی بۆ دەنووسێ:

**از آنسوی وطن هجرت نمودم خلافت از علی دانسته بودم**

**به تأثیر محمد پیر أکمل خلافت چون به عثمان شد محول**

**دل خویشان مارا پر زخون کرد به خویشان خود نعمت فزون کرد**[٢٦]

دیارە لەم شیعرەدا هەروەك باسی باشە و چاکەی (شێخ عەلی) و خراپەی (عوسمانی خاڵە) دەکات، لە هەمان کاتدا پەنجەی بۆ ئەو حەقیقەتە مێژووییە ڕاکێشاوە کە عوسمان خەلیفەی سێیەمی موسڵمانان (خوای لێ ڕازی بێ) کە گەیشتە خەلافەت خزمەکانی خۆی نزیك کردەوە و بەهۆی ئەوەوە کەوتنە سەر نیعمەتی "بیت المال" و هەر لەو شیعرەدا دەڵێ:

مـن کـە لـە نیشـتمانەکەم کۆچـم کـرد وام زانـی خەلیفـە (عەلی)یـە. لـەیرەدا لەلایەکەوە مەبەستی (عەلی کوڕی ئەبی تالیب)ی خەلیفەی چوارەمی موسـڵمانانە. لەلایەکی ترەوە پەنجە بۆ (شێخ عەلی عەبابەیلیێ) ڕادەکێشـێ کـە وای زانیـوە ئـەو سەرپەرشتە، بەڵام کاتێ بە ئەمری محەممەد پیری ئەکمەل لێرەدا مەبەست حەمـە پاشای جافە، کـە بـە ئـەمری ئـەو سەرپەرشـتی درا بـە (عوسمـانی خاڵـە) لێـرەدا ئاماژە بە عوسمان خەلیفەی سێیەم و هەم عوسمانی خاڵە کراوە.

وەکو ئاشکرایە عوسمانی خەلیفە یارمەتی خزمەکانی خۆی داوە و لـە هـەموو نیعمەتێ بەرخورداری کردبوون، (عوسمانی خاڵە)یش یارمەتی خزمەکانی خـۆی دا و خزمانی منی دڵ شکاو و پڕ لە خوێن کرد. وەکـو دەگێڕنـەوە دوای بینینـی ئـەم شیعرە حەمە پاشا دڵی (مەولەوی) داوەتەوە و رازی کردووە.

بـە بۆچـوونی مـن وەکـو بەڵگـە و شـیعرەکانی مەولـەوی ڕوونـی دەکەنـەوە، پەیوەندی لەنێوان مەولەوی و حەمە پاشـادا تۆکمـە بـووە، بـەگزادەکانی جـافیش لایەنگیری شیعر و شاعیرانێ بوونە کە بە دیالێکتی هـەورامی شـیعریان وتـووە کـە مەولـەویش کەڵـە شـاعیری ئـەو مەیدانەیـە، ئاسـاییە جێـی ڕێـز و نەوازشـت و خۆشەویسـتییان بـێ و لـە ئاسـتی ئاینیـدا بـەگزادەکانی جـاف پاڵپشـتیی بتـەوی تەریقەتی نەقشبەندی بوون، کە مەولەوی یەکێك بـوو لـە خەلیفـە دیـار و زاناکـانی ئەو تەریقەتە...

وەکو دەگێڕنەوە حەمە پاشا هەرگیز تکا و رجا و شەفاعەتی مەولەوی بۆ هەر کەسێ بووبێ ڕەد نەکردووەتەوە. دەگێڕنـەوە خێڵـی (خلـە) کـە خێڵێکـی تـیرەی ناسـراو و ئـازای (کەماڵـەیی) جـافن بـە هـۆی ڕێگـری و ئەزیـەت و ئـازاری خـەڵکی ناوچـەکەیان، حەمـە پاشـا زۆر لێیـان تـووڕە دەبـێ و ژمارەیـەکی زۆریـان لـە بەندیخانەی قەڵای شێروانەدا زیندانی دەکات چەند ناسراو و کەسایەتێك بۆ ئازاد و بـەرەڵاکردنیان دێنـە خزمـەتی، بـەڵام هەوڵـەکانیان بـێ ئـەنجام دەبـێ، خزمـانی بەندکراوەکان دەست بە دامێنی مەولەوی دەبن، ئـەویش هـەروەك ماوەیـەکی زۆر کەم بۆ لای پاشا گەڕابووەوە دەڕوا بۆ تکاکردن بەڵکو بـەڕەڵایان بکـات، هـەر کـە نزیك دەبێتەوە پاشا دەیناسێ، سەرسام دەبـێ لـەم زوو گەڕانەوەیـە، ڕوودەکاتـە

(مەولەوی) و دەڵێ: "فەرموو میوانی، یا بۆ تکا هاتووی؟" لە وەڵامدا بەم شیعرە وەڵامی دەداتەوە:

**گموگلمە وەك کەری پلە**

**وە تکا هاتووم بۆ خێڵی خلە**[٢٧]

(حەمە پاشا)ش تکاکەی قبووڵ دەکات و زیندانییەکان بەڕەڵا دەکات.

وەکو دەیگێڕنەوە حەمە پاشا دەستی شیعری هەبووە و گاڵتەوگەپیشی لەگەڵ مەولەویدا کردووە، دەڵێن مەولەوی جارێك لە ئاوایی (دێڵێ) دەبێ لە ناوچەی شەمێران، کاتێ (حەمە پاشا) سەر لە ناوچەکە دەدا، کە نزیك (دێڵێ) دەبێتەوە ئەم شیعرەی بۆ دەنووسێ:

**ئەر گەڤەی گەماڵ کوردە ماڵ بێڵی**

**هەی لەزەت ئەبەی خاڵۆ لە دێڵی**

مەولەویش بەم شیعرە وەڵامی دەداتەوە:

**لە گەڤەی گەماڵ کوردە ماڵەکان**

**(دێڵێ)م دا بە تۆ و بە گەماڵەکان**

ئەم گاڵتەو گەپە و ئەم پەیوەندی کۆمەڵایەتی و ئەدەبییە بتەو و بەهێزە دوورە لەوەوە کە بوترێت حەمە پاشا هانی عوسمانی خاڵەی داوە ئەزیەت و ئازاری مەولەوی و بنەماڵە و هۆزەکەی بدات، جگە لەمەیشە تاوگۆزی، وەکو باسمان کرد تیرەیەکن لە عەشیرەتی باوەجانی، کە یەکێ لە هۆزە سەرەکییەکانی دەڤەری جافی جوانرۆن کە زۆر جێی بایەخ و ڕێزی حەمە پاشا بوون، بەتایبەت حەبیبوڵلا خان سەرۆکی ئەو عەشیرەتە کە ماوەیەکی زۆر سەرۆکی یەکێتی هۆزەکانی جاف ناوچەی جوانرۆ [٢٨] و باوەڕپێکراوی حەمە پاشاش بووە.

جگە لەم شیعرانە، کە باسمان کرد، نامە پڕ میهر و مەحەبەتەکەی مەولەوی، کە نامەیەکی بێ نوختەیە[٢٩] و بۆ حەمە پاشای نووسیوە، کە لەمەو پێش ئاماژەمان پێکرد شاهکارێکی نەسری فارسییە گەواهی پەیوەندی دۆستانە و ڕێز و نەوازشتی ئەم دوو کەسایەتییەیە.

لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئاماژە بەوە بکەم کە خوالێخۆشبوو مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لەو بڕوایەدایە ئەم نامە بێ نوختەیە بۆ مەحموود پاشای

کوڕی حەمە پاشا نووسرابێ، بەڵام بەپێی بۆچوونی خوالێخۆشبوو سەید تاهیری هاشمی و خوالێخۆشبوو صدیقی موفتی زادە، کە هەر دوو مەولەوی ناسی تەواو بوون، ئەم نامەیەی بۆ حەمە پاشا نووسیوە نەك مەحموود پاشا.

وەکو باسمان کرد پەیوەندی دۆستانەی حەمە پاشا لەگەڵ مەولەویدا ـ دوای کۆچی دوایی حەمە پاشا ـ بۆ مەحموود پاشای کوڕە گەورەی شۆڕبووەتەوە: مەحموود پاشا وەك ئەدەب دۆست بووە. هەروەها شیعرناسێکی باشیش بووە، شیعرەکانی مەولەوی نرخاندووە و بەشێکی زۆری کەشکۆڵە بە نرخەکەی بۆ شیعرەکانی مەولەوی تەرخان کردووە و شیعرەکانی کاریگەرییەکی زۆریان کردووە لە سەر ناخ و دەروونی مەحموود پاشا، ئەو کاریگەرییە بووەتە هۆی نزیکبوونەوەی مەحموود پاشا لە مەولەوییەوە و ڕێزێکی فراوانی لێ گرتووە. مامۆستای خوالێخۆشبوو مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس لە دیوانی مەولەویدا چەند لەو شیعرانەی دەستگیر بووبێ کە مەولەوی بۆ مەحموود پاشای ناردووە بڵاوی کردوونەتەوە. لێرەدا بە پەسندم زانی هۆی پەیوەندیی تۆکمە و خۆشەویستی بەردەوامی مەولەوی و مەحموود پاشا لە چەند خاڵێکدا بخەمە بەرچاوی خوێندەوارانی بەڕێز:

١ـ مەولەوی شاعیرێکی بەناوبانگ بووە مەحموود پاشاش عاشقی شیعر و ئەدەب بووە.

٢ـ مەحموود پاشا هەمیشە شانازی بەوەوە کردووە کە شاعیران و زانایان و دانایانی وڵات ئامادەبووی دیوەخانەکەی بن. لەوێدا کۆڕێکی ئەدەبی بەستراوە بەتایبەتیش شیعر بەسەر زاری هەموانەوە بووە و دیارە مەولەویش سەردەستەی شاعیران و زانایانی ئەو کۆڕانە بووە.

٣ـ مەحموود پاشا زیاتر لە هەموو شاعیرەکانی سەردەمی خۆی شیعری مەولەوی کاریان تێ کردووە و زۆربەی شیعرەکانی مەولەوی لەبەر بووە هەستی ناسکی مەولەوی هەستی ناسك و ئاوداری مەحموود پاشای بزواندووە و نەشئەیەکی صۆفییانەی داوەتێ.[٣٠]

٤ـ مەولەوی جگە لەوەی شاعیرێکی گەورە بووە، زانا و دانایەکی ئاینی بووە پلەی بەرزی ئاینی ئەو نەك تەنها لە کوردستاندا ناسراو بووە بەڵکو لە وڵاتەکانی

